# پێشەکی

ڕۆمانی نان فرۆش یەکێکە لەو ڕۆمانانەی کەلە نیوەی سەدەی نۆزدەهەم نوسراوە لەساڵی ١٨٨٩، بەدەرنەبووە لەناوبانگی و شوهرەتێکی باشی هەبووە ودواتر کراوە بەشانۆیی و زنجیرەی تەلەفزیۆنی [ پەخشانە، وشەیەکی کودی پەتییە لەهەمبەر تەلەفزیۆن].

ڕۆمانێکی تاوانکاری و خۆشەویستی و تراژیدی و تۆڵەکردنەوەیە، باس لە نەهەماتی ژنێکی خاوەن دوو منداڵ دەکات کەلە دوای مردنی مێردەکەی لەیەکێك لەکارگەکانی میکانیکی دەسپێدەکات، وخاوەن کارگەکە کردویەتی بە دەرگاوان لەپای ئەوەی مێردەکەی لەکارگەکەی ئەودا مردووە و دواتر بە دزین و سوتاندنی کارگەکەی بەڕێز جۆڵ لابرۆ و کوشتنی تۆمەتباردەکرێت لەلایەن ئەوکەسەی کە خۆشی دەوێت و دەخرێتە زیندان وشێت دەبێت و دوای بیست ویەك ساڵ هەڵدێت تاوەکو بەمنداڵەکانی شادببێتەوە و بێتاوانی خۆی بسەلمێنێت.

## لیستی کەسایەتییەکانی ناو ڕۆمانەکە:

**جان فۆرتییە:**

بێوەژنێکی خاوەن دوومنداڵ، مێردەکەی لەکاتی ڕاپەڕاندنی کارەکەی لەکارگە مردووە و خاوەن کارگە بۆئەوەی بژێوی ژیانی دابین بکات کردویەتی بە دەرگاوانی کارگە.

**جۆڵ لابرۆ:**

خاوەن کارگە، ژنەکەی مردووە و کوڕێکی بەناوی لوسیان بۆ بەجێهێشتووە.

**جاك جارۆد:**

چاودێری کارگە، هاوڕێی پیاوەکەی جان و دوای مردنی پیاوەکەی داوای هاوسەرگیری لێکرد.

**جۆرج دارییە:**

کوڕی جانە، و نازناوی داریيە ی هەڵگرتووە لەو خێزانەی بەخێویان کردووە.

**پۆڵ هرمان:**

**کەسێکی مردووە لە خەستەخانە وجاك جارۆد ناوەکەی هەڵگرتووە تائاشکرا نەبێت.**

**ئۆڤید سۆلیفەر:**

**کوڕی پوری پۆڵ هرمان.**

**ماری:**

**کچی پۆڵ هرمان ( جاك جارۆد)، نەخۆشی سیلی هەیە.**

**فریمی :**

**ئەو ژنەی لەهەمبەر بەخێوکردنی لوسی پارەی مانگانەی وەردەگرێت.**

**لوسی:**

**کچی جانە و دەزگیرانی لوسیان.**

**لوسیان:**

**کوڕی جۆڵ لابرۆی کوژرا و خاوەن کارگەیە، و دەزگیرانی لوسی.**

**خاتوو ئۆگستین:**

**خاوەنی ئەوکارگەی کە لوسی کاری لێدەکات.**

**کونت دی ڕیس:**

**ناوێکی ساختەیە ئۆڤید سۆلیفەر هەڵیگرتووە.**

**ئاماندا:**

**هاوکاری لوسی.**

**لیزا بیرین:**

**نـــــاوێکی ســــــاختەیە جـــــان دوای هەڵهــــــاتنی هەڵیگرتووە.**

# بەشی یەکەم

# ڕێگا

## - ١-

یەکێک بوو لەڕۆژە ساردوو سەختەکانی ئەیلولی 1861، کاتژمێر سێی دوانیوەڕۆ لەشەقامە ساردوو سڕەکەی ئالفۆرث لەشاری ئاڵفۆرتفێڵ ئافرەتێک بەپیادە بەجلی ئاسنگەری ڕەش دەڕۆشت، سادەبوو بەڵام ڕێک پۆشییەکی پێوەدیاربوو کەچاو لەسەری لانەدەبرا.

جوان دەرەکەوت، بەڵام سۆزی زیاتر تێدا بەدی دەکرا، جوانیەک زیاتر ماڵئاوایی لەخۆدەگرێت وەک کەشخەیی.

پرچەئاڵتونییەکانی لەسەر شانەکانی شۆڕببوونەوە وتاڵێک پرچیشی وەک ئەڵقە لەنێوچاوانی.

سەرەڕای ئەوەش کاتێک لەچاوانیت دەڕوانی دێڕێک لەدێڕەکانی خەمت دەخوێندەوە، لەڕووخساریدا هەورێکی پڕ لەخەمت دەبینی وەک ئەوەی گەرمکەرەوەی بن.

دەستی ڕاستی دەفرێکی زەنکی هەڵگرتبوو، لەدەستی چەپیشیدا دەستی کوڕە پێنج ساڵانەکەی گرتبوو.

منداڵەکەی بەخاو خلیچکی دەڕۆشت، و لەدواشییەوە ئەسپێکی دارین ومقەبایەکی پێبوو. ئەسپەکەی هەڵگەڕایەوە وکەوتە لایەکەی دیکەی.

منداڵەکە هاواری لەدایکی کرد تاوەکو کەمێك هێواشتر بێت. بەدەنگێکی لەسەرخۆ و تۆنێکی بەسۆزەوە دایکی وتی: ئازیزەکەم ئەسپەکەت هەڵگرە ڕێگایەکی درێژمان لەپێشە.

- بەڵێ دایکە.

منداڵەکە ئەسپەکەی هەڵگرت وشان بەشانی دایکی هەتا لەتوانایدابوو هەنگاوی دەنا. لەکۆتاییدا ڕێگاکەیان بەدووکانێك کۆتایی پێهات. لەیەکێك لەژوورەکان ئافرەتێك بۆپێشوازی دەرکەوت.. خاوەنی دووکانەکە بوو: ئەوەتۆی خاتو فۆرتییە، ڕۆژباش، هیچ خزمەتێکت دەوێ لەمنەوە؟

_ تکایە نەوتم دەوێ.

سەرسامی بەڕووخساری ژنە قەڵەوەکەوە دەرکەوت ووتی: هەم؟ سەیرە، ئەی ئەوەی دوێنێ کڕیت چیت پێکرد؟

_ کوڕەکەم قڵبی کردەوە لەکاتی یاریکردندا.

_ ئەهههه، کەوایە ئەوە نهێنیەکەیە، چەنێکت ئەوێ؟

_ چوار لیتر، تا هەموو ڕۆژێ خۆم هیلاك نەکەم بە وەڵام دانەوەی تۆ.

ئافرەتەکە ڕۆشت و نەوتەکەی هێنا: بەڵام ئەبێ زۆر ئاگاداربیت زۆر مەترسیدارە، ئەزانیت ئەودەفرە ئەگەر قڵب بێتەوە ئاگر لە هەموو کارگەکە بەردەدات دەنگی شقارتە هەمیشە بێ مەبەست بەردەبێتەوە.

_ ڕاستە، جۆرجی بێچارەش بە ئەنقەستی نەبووە، بەڵێنێ پێدام جارێکی دیکە وانەکات.

_ حاڵت چۆنە؟ ڕازیت لەسەر ئیشە نوێیەکەت خاتو فۆرتییە؟

شانەکانی هەڵتەکاند و وتی: هەرچۆنێك بێت ئەبێ ڕازی بم، لەم دەردەسەریمەدا.

_ چۆن؟ خۆ خەیاتی پارەیەکی باشتری لەوە بۆدەهێنای؟

_ ڕاستە، بەڵام چۆن خەیاتی بکەم لەکاتێکدا پارەم نییە پێداویستییەکانی بکڕم.

بەخێوکردنی دوومنداڵ پارەیەکی زۆری ئەوێت.

_ لوسی لەکوێیە ئێستا؟ هێشتا لەلای بەخێوکەرەکەیە؟

_ لەبیرجونی جوانی.

_ گومانی تیانیە پارەیەکی زۆری ئەوێت؟

_ مانگی سێ فرەنك.

دواتر لەسنگی خۆی داو ئاخێکی نەهامەتیانەی هەڵکێشاو گڵمە گڵمێکی کردوو وتی: ااەەە، خۆزگە مێردکەم نەدەمرد، ئەگەر زیندوو بوایە نەیدەهێشت وام لێبێت.

_ وایە خاتو فۆرتییە، چۆن ئەیتوانی خەرجی کەم بکاتەوە خۆ خۆی حەوت فرەنکی وەچنگ ئەکەوت ڕۆژانە!

ژنەکە هاواری کردوو وتی: بەسۆزبوو، بوێر بوو، خۆشی دەویستم، خوایە! ئەوکاتەی ئامێرەکە تەقیەوە لەگەڵ کوشتنی ئەو خۆشی و بەختەوری منیش کوژا.

_ کچەکەم نابێ خۆت بەدەستەوە بدەیت، بەڵا بەڵا بچوك دەکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ

سوپاسگوزاری خوابیت کەخاوەن کارگەکە سۆزی خۆی بەسەرتدا هەڵڕژاندووە. ئەی ڕاستە ئەڵێن تەقینەوەکە خەتای مێردەکەی تۆبووە؟

_ بەڵێ، ڕاستە بەداخەوە.

_ لەگەڵ ئەوەشدا خاوەن کارگەکە تێچووی پرسەکەی لەئەستۆ گرت و هەرچەندە دەیزانی دەرگاوانی بۆژن ناشێ بەڵام نەیویست واز لەهاورکارییەکانی بێنێت.

خاتو فۆرتییە بەزمانێکی بەداخەوە وتی: ڕاستە، بەڕێز لابرۆ زۆر بەخشندە بوو بەرامبەرم،، زۆریش نەك کەم، بەڵام ناتوانم ئەوە لەبیربکەم کەوا لەکارگەی ئەودا مێردەکەم کوژرا، ئەوکارگەیەبۆمن شوم وبەڵایە، ئەگەر لەبەرمنداڵەکانم نەبوایە هەرگیز قایل نەئەبووم بەوکارە، خوایە! چەند بەزەییم بەخۆمدا دێتەوە لەشوێنێك کارەکەم خوێنی مێردەکەمی تیا ڕژاوە، چ دڵێك بەرگەی ئەگرێت.

_ ڕۆڵەکەم خۆت بگرە ئەم خۆ بەدەست دانەوەت هیچ سوودێك بەخەمەکەت ناگەیەنێ، بێ ئەقڵییە بۆمردووەکان بژین، هێشتا لەبەهاری تەمەنتی، جوانیت، زوو بێ یان درەنگ چاوت بەکوڕێکی قۆز دەکەوێت وداوای هاوسەرگیریت

لێــــدەكات، نەكەی بـــێ ئەقڵـــی بكەیـــت وڕەتـــی بكەیتەوە.

_ هاوسەرگیری بكەمەوە؟ مەحاڵە! مەحاڵە!

پێداگری لەتۆنی دەنگیدا هەبوو.

خـــاوەن دووكـــانەكە وتـــی: ئەم قســـانە بەپێـــی كـــات جلـی خـۆی دەگۆڕێـت سـاڵ بەسـاڵ بۆچـۆنی مـرۆڤ دەگۆڕێــت، كەســێكی وەك تــۆ بۆهەتاهەتــایە بەبــێ هاوژینی نامێنێتەوە.

_ لەوەیە ڕاســت بـــكەی، هەركەس هاوســـەرگیری بكـــات پـــاڵنەری بەهێـــزی هەیە، منـــیش هۆكـــاری خـــۆمم هەیە وام لێبكـــات لێـــی دووربـــكەومەوە، ئێســـتا یەك هیـــوام هەیە ئەویـــش دەســـكەوتنی دوو بۆسێ هەزار فرەنكە.

_ چی لێكەی؟

چیلـــێكەم؟ ئەهـــووو، زۆر شـــت هەیە مـــرۆڤ بەبیریدا نایەت.

شـــانەكانی هەڵتەكانـــدوو وتـــی: ســـوودی چیـــیە بیركـــردنەوە لێـــی؟ خەونـــی هەوایە، نقـــووم بـــووم لەهەژاری، هـــیچ ڕێگەیەكـــی دەوڵەمەنـــد بـــوون نیـــیە، هەتـــا بتـــوانم بۆبەخێـــوكردنی منـــداڵەكانم لەكـــارگە دەبـــم. تـــابتوانم لەداهـــاتودا لەبەر منداڵەكانم تكا بكەم نەك بۆخۆم.

_ ئۆمێـــدت هەبـــێ کـــچەکەم، ئومێـــد بـــوێری و ئـــارامی مـــرۆڤ زیاددەکـــات. هـــائەوە نەوتەکەیە، ئەگەر بەگـــوێی مـــنەکەی لەدۆلابەکەدا دایبنـــێ وقوفڵی بدە.

_ دڵنیـــابە تەواو وریـــائەبم، کەس لەمـــن زیـــاتر لەئاگر ناترسێ.

دایـــك و منـــداڵەکە وەدەرکەوتـــن وئەســـپەکەش بەدوایانـــدا. خـــاوەن دووکـــانەکە چـــاوی لەســـەر لانەبـــردوو لەبەردەم خـــۆیەوە وتـــی: چ ئـــافرەتێکی خـــانەدان وبـــوێرە، گومـــانی تیـــانیە زۆر بیـــری مێـــردەکەی دەکـــات، تەمـــاحێکی زۆر لەو ژنەدا دەبیـــنم، خـــۆزگە بـــم زانیبـــایە ئەو ســـێ هەزار فرەنکە واوتی بۆچییەتی؟

دواتـــــــر ئـــــــاوڕی دایەوەبەرەو لای مـــــــازیتی یاریدەدەری وماوەیەك لەوبارەیەوە دەدوان.

جـــان فـــۆرتییە پـــێش مردنـــی پیـــاوەکەی لەخەیاتیـــدا پارەیەکی باشی وەچنگ دەکەوت.

لەتەمەنـــی بیســـت ســـاڵی چـــاوی بە بیبـــر فـــۆرتییەی هاوســـەری کەوەك میکانیـــك لەکـــارگەکەی بەڕێـــز جۆڵ لابرو کاری دەکرد کەوت.

بیبـــر ڕۆژێـــك هەڵەیەکـــی میکـــانیکی کـــردوو یەکێـــك لەئامێرەکـــان تەقیـــیەوە ودەســـبەجێ گیـــانی ســـپارد.

خاوەن کارگەکە لای لەبێوەژنە بێچارەکە کردەوە. دەیزانی هیچ سەرچاوەیەکی دارایی نییە ودوومندالێشی بەسەرەوەیە، کردی بەدەرگاوانی کارگەکە لەپای ئەوەی بەسەر مێردەکەیدا هاتبوو.

جان بێزاربوو لەکارەکەی ومێردەکەشی لەخەیاڵیدابوو لەبەر چاویدا نەدەبزوو.

لەم کارگەیە خوێنی ڕژابوو چ مێشکێك دەتوانێ بەرگەی ئەم یادەوەرییە سامناکە بگرێت؟

بەڵام ڕازی بوو لەسەر کارەکە و خۆی بەئارامگرتن قایل کرد، لەبەر مندالّەکانی وبەس بیر لەکەسی تر ناکاتەوە، هیوای سێ هەزار فرەنکی دەخواست تا خانەیەکی خەیاتی پێبکاتەوە وپارە بۆمندالّەکانی دابین بکات.

بەدەم ئەم خەیاڵانە وبیرکردنەوانەدا دەنگێك بانگی دەکرد، وەستا بەڵام ڕووی وەرنەگێڕا بۆدەنگەکە.

بەڵکو هەنگاوەکانی خێراتر کرد، دەنگەکە هەربانگی دەکرد: خاتوو فۆرتییە؛ ئەگەر گوێت لێمە منیش وەك تۆ بەرەو کارگەکە دەڕۆم با بارەکەت بۆهەڵگرم.

واخۆی دەرخست کەگوێی لەهیچ نییە.

منداڵەکە ئاوڕی دایەوە وهاواری کرد: دایە، ئەوە جارۆدی هاوڕێمە ئەوەی ئەسپەکەی پێدام.

جارۆد وەدوویان کەوت. گەشتە لای منداڵەکەو ماچێکی کرد دواتر ڕووی بەرەو دایکی وەرگێڕاووتی: خاتو فۆرتییە ئەگەر یەکێك بەوشێوەیە ئێمەی ببینیایە وایدەزانی لێم دەترسی، هەتاڕام نەکرد گوێت لەدەنگم نەبوو خراپەم لەگەڵ کردووی؟

کەمێك شڵەژاو و وتی: ویستم زوو بگەمە کارگە گوێم لێت نەبوو.

بەڵام نکۆڵییەکەی نەبووە هۆی قایل کردنی، وتی: بەڕاست خاتوو فۆرتییە گوێت لێم نەبوو؟

_ بێگومان، ئەوەنییە پێم وتی.

بێدەنگ بوو وتی: لێم مەترسە جان کاتێك دەمبینی، خۆتەزانی هیچ شتێك ئەوەندەی قسەکردن لەگەڵ تۆدڵخۆشم ناکات.

جان بەورییاییەوە وتی: بەڕێز جاك تکایە بەوشێوەیە قسەمەکە، ئەو وشانە ئازارم دەدەن.

_ منیش جان، واتزانی دڵخۆشم؛ نازانیت هەروەك تۆ ئازار ئەکێشم، وشکیت و ڕەتکردنەوەکانت وخۆ دوورخستنەوەت ئازارم دەدەن. هەموو ئازارێك بەدڵم دەگەیەنێت نازانم

چ وشـــەیەك هەڵبژێـــرم ودیـــاری بـــكەم تاوەســـفی بـــكەم بـــۆت، خۆشـــــمەوێی جـــان بەهەمـــوو برینەكـــــانمەوە خۆشـــــمەوێی، دڵـــــم تەنهـــــا بۆخۆشەویستی تۆ لێدەدا، ئەوە دەزانی.

جـــان قســـەكانی بـــڕی و وتـــی: بینیـــت بـــۆچی نەوەستام، تاگوێم لەم قسانە نەبێت.

_ چـــۆن بێـــدەنگ بـــم ودەنگـــی خۆشەویســـتم كـــپ بـــكەم، بـــێجگە لەتـــۆ بیـــر لەكەســـی دیـــكە نـــاكەمەوە، خۆشـــترین كـــاتی ژیـــانم ئەوكـــاتەیە لەگەڵ تـــۆدام، بەبێ پچڕان لێت بڕوانم وگوێت لێبگرم.

_ منـــیش بەبـــێ پچـــڕان ناوەســـتم لەوەی بڵـــێم ئەم خۆشەویستیە هیچە و گەمژەییە.

_ گەمژەیی! بۆچی؟

_ لەبەرئەوەی ناتوانم تۆم خۆشبوێت.

_ پێت وایە؟

_ تەنهـــا پـــێم وانیـــیە؛ بەڵكـــو دڵنیاشـــم لەوەی دەیڵێم.

_ بەڵام مـــن دڵنیـــام، چەنـــدین شـــتی مەحـــاڵ هەن لەژیـــان كەڕوونـــادەن، تۆگەنجیت،جوانیەكـــت هەیە هەمـــوو كەســـێك بەخـــۆیەوە ســـەرقاڵ ئەكـــات، ئەوژیـــانەی مـــاوتە چـــۆن بەبـــێ هـــاوژینی بەســـەر

دەبەی، دوورە پەڕێــز لەخەڵکــی ودەرگــات بەرەو ڕووی ژیـــــان داخســـــتووە؟ ئەم تەنهـــــایە چۆنەبێت.هاا!؟ وەڵام بەرەوە.

_ تکایە بەڕێز جارۆد وازم لێبێنە.

_ بۆچی وازبێنم؟

ئەبــێ ئەوەت بیربێــت بیبــر هاوڕێــت بــوو هێشــتا پێنج مانگیش بەسەر مردنەکەی تێنەپەڕیووە.

_ مەحــاڵە لەبیــری بــکەم. پێــت وایە خۆشەویســتی مــن یــادەوەری ئەو پــیس دەکــات؟ ئەمەچــۆن لەکاتێکــدا تۆنــازانی خۆشەویســتی مــن چــۆنە، کەســێکی ئازادیشــیت، یــادەوەری پــیس دەکــات ئەگەر بڵــێم جـان منــداڵەکانی وەک منــداڵی خــۆمن؟ یــادەوەری پــیس ئەبێــت ئەگەر بڵــێم جـان ژیــانێکی بەخــتەوەر وخــۆش بۆخــۆت ومنداڵەکانیشــت دابــین کەم؟ داهــاتی ســاڵانەم پێــنج هەزار فرەنــک زیــاترە، تــۆش ئــافرەتێکی دەســگیریت، پــڕۆژەی زۆرم لەمێشــکدایە؛ پــڕۆژەی زۆر چــاك کەپــێکەوە دەوڵەمەندەبین.

چــوزانین لەوەیە ڕۆژێــك بــبمە خــاوەن کــارگە وســەدان کرێکــار لەبەردەســتم کــاربکەن، ئەوکــات ئەبیــت بەئــافرەتێکی بەخــتەوەر؛ دایکێکــی بەخــتەوەر، دوومنــداڵیش لەپەنــاتەوە. هەمــووی لەســەر تۆوەســتاوە،هەتا شــێت بــوون تــۆم

خۆشـــــەوێت، خۆشەویســـــتی ناگەڕێنـــــدرێتەوە. بـــــاڕەتکردنەوەت وام لێنەکـــــات کـــــاری بـــــێ ئەقڵانەبکەم.

جـــان گـــوێی نەدایە قســـەکانی وەڕێـــکەوت بەدەم ڕۆشـــــتنەوەلێی دەڕوانـــــی بەدەنگێکـــــی پـــــڕ لەکـــاردانەوەوە وەســـتاو هـــاوری کـــرد: گـــوێبگرە جـــارۆد، ئەوە چـــوارەم پێـــنجەم جـــارتە دێـــی باســـی خۆشەویســـــتی خـــــۆت بـــــۆمنەکەی، ئەزانـــــم ڕاستگۆیت.......

قســـەکانی بـــڕی بەخۆشـــحاڵییەکەوە وتـــی: ســـوێندت بۆئەخۆم بەهەموو بونمەوە تۆم خۆشەوێت.

_ باقســـــەکەم تەواوبـــــکەم، بەدڵســـــۆزیت ئەزانـــــم. لەئێســـــتادا بـــــێجگە لەیەك وەڵام نـــــاتوانم هـــــیچ شـــتێکی تـــرت پـــێ بڵـــێم ئەویـــش: ئەمەوێـــت بەبـــێ هـــاوژینی بمێـــنمەوە، لەنـــیەتم نـــیە جـــارێکی دیـــکە هاوسەرگیری بکەمەوە.

بەبیســـتنی جـــان، جـــاك هەســـتیەکرد دڵـــی وائەبێـــتە دوو پارچەوە و لەقەفەزەی سنگی دەرەچێ.

خـــــاتو فـــــۆرتییە بەردەوام بـــــوو وتـــــی: بیبیـــــرم خۆشەویســـــــــــت، تەواوی دڵ وهەســـــــــــتەکانمی داگیرکـــردووە، بـــێجگە لەئەو نـــاتوانم کەســـی دیـــکەم خۆشـــبوێت، دڵـــم تەنهـــا بـــۆ ئەوبـــوو. لەگەڵ مردنیـــدا خۆشەویستی منیش مرد.

خەم بەڕووخساری جاك دەرەكەوت، بەقوڵی چاوەكانێ تێپڕی و بەدەنگێكی نزم وتی: تۆزۆر خراپی جان فۆرتییە، یەك تۆسقاڵ بەزەیی لەدڵتدا نییە، ئازارت دام جان، زۆریش .

جاك دەگریا، جان دەیزانی فرمێسك لەچاوی پیاودا كەم نییە.

بەدەنگێكی بەزەییەوە وتی: ئەزانم ئازار ئەچێژی؛ بڕوابكە منیش لەبەر تۆئازار ئەچێژم. خۆناتوانم ڕاستی بشارمەوە، ئەبێ هەڵت بخەڵەتێنم؟ ویژاندم وێرانەبێ ئاوا بەڕوو قسەت لەگەڵ دەكەم. بیرم لێمەكەوە چیتر.

بەنا ئومێدییەكەوە هاواری كردوووتی: بیرت لێنەكەمەوە!؟ خوایە! جا ئەكرێت.

_خۆشەویستیم لەبیربكە، لەدڵت دەرمبێنە، لەمن باشترو خانەدانتر ئەدۆزیتەو

_ هەموو هیوایەكم لەداهاتوودا ڕائەماڵیی؟

_ ئەبێت وابێت.

بەتوندییەوە دەستی جانی گرت ووتی: ئەمڕۆ پیاوێكی هەژارم، دڵنیاشم هەژاریم واتلێكات ڕەتم بكەیتەوە، بەڵام دەوڵەمەند ئەبم تاسەر وانابم، ئەوكات وەكو هاوسەری خۆت ڕازی ئەبی بەمن؟

به بێزارییەوە و توندییەوە وتی: بەسە، واقسەم لەگەڵ مەکە، ترس لە دڵم ئەچێنی.

هاواریکرد: دەوڵەندئەبم، سەروەتەکەم لەبەردەم پێی تۆ ومنداڵەکانتدا هەڵەڕژێنم.....ڕازیت؟

_ بەسە، بێدەنگ بە.

_ نا، بێدەنگ نابم. ئەبێ گوێ لەهەموو قسەکانم بگری، خۆشەویستیم بۆ تۆ تازە نییە پێنج ساڵە من تۆم خۆشەوێت. ئەم خۆشەویستییە بەجۆرێك دڵ وقاچمی گیردکردبوو خەریکبوو شێتەبووم. بەڵام بەرگەم گرت وئارامم هەبوو. لەبەرئەوەی مێردەکەت هاوڕێم بوو ئەوەی لەدڵمدا بوو فەرامۆشم کرد. بەڵام ئێستا مردووە، ڕێگامان چۆڵ بووە، هیچ شتێك نەماوە ببێتە ڕێگر لەوەی خۆشەویستی خۆمت بۆدەرنەبڕم، جان خۆشمەوێیت. ئەبێ وەکو هاوسەری خۆمت ببەم، بەم شێوەیە چارەنوس وەك ئایەتێك لەناو تابلۆ نەمرییەکاندا نوسیوێتی. مەحاڵە ناڕازی بین بەرامبەر وشەی چارەنوس.

کاردانەوەکانی داپۆشیبوو دەستەکانی گرت وماچێکی قوڵی کرد.

لەوساتەدا بچۆکەلەکە جلەکانی دایکی ڕادەکێشا و وتی: دایە دەی وەرە! بۆچی لەناوەڕاستی ڕێگاکە وەستاوی؟!

سەرلەنوێ بەسێ قۆڵی درێژەیان بەڕێگاکەیاندا.

جارۆد: با ئەمانەت بۆ هەڵبگرم.

_ سوپاس، بێجگە لەچوار لیتر نەوت هیچی ترنییە.

سەرسامبوو وتی: ژوورەکەت بە نەوت ڕووناك دەکەیتەوە؟

_ بەڵێ، نرخەکەی زۆر هەرزانە.

_ ئەی نازانی زۆر مەترسیدارە، بەڕێز لابرۆش قەدەغەی کردووە بێتە ناوکارگەوە، ئەگەر بزانێت توڕەئەبێت.

جان لەکاتی ماڵئاواییدا وتی: نەمەزانی، لەمڕۆوە بەکاری ناهێنم.

_ مۆم بەکاربهێنە.

_ لە سبەینێیەوە واکەم.

دواتر ڕێگەیان گرتە بەر تابەردەم کارگە جاکیش هاوەڵی کرد. دواتر کەمێك وەستاو وتی: ڕووخسەت هەیە وشەیەك بڵێم؟

_ بەدڵنیاییەوە.

_ دەرگای ئومێدم لەسەر دامەخە، وادەیەکم پێ بڵێ بەس بادوور نەبێ.

**_ ناتوانم جارۆد.**

**توڕەبـــوو وقاچەکـــانی دا بەزەویـــدا، وتـــی: چـــی! دوورم دەخەیتەوە.**

**ڕەفتارەکـــانی کـــاردانەوەی لـــێکەوتەوە و جـــاك وردە وردە بەرەو پێشـــــەوە ئەهـــــات وجـــــانیش لەگەڵ هەر هەنگـــــــاوێکی جـــــــاك بەرەو دواوە هەنگـــاوی دەنـــا. ڕێـــگەی لێگـــرت وبەدەنگێکـــی پێداگرەوە وتی: جان نەکەی خراپ بیت لەگەڵم.**

**بۆئەوەی بڕوات وتی: باشە، بزانین چۆنەبێت.**

**_ بەڕاست؟!**

**_ بێگومان.**

**_ زۆر سوپاســــــــت دەکەم، خەریکبــــــــوو پێداگرییەکەت بمکوژێت.**

**جـــــان وەژوور کەوت و نەوتەکەی لەســـــــەر ڕەفەکە دانـــا ووتـــی: دەســـتی جـــۆرج ناگـــاتە ئێـــرە باشە.**

**جـــــارۆد لەدواوە تفـــــی کـــــردە دەســـــتییەوە بۆتەوقەکردن درێژی کرد، وتی: چی...**

**_نا، بەڵام.....**

_ بڵێ، چیتە، پێش هەموو شتێك ئەوەبزانە من تۆم خۆشەوێت وئێستاش بەو ئومێدەوە ئەژیم، ڕۆژێك لەڕۆژان هەموو سەروەتەکەم دەخەمە بەردەمت، پێتەڵێم ئەوەتا دەوڵەمەندبووم ئێستا وەکو هاوسەری خۆت ڕازی ئەبی پێم؟

_ بەڵێ، لەبەرمندالەکانم لەبەر ئەوان زیاتر نا، لەوەش هیچی ترم نییە، دەستت بێنە.

تفی لەنێو دەستەکانی کرد وبەتوندی تەوقەیان کرد.

_ 2 _

جاك جارۆد لەکارگەکەی بەڕێز جۆڵ لابرۆ کاری دەکرد یەکێك بوو لەباشترین میکانیکەکان، لەم دوایەشدا پلەی بۆ چاودێری کرێکارەکان بەرزکرابوویەوە و موچەکەشی زیادکرابوو. هەرکات خەلەلێك یان کێشەیەك هەبوایە بەڕێز لابرۆ ڕای وەردەگرت، جارۆد متمانەی بەخۆی وبەزیرەکیەکەشی هەبوو بێگومان بوو لەوەی ڕۆژێك لەڕۆژان دێت دەبێتە یەکێك لەگەورترین داهێنەرەکان.

شـــەوێك كـــارەكەی تەواو كـــردوو ڕۆشـــت نـــوێترین كتێبـــی لەســـەر میكـــانیكی دەخوێنـــدەوە تـــاوەكو زانیـــاری پـــێ زیـــاد بكـــات، بـــێجگە لەوەی بتـــوانێ ئامێرێـــك دوســـت بكـــات كەپـــارەیەكی باشـــی بۆبهێنێـت هیـوای هیچـی تـری نەدەخواسـت. كاتێـك بیـری دەكەوتەوە هەركـات دەوڵەمەنـد بێـت ئەوجـا جـان پێـی ڕازی ئەبێـت زیـاتر تـامەزرۆی ئەبـوو تابگـــات بەدەوڵەمەنـــدی، بیـــری لەڕێگـــایەك دەكردەوە.

لە ناوكارگە سەرقاڵ بوو بەم بیركردنەوانە.

لەیەكێـــك لەكرێكـــارە پیرەكـــان نزیـــك بـــویەوە و وتی: ڤانسان.... كوڕەكەتم بینی.

پیـــاوەكە بەدەنگێكـــی پچـــڕ پچـــڕی نیگەرانـــیەوە وتـــی: چـــی پێـــوتی لەســـەر ژنەكەم، دەرمـــانی لێبڕاوە؟

_ نـــا، داوات لێكـــات هەر كە لێـــرە تەواوبویـــت ڕاست بگەڕێیتەوە ماڵەوە.

_ هیچی تری نەوت؟

_ نا.

پیـاوە پیـرەكە سـەری لەقانـد و وتـی: چ پێویسـتی ئەكـرد ئەوەنە دادڕێـژی بـكەی، ئەگەر دەرمـان لەدایكـــی نەبڕابێـــت لەناوەڕاســـتی ڕێگـــا

ناتوەستێنێت تا پێت بڵێ بەباوکم بڵێ زوو بگەڕێتەوە ماڵەوە. بەڕێز جارۆد، ڕووخسەت هەیە نیو کاتژمێر بڕۆمەوە ماڵەوە ئێستا دەگەڕێمەوە؟

جارۆد سەری لەقاند و وتی: ببورە، ڤانسان، تۆئەزانی ڕۆشتنی کرێکارەکان لە نۆبەی کارکردندا قەدەغەیە.

_ بەڵام حاڵەکە زۆر مەترسیدارە و پێویستە، وایدابنێ بەڕێز لابرو نا......

جارۆد قسەکانی بڕی و وتی: بەڕێز لابرۆ لەئێستادا لەکارگە نییە، ناتوانی بێ مۆڵەتی ئەو بڕۆیت.

پیاوە پیرەکە بێدەنگ بوو.

جارۆد لەوێدا نەما، پیاوە پیرەکە هەر لەبیری ژنەکەیدا بوو لەبیری ئەوەبوو نەوەك دەرمانی لێبڕابێت و بمرێت. بێ ئۆقرە بوو.

لەشوێنەکە وەردەرکەوت، بینی جان دانیشتوە داوای لێکرد ڕووخسەتی بدا تا تێپەڕێت؟

_ مۆڵەتی دەرچونت هەیە؟

_ نا، بەڕێوبەر لێرە نییە.

ئەوەی لەنێوان جارۆد وکوڕەکەیدا ڕوویدا بوو بۆی گێڕایەوە، و وتی: گومانم نیه لەوەی دەرمانی لێبڕاوە، هەتا دڵنیا نەبمەوە لێی ناتوانم بێمەوە سەرکار.

جان درکی بەحاڵەکەی کردوو وتی: ئاخر چۆن دەرگات بۆبکەمەوە کە مۆڵەتی دەرچونت نییە؟

_ خاتونەکەم بەدەست شەکرەوە دەناڵێنێت، پێت وایە سیستەم گرنگ بێت بەلامەوە؟

_ بەڵام بۆمن خراپە بێت بەڕێوبەر بزانێت بێ مۆڵەت و ڕووخسەتی ئەو ڕۆشتویتە دەرەوە.

_ لێرە نییە نازانێت ڕۆشتووم.

_ کەواتە ڕووخسەت لە چاودێر وەربگرە.

_ نەیدا.

_ دە چاوڕێکە تابەڕێوبەر ئەگەڕێتەوە.

_ بەڵا........

_ بەردەوام بوو لەقسەکردن دەربارەی ژنە نەخۆشەکەی کە لە سەرەمەرگدایە. بەردەوام بوو تاسۆزی جانی بەدەست هێنا وڕێگەی پێدا بڕوات هەرچەندە دەشیزانی بەڕێوبەر توڕەئەبێت.

دوای کەمێك جارۆد بەشوێنی کارەکەی ڤانسان دا تێپەڕی ئەوی لێنەبوو. لێی پرسی وتیان ڕۆشتۆتە دەرەوە.

جارۆد بەتوڕەییەوە بەرەو جان ڕۆشت، و لە ڕاستی مەسەلەی پرسی ... وتی : چیت کردووە؟

_ بەڵێنی پێدام زوو بگەڕێتەوە.

_ هەڵەیەکی گەورەت کرد، نە ئەبوایە بت هێشتایە، بەڕێوبەر توڕەئەبێت ولێت خۆشنابێ لەسەری. منیش وەکو سزایەك ئەبێت ڤانسان دەربکەم.

_ چۆن؟! تەنها لەبەر دڵە بەخشندەکەی؟ زوو ئەگەڕێتەوەبێجگە لەتۆ کەسی دیکە پێی نازانێت. تکایە چاوپۆشی لێبکە.

جاك جارۆد لێی نزیك بویەوە و وتی: باشە، لەبەر تۆ چاوپۆشی لێکەم جارێکی دیکە وانەکەی، هیوادارم پێش گەڕانەوەی بەڕێوبەر بگەڕێتەوە.

لەوساتەدا لەدەرگا درا. جان وتی: ئەوە ڤانسانە گەڕایەوە؛ ئارام بەرەوە.

نیگەرانی لەسەر ڕووخساری نەخشا کاتێ دەرگای کردەوە چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد.

ڤانسان نەبوو بەڕێوبەر بوو، بەڕێز لابرۆ بەرەو جاك ڕۆشت و وتی: تۆ ڕووخسەتت بە ڤانسان داوە بڕوات؟

جارۆد بێدەنگی هەڵبژارد، جان پەشۆکابوو.

بەئاسانی دەتتوانی تووڕەیی بەڕووخساری بەڕێز لابرۆوە ببینی، پرسیارەکەی دووبارە کردەوە. جارۆد بەدەنگێکی بەرپەرچدانەوە و وتی: نا.

_ کەواتە ڤانسان بەبێ مۆڵەت ڕۆشتۆتە دەرەوە.

_ نازانم، لەشوێنی خۆی نەمدۆزییەوە هاتم بۆلای خاتوو جان بۆڕوونکردنەوە.

بەڕێز لابرۆ ڕووی لە جان کردوو چاوەڕێی وەڵام بوو، وتی: بەڵێ، دەرچووە.

_ مانای ئەوەیە تۆ دەرگات بۆکردۆتەوە؟

سەری بەئەرێنی لەقاند.

بەدەنگێکی پێداگرەوە وتی: چی وایلێکردی دژی ڕێنمایەکانت بوەستی؟ ڤانسان چ بەهانەیەکی بوو تاواتلێبکات؟

_ ویستی لەژنە نەخۆشەکەی دڵنیا بێتەوە.

_ نەیەتـــوانی چـــاوەڕێ بکـــات تـــا مـــۆڵەت لەمـــن وەردەگــــــرێ؟ هاوســــــۆزم لەگەڵ ڤانســـــــان، بەڵام نابێـــت ببـــێ بەڕێبەرێکـــی خـــراپ بۆهاوکارەکـــانی. ئەگەر گەڕایەوە دەرگـــــــــای بــــــــۆنەکەیتەوە دەریـــبکەن. نکـــۆڵی لەوەناکـــام کەوا لەبەرژەوەنـــدی منداڵەکان نابێت بەڵام ئەبێتە نموونەیەك بۆیان.

دواتـــر جـــارۆد بەدوایـــدا و بەرەو نوســـینگە بەڕێ کەوتن.

_ ٣ _

بەڕێـز جـۆڵ لابـرۆی خـاوەن کـارگە ئێسـتا تەمەنـی چـــل وپێـــنج ســـاڵە، لەتەمەنـــی ســـی ودوو ســـاڵی لەگەڵ خـــاتوو فـــورەی دەوڵەمەنـــد هاوســـەرگیری کـــــــردووە بەپارەکـــــانی تـــــوانی کـــــارگەکە دابمەزرێنێـت.

دواتـــــر ژنەکەی دەمرێـــــت و لوســـــیانی بـــــۆ بەجێـدەهێڵێت، بـاوکی بۆبەخێـوکردنی نـاردوێتی بـۆ لادێـــی لنتـــۆڵی، و خۆشـــی لە ئاڵفۆرتفێـــڵ بـــۆ بەڕێوبردنی کارگە وپەرەپێدانی.

لابـــرۆ وەژوور نوســـینگەکەی کەوت و جـــارۆدیش بەدوایـــدا، وتـــی: بەدڵنیـــاییەوە هەڵەم کـــرد خـــاتوو

فـۆرتییەم وەکـو دەرگـاوانی دانـا، ئەبـێ پیاوێـك بخەمە جێگەی.

جـارۆد نەیـدەزانی چـی بڵێـت گلْمانـدی و وتـی: ئافرەتێکی دەسپاکە گەورەم.

_ بەڵام لاوازە و بۆئەو کارە نابێت.

لەدەرگـا دراو ژمێریـارەکە بەدەسـتەیەك پـڕ لەپـارە و چەنـد پـارچە ئاڵتونێـك خـۆی کـرد بەژووردا ولەسـەر مێـزی بەڕێـوبەری نـا، وتـی: بەڕێـوبەر داهاتەکانم بۆهێناویت تا لە گەنجینەی بنەی.

کـاتێ ژمێریـارەکە ڕۆشـت، بەڕێـوبەر بە جـارۆدی وت: ئەم ڕۆژانە زۆر مانـــــــــــدووم بەدەس دروســـتکردنی ئـــامێری پـــوختەکردنەوە، و زۆر بەربەســـت هـــاتۆتەڕێگەم تکـــاکەم قبـــوڵ بـــکەو بەدوایدا بچۆ سەتا پێنجی داهاتەکەت پێدەدەم.

جـارۆد بەپێشـنیازەکە دڵخۆشـبوو و وتـی: لەژێـر فەرمانتم گەورەم.

لابـرۆ هەمـوو وردەکارییەکـانی کـارگەو ئەوانەشـی سـەبارەت بە ئـامێرەکە بـوو پێـی وت. وتـی: ئێسـتا ڕات چییە؟

_ گومانی تێدانییە سەرکەوتوو ئەبم.

_ ئەم کـــاغەزانە و وێنـــــانەت پێـــــدەم خـــۆت لەژوورەکەمـــــی بنـــــێ، نەوەك یەکێـــــك بێـــت نمـــوونەیەکی لەبەر بگـــرێتەوە ونهێنیەکەمـــان بـــۆ ڕکابەرەکانمان ئاشکرا بکات.

_ باشـــــە گەورەم، لەســــــبەینێەوە دەســــــتەکەم بەکارکردن.

_ ئێســتا بگەڕێــرەوە بــۆ کــارگە و جــانم بۆبانــگ بکە.

کاتێـــك جـــان زانـــی بەڕێـــز لابـــرو نـــاردوویەتی بەشـــوێنیدا دڵەڕاوکێیەکـــی زۆری بۆدروســـت بـــوو بەجارۆدی وت: نازانی بۆچی بانگی کردووم؟

_ بەڵـێ، پـێم وابێـت چاوپۆشـی لەکـارەکەت دەکـات، هـیچ نەڵێـی هەرچـی وت فەرامۆشـی بـکە. ئەگەر کەسێکی توندیش بێت دڵێکی بەخشندەی هەیە.

کـــاتێ جـــان ڕۆشـــت بـــۆلای بەڕێـــوبەر جـــاك هەر لەژوورەکەی جـــــــان مـــــــابوویەوە، لە ژوورەکە بەشـــڵەژاوییەوە هەردەهـــات و دەچـــوو وبەخـــۆی دەوت: بـــڕوابکە لابـــرۆ، داهێنـــــانێکی گـــــرەنتییە قـــازانجێکی زۆر دەهێنێـــت، گومـــانم نیـــیە خـــاوەن داهێنــــــــانەکە ئەبێــــــــتە یەکێــــــــك لە گەورە دەوڵەمەنەکـــان! ئەهەە، ئەمە ئەوڕێگـــایە کە پێـــی دوڵەمەنـــد ئەبـــم، بەڵام پـــارە لەکـــوێ بێـــنم کـــارگەو ئامێر دروست بکەم؟!

**وەكـــــو گـــــايەك بەدەوری خۆیـــــدا لەژوورەكەدا دەسـوڕایەوە، وتـی: بەڵێنـی پێـدام پێـنج لەسـەدی داهـاتەكەم پێبـدا، چ بـێ ئەقڵیـیەكە بە پێـنج ڕازی بـم لەكاتێكـا ئەتـوانم تەواوی داهـاتەكە بۆخـۆم بەرم.**

**كـاتێ دەوڵەمەنـد ئەبـم قـابیلە جـان ڕەتـم كـاتەوە وپێم ڕازی نەبێت؟ مەحاڵە.**

**بەڕێـز لابـرۆ ئێسـتا تەوقـی داوە، هیـوادارم دەری بكـات ئەگەر وابكـات هـیچ پەنـاگەیەكی نامێنێـت جگە لەمن.**

**پێكەنینێكـــی درانـــدانە و شـــەڕانگێزانە لەســـەر ڕووخســـاری وەدەركەوت هەركەس بیبینـــایە لێـــی دەترسا.**

**جـان لەدەرگـای داو بەرەو پێشـەوە بەئاڕاسـتەی بەڕێـز لابـرۆ ڕۆشـت، وتـی: بانگـت كردبـووم گەورەم؟**

**_ بەڵـێ، زانـیم دوا نیـوەڕۆی ئەمـڕۆ دەرگـات بۆیەكێـك لەكرێكارەكـان كـردۆتەوە، كەتـۆ ئەزانـی پێچەوانەی ڕێنماییەكانە بۆچی واتكرد؟**

**_ ڕۆشـــت بـــۆئەوەی هەنـــدێك پێداویســـتی زۆر گرنـگ بكڕێت.**

بەبێ ئەوەی چاوڕێی وەڵامی لێبکات وتی: ئەم ڕەفتارەت بەرامبەر ڤانسان ڕاست نەبوو، واتلێکردم بڵێم بۆئەم کارە گونجاو نیت.

چاوی پڕ بوو وتی: بەڵام گەورەم من داوای ئەوەم لێنەکردی خۆت داتمەزراندم لەپای ئەوەی بەسەر مێردەکەمدا هات کاتێ کە خزمەتی تۆی دەکرد، ئەگەر تۆ پێت وابێت من بۆئەم کارە گونجاونیم کەوایە هیچ هۆکارێك نیە تا لێرەبم.

_ چۆن؟ کەواتە تۆ ئینکاری لەوەکەیت کە پێچەوانەی ڕێنماییەکانت کردبێت؟ بێفەرمانیەکانی پێشووترت چی؟

_ نکۆڵی لەوەناکەم کاتژمێرێك یان نیوکاتژمێر دەرگاکەم بە کراوەیی جێهشتبێت و یەکێکی دیکەم لەجێگەی خۆم دانابێت.

_ بەڵام من تۆم کردووە بەدەرگاوان ئەگەر بم ویستایە ئەوکرێکارەی تۆلەجێگەی خۆتت داناوە ئەوم دائەنا.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەکرێ چاوپۆشی لەوە بکرێت، بەڵام چییەڵێیت لەسەر ئەوەی بەبێ مۆڵەتی من ڕێگەت بە ڤانسان داوە لەکارگە بڕوات؟

_ گەورەم نکــۆڵی لەوە نــاکەم هەڵەم کــرد، بەڵام ئەمویست لەسەرە مەرگی ژنەکەیدا بێت.

بێدەنگی.

دواتــر بەڕێــز لابــرۆ ســەری بەرزکــردەوە و وتــی: بەداخەوەم کە ئەبــێ دەرتــبکەم، تــۆ حەزت لە مشــت ومــڕە و منــیش بــێجگە لە گــوێڕایەڵی و ملکەچی هیچی ترم ناوێت لەکرێکارەکانم.

لەم ســاتەدا ژمێریــارەکە وەژوورکەوت و وتــی: تکـایە بەڕێـز لابـرۆ پێـی بڵـێ چیتـر نەوت نەهێنێـتە کارگەوە.

بەڕێــز لابــرۆ هەرکە ئەم قســەی بەر گــوێ کەوت لەشــوێنی ڕاپەڕی و هــاواری کــرد وتــی: نەوت ! لەکارگەکەم..... نەوت!؟

_ بەڵــێ گەورەم، ژوورەکەی پــێ ڕوونــاك دەکاتەوە.

لابــرۆ تــوڕەیی لــێ دەبــاری وتــی: ئەمە چــۆن؟ مەگەر نازانی هێنانی بۆ ناو کارگە قەدەغەیە؟

_ نەمدەزانی گەورەم.

_ نەتدەزانی؟ ناتوانم بڕوابکەم.

_ بۆچی درۆبکەم گەورەم؟ چ سوودێکی ئەبێ بۆم؟ کەمێك پێش ئێستا تۆدەرت کردم، نکۆڵی کردن چ سوودێکی ئەبێت.

_ لەوەیە بۆ دوو کەمتەرخەمییەکەی ترت لێت خۆشببم، بەڵام لەبارەی نەوتەکەوە مەحاڵە. بەدوای کارێکی دیکەدا بگەڕێ. هەتا کۆتایی ئەم مانگە ئێرە چۆڵ بکە.

نەنگی لەسەر ڕووخساری دەرکەوت و وتی: دوای ئەوەی مێردەکەم لەکاتی خزمەتکردنی تۆدا مرد دەرمەکەی؟ چیم لێدێت دوای ئەوەی دەرگای ڕزقم لەسەر داخەی؟ چارەنوسی منداڵەکانم چی؟ ئاگاداربە گەورەم دەرکردنم هیچ خێرێکت بۆناهێنێت.

بەڕێز لابرۆ بەوریاییەوە لێی ڕوانی و وتی: مەبەستت چییە؟

ژمێریارەکە دەنگی بە بەرزی هەڵبڕی و وتی: هەڕەشەکەی؟

_ هەڕەشەناکەم، من بە کەرامەتەوە مەینەتی خۆمم هەڵگرتووە، کەمتەرخەمییەکم کرد ئەبێ هەمووی لەئەستۆ بگرم، گەورەم هەتا کۆتایی مانگ چاوەڕێ ناکەم، هەفتەیەکم بەسە و یەکێکی دیکە بێنە شوێنم.

بەڕێـز لابـرۆ بەزەیـی پێـدا هـاتەوە و بەسـۆزەوە وتـی: وایـدامەنێ هەر دەرتەکەم دەرتەکەم، ئێسـتا درکـم بەوەکـرد دەرگـاوانی کارێـك نیـیە بۆئـافرەت بگونجێ.

_ ئەبوایە پێشتر ئەوەت بزانتایە.

_ ڕاسـتە، بەڵام ویسـتم یارمەتیـت بـدەم و سـەرچاوەیی ڕزقـت هەبێـت ئیتـر ئەم کـارەم بەمێشـکدا هـات، لەگەڵ ئەوەشـدا کـارێکی دیـکەت بۆ دەدۆزمەوە.

_ بەڵکـو لەمـاوەی هەفتەیەکـدا ئەڕۆم گەورەم، ئەم کـارگە بـێجگە لەمەینەتـی و نەهـامەتی هیچـی تـری بۆنەهێنـام، هەرهەنگاوێـك دەنـێم ڕۆحـی مێردە غەرق بووەکەم لەخوێندا دەبینم.

دەسـتی بەڕووخسـاریدا هێنـاو، بەخەم ئـازارەوە لەژوورەکە وەردەکەوت.

خـاوەن کـارگەکە چـاوی هەر لەدوای بـوو وتـی: چ بێچـارەیە، ئەزانـم هەر لەبەزەیـی خۆیـدا ڕێـگەی بە ڤانسان داوە.

ژمێریارەکە: گەورەم تۆ بەخشندەی.

_ لەڕاسـتیدا قەرزاری ئەم ژنەم، مێـردەکەی لەکـاتی خزمەتکردنـی منـدا گیـانی سـپارد، ئەرکـی مـنە دەسـتی یـارمەتی بـۆدرێژبکەم و یـارمەتی

بدەم. لەپەنای خوشکەکەم کارێکی بۆ دەدۆزمەوە.

_ بەڵام گەورەم ئەبێ ئاگاداری ئەم ژنە بیت هەڕەشەی لێکردی.

_ پێت وایە؟

_ بێگومان، پیاوەکەی زۆر خۆشەویست، گومانیشی تیانیە تۆ بە بەرپرس دادەنێت. سەیر نییە بیەوێت تۆڵەت لێبکاتەوە.

بەڕێز لابرۆ سەری لەقاند و وتی: تۆزۆر خراپ لەسەری ئەدوێی، لەبیری مەکە ئافرەتێکی بریندارە، پیاوەکەی مردووە، دوومنداڵی هەیە ئەبێت بەخێویان بکات، هەرچییەك بێت ئەگەر خوشکەکەم نەیگرتە خۆی ئەبێت پارەی پێویستیان بۆدابین کەم.

دواتر ئاوڕی دایەوەو وتی: پارەی سندوقەکەت هێناوە؟

_ بەڵێ گەورەم، ئێستا 7123 فرەنك و سی سەنت لەم سندوقەدا هەیە، بەم بڕە هاتووم بۆلات.

_ بۆچی لایخۆت نایهێڵیتەوە؟

_ گەورەم مـــن لەكـــارگە نـــامێنمەوە ئەترســـم بدزرێت.

_ باشە، بیهێنە.

جـــان بەگریـــانەوە و بیركـــردنەوە لەوەی ڕزقـــی بڕاوە وەژوورەكەی كەوت.

جـارۆد هـات تـا بزانـێ چـی لەنێـوان ئەو و بەڕێـز لابـــرۆ ڕوویـــداوە، وتـــی: هەردەمزانـــی ئەمە ڕودەدات، بەمشت ومڕ توڕەت كردووە.

_ بەڵام دەری كردم.

_ ئەگەر توڕەت نەكردایە واینەكرد.

_ ئەی ئەتەوێ چـــۆن وەڵامـــی بـــدەمەوە وشـــەی ڕەق وزبـــری بەرامـــبەرم بەكارهێنـــا بـــۆ كەمتەرخەمییەك كەشایەنی نیم.

_ ئێستا ئەتەوێ چیبكەی؟

_ نـــازانم، بەڵام ئەبـــێ كارێـــك بـــكەم كـــچەكەم وكوڕەكەمی پێ بژێنم.

_ واز لەم نائومێـدییە بێـنە جـان، بەڕێـوبەر خـۆی ئەگەڕێتەوە ناهێڵێت بڕۆیت.

بەپێداگرییەوە وتی: بەڵام نامێنمەوە ئەڕۆم.

_ بەڕاست.

_ بەڵێ.

_ ئەگەر تۆبڕۆیت من چی؟

_ لەبیرم بکە.

_ جان، نازانی ئەستەمە ساتێکیش بێ تۆ بژیم؟ نا، قسە لەگەڵ بەڕێوبەردەکەم.

_ بۆخاتری خوا وامەکە.

_ خۆتەزانی من بەڕاستگۆیی و دڵسۆزییەوە تۆم خۆشەوێت، بۆچی تۆش هەمان هەستم لەگەڵ ناگۆڕیتەوە. دڵنیابە بەخۆشی ئەژین؟

_ چی؟ ئەتەوێ ببم بەخۆشەویستت؟ ئەمە ئیهانەیە بۆمن بەڕێز جارۆد.

بەلێبوردنەوە وتی: مەبەستم نەبوو ئیهانەت بکەم جان، هەموو ئەوەی ئەیڵێم ئەوەیە ماوەیەك لەلام بژیت تا ئەبیتە ژنم.

جان ئەزانی من بەخۆشەویستی تۆ شێتم ئەوەتا خۆم خستۆتە بەردەمی تۆو منداڵەکانت، وەکو منداڵی خۆم خۆشم دەوێن، ئەگەر پێشنیازەکەم ڕەت بکەیتەوە پێش ئەوەی خراپەت کردبێت بەرامبەر من خراپەیە بەرامبەر منداڵەکانت. دەی پێم بڵێ، سبەی چۆن ئەیانخەیتە قوتابخانە

وخەرجییان ئەكێشی؟ ئەتەوێ بەبرسی وبێ ماڵ وحاڵ بیان بینی؟

_ بەم شێوە ناشرینە وێنای داهاتوو بۆمنەكەی، ئیهانەیەكی گەورەیە بەرامبەرم.

_ زیادەڕۆی ناكەم، تەنها داهاتووی منداڵەكانتم پێوتی.

_ خوایە! بەزەیی بە منداناتەوە، بێدەنگ نابێت.

_ بەڵێ، بێدەنگ نابم، چاڵێك لەبەردەم پێیەكانت دایە ناهێڵم بەچاو بەستراوی بڕۆیت. ئەوە من دەڕۆم، ئەوەت بیرت بێت چارەنوسی منداڵەكانت بەستراوە بەو وشەیەی لەدەمت دەرەچێت. پشتی لێكردوو ڕۆشت.

جان بەوپەڕی نائومێدییەوە لەسەر كورسییەك دانیشت وبەخۆیەوە وت: زیادەڕۆی نەكرد، ڕاستەكات. هەرچەندە كاربكەم ناتوانم خەرجی منداڵەكانم بكێشم، خوایە ئەبێ بەهەژاری ژیان بكەن؟

بەڵام چۆن هاوسەرگیری لەگەڵ بكەم لەكاتێكدا لەسەرەمەرگدا بەڵێنم بە مێردەكەم داوە هاوسەرگیری نەكەمەوە جارێكی تر، چۆن ئەم بەڵێنە پیرۆزە بشكێنم، خوایە بێ وەفاییە

لەمـــــــنەوە، نـــــا، هەرچيـــــــيەك ڕووبــــــدات پاشگەزنابمەوە.

_ ٤ _

ســــبەی ڕۆژی دواتـــــر جـــارۆد تەواوی ڕۆژەكەی لەنوسـينگەی بەڕێـز لابـرۆ بەسـەربرد بەكـاركردن لەسەر وێنەكانی داهێنان.

كـاتی ئێـوارە بەرەو كەنـــار دەريـاكە بەڕێ كەوت و ژەمێكـی سـووكی نـۆش كـرد، تـانيوە شـەو لەوێ كاتی بەسەردەبرد.

لەومـــاوە درێـــژەدا بەجۆرێـــك نقـــومی بيركـــردنەوە بوو نەيدەزانی چی لە دەوروبەريەتی.

كــــاتێ ســــەرلەبەيانی گەڕايەوە بۆكـــارگە حـــاڵێكی شـڕو ڕەنگێكـی پەڕيـو وزەردهەڵـگەڕاوی هەبـوو بە ئاشـــكرا دەيـــوت ئەمەوێـــت ئێســـتا لەســـەر جێگەيەكی گەرم پاڵكەوم.

جان لێی نزيك بويەوەو وتی: چيتە؟

بەنيگايەكی پڕ ئازارو خەمەوە وتی: هيچ.

ئەمويست قسەت لەگەڵ بكەم لەسەر...

بەپەشـــۆكاوييەوە قســـەكانی خـــۆی بـــڕی و وتـــی: نا.....نا.....ئێستا نا.....دواتر.....دواتر.....

دواتـــر ئـــاوڕی دایەوە وبەپەلە بەرەو کـــارگە بەڕێـــکەوت، جـــان لەدواوە هەر تێڕامـــابوو سـەیری لەڕەفتـاری دەهـات، بەخـۆی وت: سـەیرە، ئەم پەشـــۆکاوییەی لەپـــای چیبـــوو، ئەڵێـــی نهێنییەکی گەورەم لێ ئەشارێتەوە.

لەنوســـینگەکەی بەڕێـــوبەر جـــارۆد دانیشـــتبوو ســـەرقاڵی چـــاککردنی ئـــامێرەکە بـــوو، بەڕێـــز لابـــرۆش لەســـوچێکی دیـــکە دانیشـــتبوو مژوڵـــی نـامە نوسـین بـوو. کەمێکـی خایانـد و ژمێریـارەکە وەژوور کەوت: گەورەم پـــارەم بۆهێنـــاوی تـــا لە بانکی بکەی.

_ تاکارم تەواوئەبێ با لاتبێت.

هەرکە جـــارۆد گـــوێی لەوشـــەی ( پـــارە) بـــوو، بروســـــکەیەکی بەهێـــز بەرلەشـــــی کەوت، ئەو شـــتەیە لەپێناویـــدا دەژی، ئەو ئـــاواتەیە ســـروودی نەتەوەیی بۆدەڵێت و دەیپەرستێت.

لەم وادەدا جـــــان بەبروســـــــــکەیەکی شـــــــین وەژوورکەوت: گەورەم ئەم بروســـــــــــــــکەت بۆهاتووە.

بەڕێـــز لابـــرۆ هێشـــتا بەتەواوی بروســـکەکەی نەکردبـــۆوە ڕەنگـــی پەڕی بـــوو: کـــوڕەکەم نەخۆشە! خوایە لەمەترسیدایە؟

ڕووی لەجـــارۆد کـــردوو وتـــی: بروســـکەیەکم لەخوشـــکەکەمەوە بۆهـاتووە ئەڵـێ لوسـیانی کـوڕم نەخۆشە، ئەبێ هەرئێستا گەشت بکەم.

جـارۆد دەسـتی کـرد بەکـۆکردنەوەی کاغەزەکـان. جـــارۆد لەخۆشـــیدا دەگەشـــایەوە وکـــاغەزو باجەکانی کۆکردەوە.

بەڕێـز لابـرۆ لەزەنگـۆڵەکەی داو ژمێریـارەکەی لە گەشـــتە لەناکـــاوەکەی ئاگـــادار کـــردەوە و داوای لێکـرد ئەوەنـدەی بەسـبێت بـۆخەرجی کاروبارەکـان هەڵیبگرێـــت تـــادەگەڕێتەوە وئەوەشـــی لێیمێنـــتەوە بۆیبێنێت.

دواتـــر بـــانگی جـــانی کـــرد وداوای لێکـــرد گالیسکەیەکی بۆبێنێت.

چەنــد خــولەکێکی پێچــوو و گەڕایەوە، بەڕێــوبەر وتـــی: چـــاوەڕێکە یـــارمەتیم بە لە ئامـــاددەکردنی جانتاکانم.

دوای چەنـــــد ســـــاتێکی کەم ژمێریـــــارەکە وەژوورکەوتەوە: پێـــــــنج هەزار فـــــــرەنکم هەڵگرتووە وئەوەشی ماوەتەوە بۆم هێناوی.

_ باشــە، هیــوادارم لەدوو ڕۆژ زیــاترم پێنەچێــت، چەندت بۆهێناوم؟

_ ١٣٣ سـەت وسـيو سـێ فرەنـك، ئەگەر ئەوەی ناودۆڵابەكەشـی بۆزيـادبكەم ئەكـاتە ١٩٠ سـەت ونەوەت هەزار فرەنـك و دووسـەت وپەنجـاو سـێ فرەنك.

لابـرۆ بەبـێ ژمـاردن پارەكـانی لەدۆڵابەكە نـا، جـارۆد سـەرنجی جـانی بۆلايخـۆی ڕاكێشـابوو، لەڕووخسـاريدا كـاردانەوەيەكی بينـی پێشـتر بەهـيچ جـۆرێ نەيبينيبـوو. پەشـۆكاوبوو، ترسـابوو، وەكـو كەسـێك تـاوانێكی كردبێـت و لەوەبترسـێت ئاشـكرابێت. سـەيری لێـدەهات ونەيدەزانی چييە.

جـارۆد داهێنانەكـانی دابە بەڕێـوبەر ومـاڵئـاوايی لێكـرد. بەڕێـوبەر وتـی: كـاتێ گەڕامەوە گرنگـی پێدەدەين.

ئـاوڕی بەرەو جـان دايەوە و وتـی: خـاتوو فـۆرتييە هەركە گەڕامەوە مشـورێكی تـۆش خـۆم دڵنيـابە نـاهێڵم بـێ كاربيـت، تكـايە ئەوەی لەنێوانمانـدا بـوو لەبيـری بـكە هەروەك چـۆن مـن لەبيرم كرد.

جـان بێـدەنگی هەڵبژاردبـوو، هەمـوو ئەوەی بەرامبەری هەيبوو گۆڕا بۆسۆز.

ژمێریارەکە لێی ڕوانی ولەدڵی خۆیدا وتی: تەنانەت نەشی وت سوپاس، گومانی تیانیە هێشتا تۆڵە لەمێشکیەتی.

دواتر بەڕێز لابرۆ فەرمانی پێکرد جانتاکەی بۆ ئامادەبکات، ڕۆشت بێ ئەوەی یەك وشە لەدەمی دەربچێت.

کاتێك دەرگاکەی داخست بەڕێز لابرۆ وتی: ئەترسم هێشتا خاتوو فۆرتییە توندییەکەمی بیربێت، بەڵام دەمارگیری ئەو وایلێکردم تووڕەببم، هەرچییەك بێت کاتێ گەڕامەوە کارێکی بۆ دەدۆزمەوە.

دواتر هەندێك تێبینی بەجارۆد وژمێریارەکە دا. لەکارگە دەرچوو تا بڕوات بۆلای کوڕە نەخۆشەکەی.

جارۆد بەلای ژوورەکەی جان تێپەڕی وسڵاوی لێکرد، ویستی بڕوات ڕێی لێگرت ووتی: ئەتویست ئەم بەیانیە چیم پێ بڵێیت؟

_ ئەمویست لەسەر زۆر شت قسەت لەگەڵ بکەم.

_ بڵێ، گوێم گرتووە.

**سەری باداو وتی: ڕایەك لەسەرم جێگیر بووە........قسەكانم بۆكاتێكی دیكە دواخەم، لەڕاستیدا ناوێرم.**

**_ ناوێری؟ لەچی؟**

**_ لەوەی بزانی چی لەناخمدایە، بەڵام ئاگادارت دەكەمەوە و نامەت بۆ دەنوسم.**

**جان وتی: نهێنی ئەم پەشۆكانەت چییە لەچاوەكانتدا بەدی دەكەم؟**

**_ تكایە، لێم مەپرسە ئێستا، بەڵام پێم بڵێ، بیرت لەداهاتووی خۆت ومنداڵەكەت كردەوە؟**

**_ بەڵێ.**

**چییە بینی؟ ڕازیت لەسەر پێشنیازەكەم؟**

**_ بەڵێ، بەڵام دوای ئەوەی پێم بڵێی چیتە.**

**_ هەموویت پێدەڵێم، بەڵام تا سبەی چاوەڕێ بكە، ئەوكات بڕیار لەسەر چارەنوسمان دەدرێت.**

**_ بۆچی سبەی؟**

**_ ئەمە نهێنییە، نامەوێ زیاترت پێبڵێم هەتا سبەی ئارام بگرە. ئەوەهەمویەتی.**

وەکـــو ئەوەی بترســـێت نەکـــا شـــتێك لەدەمـــی دەربچێـــت بەخێرایـــی جـــانی بەجێهێشـــت، جـــارۆد بەرەو چێشـــتخانەیەکی نزیـــك بەڕێـــکەوت و لە پەشـۆکاوی و زۆر بیرکـردنەوە خۆشـی نەیـدەزانی چـۆن نـان خـوات، لەخـواردن بـویەوە وگەڕایەوە کـارگە. بەڵام ئەمجـارە جیـاواز لەجارەکـانی دیـکە لەدەرگـای سـەرەکی کە کرێکارەکـانی لێدەڕۆشـت نەڕۆشـــت، بەڵکـــو لەودەرگـــاوە ڕۆشـــت کەکۆتـاییەکەی سـەر بۆنوسـینگەکەی بەڕێـز لابـرۆ دەکێشێت.

لەســەرخۆ لەدەرگــاکە نزیــك بــویەوە و پــارچەیەك مـۆمی لەگیرفـانی دەرهێنـاو لە شـوێنی قـوفڵەکەی نـــا تـــاوەکو شـــێوەی کلـــیلەکە بگرێـــت، دواتـــر دەریهێنـــایەوە ولەگیرفـــانی کـــرد و بەخێرایـــی گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی.

لەهەمـــان ســـات بەڵام شـــوێنێکی جیـــاواز، بەڕێـــز لابـــرۆ وخوشـــکەکەی لەســـەر لوســـیانی کـــوڕی دەدوان.

ئاگــاداریکردەوە توشـــی تـــایەکی زۆر بـــووە، بەڵام پزیشـك دڵنیـایی کـردونەتەوە هـیچ مەترسـی لەسـەر نەمـاوە وهـیچ شـتیك نییە تـا نیگەرانـی بـن. بـاوکە بێچـــارەکە بەدڵێکـــی شـــکاوەوە وتـــی: لەکـــوێیە ئەمەوێت بیبینم.

_ خەوتووە خەبەری مەکەرەوە.

بـــاوکەکە بەخێرایـــی هەڵـــپەی دا بەرەو ژووری کـوڕەکەی کەبینـی بەئـارامی خەوتـووە لەسـەرخۆ و بە ئەســـپایی گەڕایەوە بـــۆ لای خوشـــکەکەی، بەوردی نەخۆشـــیەکەی لوســـیانی بـــۆدەگێڕایەوە، بـاوکەکە وتـــی: مـــادام مەترســـی لەســـەر نەمـــاوە هـیچ شـتێك نـابینم تـا لێـرەم ببەسـتێتەوە، سـبەی دەگەڕێمەوە بۆکارگە.

کاتێـك لەبـارەی کـارەوە لێـی پرسـی، باسـی داهێنـانە نوێکەشــی بــۆکرد و وتــی: هیــوادارم ئەم داهێنــانە ملیۆنان فرەنکم بۆبێنێت.

خوشـــکەکەی گەشـــایەوە ووتـــی: بەڵام ئەبـــێ بیهێنێـــتە دەرەوە وتۆمـــاری بـــکەی نەبـــا کەســـێك پێش بکەوێت.

_ پێشـــبینی شـــتی وانـــاکەم، لەگەڵ ئەوەشـــدا داهێـنەر ئامـانجی ڕکـابەرییە کێشـە نـابێ هەنـدێك نهێنیـــی لـــێ وەدەربکەوێـــت، ئەوان بیرۆکەکـــان ئەدزن وئەوەنـــدەی بەســـبێت بۆســـەرکەوتن هەنـــدێك گۆڕانکـــاری وگەشـــەپێدانی بەبەرکەن، مـن بەتەنهـا کـارەکەم و بـێجگە لە جـارۆد کەسـی دیـــکە یـــارمەتییم نـــادات متمـــانەییەکی کـــوێرانەم هەیە بەجارۆد.

هەر لەسەر جارۆد وهەوڵەکانی و چۆن پێنج لەسەدی پێدەدات و ئەوبابەتانە دەدوا.

لێی پرسی: نهێنی داهێنانەکەشت پێوت؟

_ وتم هەندێك خەلەلی تیابووە لێم پرسی تا چاکی بکات.

خوشکەکەی شانەکانی هەڵتەکاند و وتی: مادام پیاوەکە جێگەی متمانەیە پێویست بە دوودڵی ناکات. گومانی تیانیە قازانجێکی زۆرەکات.

کەمێکی خایاند ودووبارە لەبراکەی پرسی: ئەی بێوەژنە بێچارەکە واپیاوەکەی لەکارگەکەتدا مرد چۆنە؟

_ کردم بەدەرگاوان، بەڵام ناچارم ئێستا دەریبکەم.

_ چۆن؟ پیاوەکەی لەخزمەتی تۆدا مردووە ئێستا تۆش دەریکەی؟

_ بەڵام مانەوەی لەو کارە مەحاڵە، کەسێکی بەسۆزو بەبەزەییە؛ هەر ئەمڕۆ بەبێ مۆڵەتی تایبەت ڕێگەی داوە بەیەکێك لەکرێکارەکان بڕواتە دەرەوە. بەڕای من ئافرەت بۆکار نابێت.

_ خوشــــكێ، ویســــتم لەســــەر ئەوە قســــەت لەگەڵ بــكەم تۆپێویســتت بەیەكــێكە كاروبــاری مــاڵەكەت بەڕێوە ببات، بۆچی جان ناهێنی بۆلایخۆت؟

تۆئێســتا پێویســتت بەپشــووە، ڕاســت نیــیە خــۆت مانــدوو بــكەی بەكاروبــاری مــاڵەوە، كــوڕێكی ســێ ســاڵانی هەیە هەمــان تەمەنــی لوســیانە ئەتــوانن ببن بەهاوڕێ.

_ ئەم پێشــنیازەت كــارێكی بەخشــندانەیە بــراكەم، دڵخۆشەبم.

بەڵــێ ئەتــوانی جــان بنێریــت و وەكــو مــاڵی خوشــكی خــۆی دابنێــت، بەڵكــو هەنــدێك خەمــی لەدەســتدانی پیاوە بێچارەكەی لەبیربچێتەوە.

_ ٥ _

بەیــــانی ڕۆژی دواتــــر جــــان بیــــری بەجــــارۆد وهۆكــــاری پەشــــۆكاوی وشــــپرزەییەكەی ســــەرقاڵ بــوو لەخــۆیە پرســـی ئـــاخۆ هۆكـــاری چیبێـــت، چ نهێنیـــــیەك دەشـــــارێتەوە. خزمەتكـــــاری كـــــارگە وەژوورکەوت وداوای كلیلـــــــی ژووری بەڕێـــــــز لابرۆی كرد تاڕێكی بخات و گسكی لێبدات.

خزمەتکارەکە ڕووخساری جانی باش نەدەهاتە بەرچاو، بڵاوبویەوە کەوا خاوەن کارگە ئینزاری کردووە، وتی: چیتە؟ نەخۆشی؟

_ نا.

_ ئەی بۆچی وا شڵەژاو و شپرزەی؟

_ وانیم، ئەندێشەکەی.

_ ئەتەوێ چیبکەی ئێستا؟ بەتەمای لەم شارە بمێنیتەوە؟

_ نازانم.

_ بەڕێز لابرۆ نایەوێ پاداشتی دارایت پێبدات؟

توڕەبوو: من لەوکەسانە نیم، سەدەقە قبوڵ ناکەم.

_ ئەی کێ وایوتووە؟ قەرەبووکردنەوەی کرێکارەکان لەکاتی دەرکردنیان بڕیارێکی یاساییە، بەڵام وادەرەکەوێ تۆکیناوی بیت.

کلیلەکەی پێداو وتی: ئەوە کلیلەکەیە لاچۆ ئیتر.

لێی وەرگرت ولەکاتی ڕۆشتنی لەژوورەکە، بەخۆیەوت: دیارە ئاژاوەی ئەوێت.

دوای ڕۆشتنی خزمەتکارەکە جان دەستی کرد بەڕێکخستنی ژوورەکەی. دواتر نەوتەکەی

هێنــاو بەتــاڵی کــرد، وتــی: خــۆم کڕیــوومە مــافی خــۆمە هەڵیگــرم بــۆژوورەکەم، لەودەمەدا لەدەرگــا درا، ژمێریــارەکە بــوو، ژاڵــی بەدەرگــاکەوە نــاو وتــی: بەڕێــوبەر ئاگــاداری نەکــردیتەوە دەربــارەی بەنزینەکە؟ بۆچی هێشتا بۆنی کەم؟

_ بەتــاڵییەکەمە شوشــەی تــایبەتەوە. تــابیبەم بــۆژووورە تــازەکەم کــاتێ ئێــرە بەجێــدێڵم، ئەتــوانی لەوە دڵێنــابیتەوە پــێش ڕۆشــتنم ئــاگر لەکــارگەکە بەرنادەم.

پشتی وەرگێڕاو ڕۆشت.

دوانیـــــوەڕۆ جـــــۆرجی بچـــــوك یـــــاری بەئەســپەدارینەکەی کــرد، لەپــڕ هەڵچــوو هەرچــی هەڵچــونی بــوو لــە لێــدانی ئەســپەکە بەتــاڵی کــردەوە گۆچــانێکی پێبــوو دەســتی کردبــوو بەپیاکێشــان بەئەسپەکە هەتا سکی ئەسپەکەی کون کرد.

جــۆرج لەســەرخۆ دەســتی کــرد بەگریــان، دواتــر فرمێســکەکانی ســڕی و ترســا لەوەی دایکــی پێــی بزانێــت هەنــدێك کــاغەزی کــۆکردەوە ولەســکی ئەسپەکەی نا.

گەڕایەوە بۆیـــاری کـــردن وەکـــوئەوەی هـــیچ نەبوبێـــت. جـــان لەنزیـــك دەرگـــای کـــارگەوە وەســتابوو چــاودێری دەرچــوونی جــارۆدی دەکــرد، جارۆدی بینی.

جـــارۆد لێـــی نزیـــك بـــویەوە ووتـــی: ئەم نـــامەیە هەموو شتێکم تیانوسیوە.

جـــان ســـەری ســـورماو و وتـــی: بـــۆچی نـــامەت نوسی، ئەتتوانی پێم بڵێی؟

_ هەنـــدێك شـــت هەیە زمـــان توانـــای نیـــیە بیڵێـــت ئەرکەکەی بەقەڵەم دراوە، کـــــــاتێ ڕۆشـــــــتی بـــــۆژوورەکەت بیخـــــوێنەوە، ئەوە باشـــــبزانە داهـــاتووی خـــۆت ومنداڵەکانیشـــت لەســـەر ئەو وشەیە وەستاوە کە لە تۆوە دێت.

بەبـــێ ئەوەی یەك وشـــە بـــۆ قســـەکانی زیادبکـــات ڕۆشت، جانیش بۆژوورەکەی.

نامەی کردەوە و بە وریاییەوە دەیخوێندەوە:

خۆشەویستەکەم جان....

دوێنـــێ شـــەو لەبـــارەی ســـەروەتێکی چـــاوەڕوانکراو بۆخـــۆت ومنـــداڵەکانت دوام، ئێســـتا ئەتـــوانم دڵنیـــات بـــکەمەوە ڕێگـــای بەدەســـت هێنـــانی ســـەروەتەکە نـــزیکە، ســـبەی ئەبـــم بەیەکێـــك لەدەوڵەمەنـــدەکان، یـــــان بەلایەنـــــی کەمەوە هەمـــــوو هۆکـــــارێکی بەدەســـــتهێنانی ســـــەروەت لەچـــــنگم دەبێـــــت، هەروەهـــا داهێنانێـــك کەســـەدان هەزار قـــازانجی هەیە لەدەســـتم دادەبێـــت، ســـبەی نـــزیکەی دووســـەد هەزار فرەنك لەچنگم دادەبێت.

جـان ئـەوەبـزانـە منـداڵەکانت دەبـن بەمنـداڵی مـن، تەنهـــــا ئەم بیـــــرۆکەیە وات لێکــــــات بەرگەی پێشنیازەکەم بگریت.

ئەم ئێـوارەیە کـاتژمێر یـانزە لەسـەر پـردی شـانتۆن چاوەڕێـــت دەکەم، جـــۆرج لەگەڵ خـــۆت بێـــنە، لە یەکێـك لەهۆتێلەکـان دەمێنیـنەوە، سـبەی فەرەنسـا بەجێـدێڵین بەرەو وڵاتێکـی بێگـانە، دەبیـنە یەکێـك لەدەوڵەمەنـــدەکان، بەبــێ پەشـــیمانی لەوکـــارگەی پیـــاوەکەتی تیـــاکوژراوە و تیایـــدا دەرکـــرای بـــڕۆ. وەرە بـــۆلای ئەوکەســـەی تـــۆی خۆشـــەوێت، دەتکـــــات بە بەختەوەرتـــــرین ئـــــافرەت، ئەگەر ئامادەنەبیـت نـازانم چـۆن وەسـفی ئەوخەمەبـکەم کە دامدەپۆشێت..... بەڵام دێیت.

٧ ئەیلولی ساڵی ١٨٦١

جاك جارۆد.

کـــاتێ لەخوێنـــدنەوەی بـــویەوە جـــان توشـــی ئەبڵەقێکی گەورەبوو.

جـارۆد باسـی چ داهێنانێـك ئەکـات؟ چـۆن لەپـڕ وادەڵێـــت وپێشـــتر هیچـــی نەوتـــووە؟ ئەی ئەم سـەدان هەزار فـرەنکە چییـە باسـییەکات بەیـانی بەدەسـتی هێـنم؟! کرێکـارێکی هەژاری بـێ پـلەیە ئەم پارانەی لەکوێ بوو؟

شـــــێتی دایگرتبـــــوو وایلێکردبـــــوو وێـــــنەی ئەندێشـەیەکی پیسـی ڕاسـتی بکـات؟ یـان ئـەیەوێـت لەگەڵی ببم وائەزانێ ساویلەکەو گەوجم؟

بەڵام ....نـا مەحـاڵە بەگـوێی سـاختەچییەکی وەکـو ئەوبـــکەم. بـــێجگە لە زبـــری هیچـــی تـــر لە مـــن بەدیناکات.

بەتـــوڕەییەوە نـــامەکەی پـــارچە پـــارچە کـــردوو فڕەی دایە سەرزەوی.

جـۆرج پارچەکـانی نـامەکەی کـۆکردەوەو لەسـکی ئەسپەکەی نا.

شەوداهات.

بەســـۆزو خۆشویســـتییەوە جـــان لەگەڵ جـــۆرجی بچـــوك لەســـەر جێگـــا ڕاکشـــابوون، بەســـۆزەوە سروودی بۆدەخوێند.

## _ ٦ _

لەودەمەدا وەك ئەوەی داینـــابوو جـــارۆد لەپـــردی شـانتۆن چـاوەڕێی جـان بـوو، بـاییەکی تونـد بەڵام بـێ بـاکبوو و بەرەو دەریـاکە ملـی نـا؛ پـرۆ پـرۆ بـاران لەســـەر شـــانەکانی نیشـــتەوە بەڵام هەر بـێ

باك بوو، بەخۆییەوە وت: بابیەکە ناهێڵێت، دڵنیام لەکاتی خۆیدا دێیت دڵنیام لەوە، ئەگەر نیەتی هەبێت بێت، ئەیبەم بۆژوورەکەم لەگەڵ منداڵەکانی ئارام بێت تا کارەکان تەواوکەم.

هەردەنگێکی ببیستایە وایەزانی جانە. دەهات ودەچوو ئۆقرەی لێبڕابوو، هەر چاوەڕێ بوو جانیش هەردەنگی نەبوو. بەخۆی وت: نەفرەتی لێبێت، خۆشەویستییەکەمی وەراند، ئەبینێت چۆن تۆڵەی لێبکەمەوە، ئەم دڵەی پڕ بوو لەخۆشەویستی لەوەوبەدوا دەگۆڕێت بۆڕق وتوڕەیی.

لەپڕ بیری کەوتەوە ئەونامەیەی بۆجانی ناردبوو ئەوڕۆ، ئاخۆ مەترسیدار نابێت، نابێتە بەڵگە بۆی؟ جان پیشانی لێکۆڵەرەوەکانی نادات؟

لەبیرکردنەوەدا نقوم ببوو، بیرکردنەوەکانی بەرەو ترس هەنگاوی نا. دواتر سەری هەڵبڕی وبەوپەڕی متمانەوە وتی: نا، تۆمەتەکە لەسەر خۆم لابەم گەشتەکەم بۆهەفتەیەك کورە بۆمانگێك دواخەم.

کەمێك لەشوێنی خۆی وەستا، دواتر بەرەو کارگە بەڕێکەوت، وتی: خۆشەویستی لەدڵمدا مرد؛ بوغزو کینە جێگەی گرتۆتەوە، وەیل بۆی،

پێی لەسەر خۆشەویستییەکەم نا، بێجگە لەتۆڵە هیچی ترم بۆنەماوەتەوە.

جارۆد لەو دەرگا بچوکەی هەمیشە بەڕێز لابرۆ پیایدا تێپەڕی ڕۆشتە ناوکارگەوە، پێشتر بەهۆی مۆمەکەوە کلیلێکی لەبەر گرتبۆوە بەهۆیەوە توانی بەئاسانی بڕواتە ناوکارگەوە. ڕووناکی لەژوورەکەی جان بەدی دەکرد، ددانەکانی گیرکردوو وتی: ئێستا گاڵتەم پێکات و پێی وایە لەبەربارانەکە چاوەڕوانیم. بەڵام ئێستا تۆڵەکەم ئەبینیت چۆنە، و ئەو خۆشەویستییەی لەگۆرانییەکی ئارامکەرەوە دەچوو ئێستا گۆڕاوە و بوە بە ئاگرێك هەرشتێك لەبەردەمی بوەستێت دەیسوتێنێت.

جان ئەوشوشانەی کەپڕیکردبوون لە نەوت لە ژوورەکەی تەنیشتی نابوو، جارۆدیش بێ یەك و دوو بەرەو شوشەکان هەنگاوی نا.

هەندێك شوشەی هەڵگرت وبەرەو کارگەکە ڕۆشت وهەندێکی لەسەر تەختەکان بڵاوەپێکرد، دواتریش بەرەو نوسینگەکەی بەڕێز لابرۆ ڕۆشت هەرکەرەستەیەکی دەسکەوت زرم لەقاسەکەی دەدا تاشکاو کرایەوە وهەرچی لەقاسەکەدا بوو لەئەوراق وکاغەز بردی

ئەوەندەشـــی لەتوانـــادابوو پـــارەی بەکـــێش کـــرد لەگەڵ وێنەی ئامێری پۆختەکردنەکە.

جـــارۆد دووبـــــارە گەڕایەوە بۆشــــوێنی نەوتەکە کەبـــڵاوەی پێکردبـــوو، لەگیرفانیـــدا لـــولەیەکی کبریتــــی دەرهێنـــاو ئـــاگری لەکـــارگەکە بەردا، ئەوەنـــدەی نەبـــرد هەمـــوو شـــوێنەکە پڕبـــوو لەئـــاگر وەکو کانێکی ئاگرینی لێهاتبوو.

لەودەمەی ئەم ڕووداوە تـــــۆقێنەرە لەپـــــاریس ڕوویـــدەدا، بەڕێـــز لابـــرۆ پـــاش دڵنیـــا بـــونەوەی لەســـەلامەتی کـــوڕەکەی بەرەو شـــارە مەزنەکەی ناوچەی ڕزق وڕۆزی گەڕایەوە.

کاتژمێرێـــک لەنیوەشـــەو لایـــدابوو پاریســـی بەجێهێشـــتبوو، لە یەکێـــک لە چێشـــتخانەکان لەخـــواردن بـــویەوە و دواتـــر فەرمـــانی بە شۆفێرەکە کرد تا کارگە نەوەستێت.

دوای ئەوەی کـــارگەکە و نوســـینگەکەی بەڕێـــز لابـــرۆ ئـــاگری تێبەربـــوو، بەڕێـــز لابـــرۆ گەشـــتە کارگە.

کەئـــاگرەکەی بینـــی بەپەلە ڕایکـــرد تـــا بیکـــوژێنێتەوە، بینـــی دەرگـــای نوســـینگەکەی کـــراوەتەوە، یەکســـەر بەبیـــری داهـــات بەئەنقەســـت کـــراوە، هەڵـــپەی دابەرەو ژوورەکەی و دەرگـــاکەی شکاند.

لەوساتە شەرمەزارەکەرەدا جارۆد هیچی بۆنەمایەوە جگە لەوەی بگەڕێتەوە دواوە وبەیەکێك لەوکەرەستانەی قاسە بچوکەکەی کردبوۆوە، بیتەقێنێت بەرەو دڵی بەڕێز لابرۆ، ولەسەر زەوی کەوت و خوێن وەکو بۆمبێك لەسنگیدا تەقییەوە.

جانیش بینی چۆن جارۆدی بکوژ لەدڵی بەڕێز لابرۆی ناو خوین فیشقەی دەکرد بەوناوە.

ئاگر تەواوی کارگەکەی گرتبوۆوە، پیاوانی ئاگرکوژێنەوە بەخێرایی ڕۆشتن وهەموو هەوڵێکی خۆیان خستبووە گەڕ تائاگرەکە بکوژێننەوە.

جان لەخراپی باردودۆخەکە نەدەترسا، دەیزانی هەموو تۆمەتێکی دەخەنە پاڵ، ڕۆژێك پێشتر دەرکراوە، مێردەکەشی لەوێ مردووە، نەوتەکەش بەڵگەیەکی دیکەیە، هەموو ئەوانە ئەبنە پاڵنەر تا ئاگر لە کارگە بەردات، بەخۆی وت: بەڵام نکوۆڵی لێکەم، نامەکە ئەبێتە بەڵگەیەك بۆم کە ئەو بکوژەکەیە.

ڕایکرد بەرەو ژوورەکەی تانامەکە بدۆزێتەوە، ئەونامەیەی لەوتۆمەتە قێزەونە دەربازی دەکات، لەڕێگا بیری کەوتەوە نامەکەی پارچە

پـارچه كـردووه، پـاڵی نـا بەدەرگـاكەوە و سـەیری ناوەوەی ژوورەكەی كرد بەڵام هیچی لێنەبوو.

_ خوایە! نامەكە لەكوێیە؟

هەمـوو شـوێنێك دەگەڕا، ژێـر كورسـی...... ژێـر جێگەكە...... مێزەكە....... هەموو شوێنێك.

هەرخەریكـی گەڕانـی بێهوودەبـوو، دەنگـی ژمێریـارەكە دەهـات، گـوێی لێبـوو دەیـوت: گومـانی تیـانییە خـاتو فـۆرتییە ئـاگرەكەی كـردۆتەوە، بەگـوێی خـۆم گـوێم لێبـوو هەڕەشـەی لەبەرێـز لابرۆ دەكرد.

جـانیش هەربەردەوام لەگەڕان، تـاكە بەڵـگە لەوچەرمەسـەرییە ڕزگـاری دەكـرد لەدەسـتی دا، جـۆرجی هەڵگـرت ولەژوورەكە وكـارگە ڕۆشـت، تـرس وتۆقـاوی بەئاشـكرا لەسـەر ڕووخسـاری هەردووكیـان بەدی دەكـرا. بەڵام لەو بێچارەیشـدا ئەسـپە داریـنەكەی كـوڕەكەی لەبیرنەكردبـوو بـێ ئاگـا لەوەی نـامەی قوتـاربوونی لەسـكی ئەسپەكەدایە.

ئـاپۆڕایەك لەخەڵكـی لەنزیـك ئـاگرەكە و دوكەڵە نزیـك ببـونەوە. پیـاوانی ئـاگر كـوژێنەوە بەسـەر پلیكانەكانـدا سـەركەوتن تـاكۆنترۆڵی بـكەن ودەرگاكـانیش هێشـتا هەرقوفـڵ بـوون. یەكێـك هـاواری لـێ بەرزبـویەوە و وتـی: جـان پاسـەوانی

دەرگـا لەکـوێیە؟ جـاك جـارۆدیش لەنێـو ئـاپۆڕاکە بـوو هـاواری دەکـردوو دەیـوت: جـان کـوا؟ گومـانی تیـانیە ئەوئـاگرەکەی کـردۆتەوە، لەپـای دەرکردنـی هەستاوە بەم کارە.

دواتـر هـاواری کـرد لەهەرچـی کەس بـوو لە نزیکـی: دەی برایـان بـاگەنجینەی بەڕێـوبەر لەئاگر بپارێزین. بەدڵخۆشییەوە بەڕێکەوت.

دوای ئەوەی جـارۆد تـاوانەکەی کردبـوو زانـی جـان ئەوی بینیـوە لەکـاتی کوشـتنەکەدا دڵنیـابوو لەوەی پەنـچەی تـۆمەتی بـۆ ڕائەکێشـێ و ئاشـکرای ئەکـات لای خەڵکـی. سـەد مەترێـك لەکـارگە دوورکەوتەوە و خـۆی کـۆکردەوە و بەخـۆی وت: بەڵـێ، پەنـچەی تـۆمەتم بـۆ ڕائەکێشـێ، بەڵام چ بەڵگەیەکـی هەیە؟ نـامەکە! بەدڵنیـاییەوە ئـاگرەکە ئەوەشـی لەنـاوبردووە. هەمـوو ئەزانـن ڕۆژێـك پێشـتر دەرکـراوە و نـاکۆکی لەگەڵ بەڕێـوبەر هەبـووە، و ژوورەکەی بەنەوت ڕوونـاك کـردۆتەوە، هەرکە شوشـە بەتاڵەکـان ئەبییـنن لەنزیـك کـارگەوە دڵێنـائەبن لەوەی کە ئەوە.

کاتێـك هـاواری لەخەڵـکەکە کـرد گەنجیـنەکە بپـارێزن، غەریزەیەکـی دۆزەخـی لەپشـتیەوە بـوو، ئەیویسـت تـۆمەتەکە لەخـۆی دووربخـاتەوە،

ئـــاپۆڕاكە بەرەو نوســـینگەكە بەڕێكەوتـــن ترســـیان لەئـــــاگرەكە هەبـــــوو دڵنیـــــابوون لەوەی هەركەس نزیكی بێتەوە ئەیپێكێ.

ژمێریارەكە وتی: چوونەژوورەوە مەحاڵە.

جـــاك: مـــن هەوڵەدەم، ئەبـــێ ئـــاگرەكە لەدۆڵابەكە دووربخەمەوە.

_ تووشی مەترسییەكی گەورە ئەبی.

_ ئاگادار ئەبم.

ڕۆشـــتە نـــاوەوەی نوســـینگەكە، چەنـــد ســـاتێكی پێچوو هاواری كرد: تەرمێك لێرەیە!

هەڵـــی گـــرت وتەرمـــی بەڕێـــز لابـــرۆی هێنـــایە دەرەوە.. ئەیپرسی: خوایە! تەرمی كێیە؟

ژمێریـــارەكە: ئەی هـــاوار خـــوایە! تەرمـــی بەڕێـــز لابرۆیە.....!

جـــاك جـــارۆد دووبـــارە گەڕایەوە بەرەو نوســـینگە، كەمێكـــــی پێچـــــوو لەژوورەوە هـــــاواری لـــــێ بەرزبـــویەوە ودەیـــوت: بەخێرایـــی وەرن بـــۆلام! خەریـــــكە دەخنكـــــێم، ڕزگـــــارم بـــــكەن...... وائەخنێكم.

دواتر دەنگی نەما.

هەنـــدێك لەپیاوەكـــان بەرەو لای جـــاك ڕایـــان كـــرد، بەڵام دیـــــوارەكە هەرەســـــی هێنـــــا و بـــــوو بە بەربەستێك لەنێوانیاندا...

هەنـــدێكیان دەیـــانووت: بێچـــارە جـــاك، بـــوو بە قوربانی.

ســـەرەڕای هەوڵەكـــانی پیـــاوانی ئـــاگر كـــوژێنەوە، بەڵام ئـــاگر هیچـــی لەكـــارگەكە نەهێشـــتەوە و لەناوی برد.

خەڵـــكەكە مقۆمۆیـــان بـــوو لەبـــارەی نهێنـــی ئەم كارەســـاتە دڵـــتەزێن و لەناكـــاوە، ژمێریـــارەكە ئـــاپۆڕاكەی كـــۆكردەوە و بەرەو جـــان بەڕێكەوتـــن، لەپێشـــەوەیانەوە بـــوو دەیـــوت: نەفرەتـــی لێبێـــت، ئەو بەدڕەوشـــتە هۆكـــاری ســـوتان و مردنـــی بەڕێـــز لابرۆ و جاك جارۆدە.

لێـــرەدا ســـەرۆكی پۆلیســـەكان خـــۆی خســـتە ناومەسەلەوە، وتی: تۆكێی؟

_ ژمێریاری كارگە.

لەقســـەكانت بەوەگەشـــتم كەســـێكت تۆمەتبـــاركرد مانای چییە؟

_ بەڵێ، دەرگاوانەكە، ناوی جان فۆرتییە.

_ هیچ بەڵگەیەكت هەیە لەدژی.

ونبـــوونی، ڕاکردنـــــی لەم ســـاتە هەســـتیارەدا گەورەتـــرین بەڵـــگەیە بـــۆ تـــاوانەکەی، دڵنیاشـــم نەوتـــی تەنهـــا بـــۆئەوە کڕیـــوە ئـــاگر لێـــرە بەربـــدا وهیچی تر.

_ چی وایلێکات وابکات؟

_ کیـــنەی بەرامـــبەر بەڕێـــز لابـــرۆ، دوو ڕۆژ پـــێش ئێســـتا بەهـــۆی کەمتەرخەمیـــیەوە لەکـــارگە وەدەری نا.

_ جەســـــتەی کـــوژراوی دووەم لەکـــوێیە؟ گـــوێم لێبوو دەتوت دوو پیاوی کوشتووە.

_ کـــوژراوی دووەم گەورەم، چـــاودێری کـــارگەیە بەڕێـــز جـــاك جـــارۆد. وەژوور نوســـینگەکە کەوت تـــا گەنجیـــنەی بەڕێـــز لابـــرۆ بپـــارێزی بەڵام لەولاوە بەتەرمەوە گەڕایەوە، دووبـــــــــارە وەژوور کەوت بەڵام ئـــاگرەکە لەنـــاوی بـــرد خۆمـــان گوێمـــان لەهـــاواری بـــوو، پـــێش ئەوەی ڕزگـــاری بکەیـــن دیوارەکە هەرەسی هێنا.

_ باشـــە، جەســـتەکە ئەبیـــنە شـــوێنی بەلەمەکـــان تـــاکە شـــوێنە ئـــاگرەکەی بەرنەکەوتبێـــت، لەوێشـــەوە هەتـــا دادوەر ئامادەبێـــت لێکـــۆڵینەوەی ســـەرەتایی دەست پێکات.

دواتــر فەرمــانی بەچەنــد پیــاوێکی کــرد تــاتەرمەکە بگوازنەوە.

دواتــر بــانگی ژمێریــارەکەی کــردوو، لەوەڵامەکــانی ئەوەی بـــۆڕوون بـــویەوە کەوا بـــێ هـــاوژینە وکـــوڕێکی ســـێ ســـاڵانی هەیە ولەلای خوشـــکی دەژی، و بەســـەردان ڕۆشـــتووە بـــۆلای کـــوڕەکەی و لەپڕ هاتۆتەوە و توشی ئەجەلی خۆی بووە.

_ بروســـکەیەك بنێـــرە بۆخوشـــکەکەی هەواڵـــی مردنی براکەی پێ ڕابگەینە.

_ بەڵێ گەورەم.

ســـــەرۆکی پۆلیســـــەکان ڕاپـــــۆرتی ســـــــەرەتایی ئامـــادەکرد تـــا پێشکەشـــی دادوەری لێکـــۆڵینەوەی بکات.

_ ٧ _

جـــان لەوپەڕی پەرێشـــانی وخەفەتـــدابوو، جـــۆرجی هەڵگرتبـــــوو بەرەو ڕووبـــــارەکە تـــــاوی دەدا، بەترســـەوە وەســـتا، تـــاو نـــا تـــاوێ ئـــاوڕی دەدایەوە بـــۆ ئـــاگرەکە، دەنگێـــك لەناخیـــدا هـــانی دەدا هەتـــا

دەتـــوانێ هەتـــا لەتوانايـــدايە دوور بكەوێـــتەوە و ڕابكات.

لەبەرخـۆيەوە قسـەی دەكـردوو دەيـوت: بـۆ كـوێ بڕۆم؟ بۆ ڕامكـرد ئـاخر؟ بەڵـێ، ئەزانـم تۆمەتبـارم كەن، ئەوبەڵگەشـم لەدەسـت دەرچـوو كەڕزگـاری دەكـردم، هـيچم نەدۆزيـيەوە و بەبيـرم نەهـات جـگە لەڕاكردن.

ڕوانيـنە دڕنـدانەكەی جـاك جـارۆدی بەبيرهـاتەوە لەكـاتی كوشـتنی بەڕێـز لابـرۆ، لەوكـاتەدا جـاك پێـی وتبـــوو: بـــتەوێ ونەتەوێ لەهەمـــوو لايەكەوە تۆمەتەكـــان ئاڕاســـتەی تۆدەكرێـــت. هـــيچ ڕێگايەكيشت نييە بۆ نكۆڵی كردن.

_خـــوايە! ئەم نـــاكەس بەجێيـــيە چيكـــرد؟ چـــی ڕێكخست؟

هەر ئەونەوتەكەی لە دووكـــان كڕيبـــوو، شوشـــە بەتاڵەكـــانيش دەدۆزنەوە، ڕاكردنـــی لەكـــاتی ئـــاگر كەوتـــنەوەكە، وئەو قسەشـــی كەوتـــی (( چاكنابێـــت بـۆت))، هەمـوو ئـەمـانە وەك سـوپايەك هێرشـيان هێنـــابووە زەهنـــــی، هەرئەوەنەش بەســـــبوو تاڕابكات.

خـــۆرهەڵات و هێشـــتاش پەرێشـــانی و نيگەرانـــی لەسەر ڕووخساری بوو.

لە دوورەوە دوو پۆلیسی بینی ژنێکی کەلەبچە بەدەستیان پێبوو، خۆی لەپشت دارەکانەوە حەشارداو و دەیوت:خوایە! چارەنووسی منیش وائەبێ، وەك ئەو ژنە لەزیندانـدا ئەبم، بەڵام هیچم نەکردووە بێتاوانم، کارێکی بۆ ئەقلانەم کرد، ئەبوایە بمامایەتەوە و هاوارم لەپۆلیس بکردایە وبم وتایە: ئەوە بکوژەکەیە بیگرن.

ئێستا چیبکەم؟ بگەڕێمەوە؟ ئاخۆ ئەگەر بگەڕێمەوە ئەتوانم خۆم قوتاربکەم؟

دەنگی منداڵەکەی بیرکردنەوەکانی بڕی و وتی: دایە برسیمە.

خەم دڵی تەنیبوو، وتی: ئارامبگرە کوڕەکەم، هەرکە گەشتینە گوندەکە خواردن دابینەکەم.

_ هیلاکم دایە ناتوانم ڕێبکەم.

دووبارە جۆرجی هەڵگرت و درێژەی بەڕێگاکەی دا، لەکۆتایدا گەشتە گوندەکە و جۆرجی لەسەر گژووگیاکە ڕاکشاند و وتی: لێرە چاوڕێکە تاخواردنت بۆدەهێنم.

_ چاوەڕێکەم دایە.

_ ناترسی بەتەنها؟

_ نا، ئەسپەکەم بەرگریم لێکات.

ئەسپەکەی لەئامێزگرت وچاوەکانی لێکنا، هەرزوو خەوێکی قوڵ بردیەوە، دایکی ووردە ووردە دوورکەوتەوە دڵی لە مشتیدابوو.

لەهەمان دەمدا دادوەری لێکۆڵینەوە گەشتە کارگەکە، وداوای پشکنینێکی وردی لەتەواوی کارگەکە کردوو سەرچاوەی ئاگرەکەش بدۆزنەوە.

پیاوانی پۆلیس، شوشەی بەتاڵی نەوتی وەدی کردوو هێنایان، دادوەر ڕووی لەژمێریارەکە کردوو وتی: پێشتر ئەم شوشانەتان بینیوە؟

_ بەڵێ، جان فۆرتییەم بینی پڕی دەکرد لەنەوت.

_ ئەتوانی ئەو قسانەی جان فۆرتییە بەرامبەر بە بەڕێز لابرۆ دووبارەی بکەیتەوە بۆم؟

_ بەڵێ گەورەم، کاتێک لەکارگە دەریکرد وتی(( ئاگاداربە لە چاکەی تۆ نابێت وابکەی))، ئەمە هەڕەشەیەکی تەواوە گەورەم، ڕەفتارەکانی ئاماژەن بۆ ڕق و کینەیەکی قوڵ.

_ پێت وایە تۆڵە تاکە هۆکاربێت؟

_ گومانی تیانیە گەورەم.

_ قاسەکە، دۆلابەکە بەتاڵ بوو؟

_ نزیکی دووسەد هەزار فرەنکی تیابوو.

_ بێجگە لەتۆ کەسی تر بەوە ئەزانێ؟

_ جاك جارۆد و جان فۆرتییە.

ئەودووانە دەیـــانزانی، بەڵام ئەوەتـــا جـــاکێ بێچـــارە لەکـــاتی دوورخســـــتنەوەی قاســــەکە لەئـــــاگرەکە، خۆی لەناوچوو.

لێکـــــۆڵەرەکە بەردەوام بـــــوو، دواتـــــر ڕووی لە ســــەرۆکی پۆلیســـــەکان کـــرد ووتـــی: بـــڕوا بە بۆچـــونەکەم بـــکە، تـــۆڵە تـــاکە پـــاڵنەر نەبـــووە، قاســـەکەی شـــکاندووە و دواتـــر ئـــاگری لەتەواوی کــــارگە بەرداوە، بەڕێــــز لابـــــرۆ گەڕاوەتەوە و چـــــاوەڕێی شـــــتێکی وانەبـــووە بـــۆیە هیچـــی بۆنەماوتەوە جگە لەوەی بیکوژێت.

ســـەرۆکی پـــۆلیس: ژنێـــك ئەتوانێـــت قاســـەیەکی ئاسنین بشکێنێت؟

ژمێریـــــارەکە: بەڵـــــێ، مـــــۆدەکەی کـــــۆنە و بەئاسانترین شێوە ئەتوانرێت بشکێنرێت.

ســـەرۆکی پۆلیســـەکان: ئەی چـــۆن بـــزانین ئـــاگرەکە پارەکەی لەناو نەبردووە؟

ژمێریـــــارەکە: مەحـــــاڵە گەورەم، ســـــێ هەزار فرەنکـــی ئـــاڵتونی تیـــابووە ئەگەر مابـــایەتەوە ئەتوایەوە وئەمانبینی.

دادوەری لێکـــۆڵینەوەکە لەپزیشـــکەکەی پرســـی: جـــۆری چەکەکەت زانـــی کە بەڕێـــز لابـــرۆی پـــێ کوژراوە؟

_ بەئەگەرێکـــــی زۆرەوە چەقـــــۆیەکی گەورەیە بەدڵیدا چەقێنراوە.

_ ئەی جـان کە ئەزانـێ بەڕێـز لابـرۆ لەکـارگە نیـیە بـــۆچی چەقـــۆی هەڵگرتـــووە؟ پـــێم وابێـــت هاوبەشـــێکی هەیە، ئافرەتێـــك بەتەنهـــا ناتوانێـــت ئەو هەموو تاوانە بکات.

_ لەوەیە چەقـــۆکەی هێنابێـــت تاقاســـەکەی پـــێ بکاتەوە.

_ ئەگەری هەیە.

دادەوەر خـــــاوەنی دووکـــــانەکەی بـــــانگکردوو، گەواهـــــی ئەوەی دا دوو ڕۆژ لەوەوبەر جـــــان فۆرتییە چوار لیتر نەوتی کڕیووە.

دواتـر بەکـورتی چەنشـتێکی دیـکەی لەسـەر جـان وت وتیشـــی کەوا هیـــوای ئەخواســـت دوو بۆســـێ هەزار فرەنکی هەبوایە.

دادەوەری لێکـــۆڵینەوە لەگەڵ پـــۆلیس کەوتـــنە لێکـــۆڵینەوە ۆلەکۆتایـــدا بڕیاریـــان دا، بەپێـــی ئەوبەڵگـــانەی دەســـتیان کەوتـــووە فەرمـــانی دەستگیرکردنیان بۆدەرکرد.

## _ ٨ _

لەناوەڕاســتی کــاتژمێر حەوتــی ســەر لە ئێــوارەی هەمـــــان ڕۆژ، پیاوێـــــك لەســـــەر یەكێـــــك لەکورســـــــیەکانی ئەو شـــــــمەندەفەرەی بەرەو هــاڤەر گەشــتی دەکــرد دانیشــتبوو، لەپیــاوێکی خانەدان ودەوڵەمەند دەچوو.

کۆمەڵێـــك کـــاغەز وئەوراقـــی لەبەردەم بـــوو، بەبایەخەوە لێی دەڕوانی.

ئەم پیــاوە پاڵەوانەکەمــانبوو جــاك جــارۆد، ڕەنگــی قژیشــی گۆڕیبــوو، کاغەزەکــانیش بــێجگە لەوانەی لەقاســەکەی بەڕێــز لابــرۆ دزیبــووی هیچــی تــر نەبوو.

لەڕاســتیدا کاتێــك جــاك ڕۆشــت بــۆژووەرکەی بەڕێــز لابــرۆ تــا ئــاگرەکە دابمــرکێنێتەوە لەنزیــك قاســـەکە لەکـــاتێ هەرەس هێنـــانی دیـــوارەکە هـــاورێکی ســـاختەی کـــردووە تـــاوابزانن

لەنـــــاوچووە، ودواتــــــر لەدەرگـــــای پشــــــتەوەی نوسینگە بۆی دەرچووە.

دواتـــــر بەرەو ژوورەکەی خـــــۆی دزەی کـــــردووە وخـــۆی حەشـــارداوە خەڵکـــیش وائەزانـــن بـــوە بەقوربانی، وئێستا پاڵەوانە لای ئەوان.

تـــاوەکو لەچـــاو دووربێـــت ڕۆشـــتووە بۆدارســـتانەکە ئێـــوارەی ڕۆژی دواتـــر لەحەشـــارگەکەیەوە بەرەو هـــاڤەر بەڕێکەوتـــووە و لە یەکێـــك لە ئوتێلەکـــان ماوەتەوە لەژێر ناوی پۆڵ هرمان.

نـــــاوی یەکێـــــك لەهـــــاوژوورە کرێکارەکـــــانیەتی بەهـــــۆی نەخۆشـــــیەوە گـــــوازراوەتەوە بـــــۆ خەستەخانە. جـاك جـارۆد هیچی بۆنەمـایەوە جـگە لەوەی بـــاری کەســـێتی و ناســـنامەی هـــاوڕێکەی هەڵبگرێت بۆخۆی.

ئێســــــتا ئەتوانێـــــت وەکـــــو قەڵغانێـــــك بۆخـــــۆی بەکاریبهێنێـــت، ئەگەریـــش کەســـێك گومـــانی کـــرد بـــاری کەســـێتی و ناســـنامەکەی پیشـــان دەدا وهـــیچ لەسەرخۆی ناهێڵێت.

جـــــــان بەخــــــــواردنەوە گەڕایەوە بـــــــــۆلای جگەرگۆشـــەکەی، و دوای خواردنیـــان خەوێکـــی قوڵ هەردووکیانی بردەوە.

کاتێـــك خەبەریـــان بـــویەوە تیشـــکی خـــۆر وەکـــو تیرێـــــك لەزەوی دەدا، و بـــــاو بـــــۆرانیش هـــــیچ ئاســــەوارێکی نەمــــابوو. جــــۆرج وتــــی: دایە، برسیمە.

لەئـامێزی گـرت و چاوەکـانی قەتـیس بـوون لەئـاو، وێنــای چارەنوســێکی بــۆ مــاڵ وحــاڵ کەچــاوەڕێی منداڵەکانی دەکات کرد.

خــــواردنی دەمـــی خۆشـــی دەدا بە جـــۆرج دەیزانـــی بەشـــی هەردووکیـــان ناکـــات و بەشـــی یەکێکیـــان دەکات.

دەیزانـــی ئـــاقڵانە نـــابێ بەڕۆژ لەناوگونـــدەکەدابن چەندین کاتژمێر هەرلەدارستانەکە مابونەوە.

لەکۆتایدا شەویان بەسەر هات.

جـــــان بەزەحـــــمەت قـــــاچی لەســـــــەر زەوی بەرزدەکـــردەوە ئەتـــوت بەبزمـــار بە زەوییەکەیـــان داکوتـــــاوە، بەهەر هەوڵ وتەقەڵایەك بـــوو خـــۆی گەیاندە گوندەکە.

جـان لەمـاڵی قەشـەی گونـدەکە فلـیکس لـۆژێ نزیـك بویەوە و لە دەرگای دا.

بەخێرایـــی خزمەتکـــارەکە دەرگـــاکەی کـــردەوە و لێـــی دەڕوانـــی، ژنێـــك ومنـــداڵێکی بچـــووك بەم شەوە!

جـــان بەدەنگێکـــی لەرزۆکەوە وتـــی: ئەتـــوانم ئەم شەو لاتان بمێنمەوە؟

_ بەدڵنیـــاییەوە، ســـاتێك چـــاوەڕێبکە تـــا بـــاوکە بانگدەکەم.

کەمێکـی پێچـوو قەشـە خـۆی هـات و بینیـان جـان لەسەر زەوییەکە وشك بۆتەوە وبوراوەتەوە.

قەشـــــە بـــــانگی کلاریســـــی خوشـــــکی کـــــرد، وگواســـــتیانەوە بـــــۆ ژوورەوە جێـــــی نەهێشـــــت تاهۆشی هاتەوە.

قەشـە وتـی: پـێم وابێـت برسـێتی هۆکـاری لەهـۆش چونەکەتە.

لەگەڵ خوشـــکە ئەوەنـــدەی بەســـبێت خـــواردنی بۆهێنـــا، لەگەڵ خوشـکە قسـەیان دەکـرد وسـۆزیان ئـاڵوگۆڕ دەکـرد تاهەسـت نەکـات لەنـاو بێگـانەیە و لەناو خێزانی خۆیەتی.

جـــان کەوتە دەســـت وپـــێ مـــاچکردنی قەشـــە و، وتـــی: ســـوپاس بـــاوکە، بەتەواوی برینەکـــانمەوە سوپاسگوزارتم.

_ ٩ _

هەواڵ گەشتە خوشکەکەی بەڕێز لابرۆ، یەکسەر خۆی گەیاندە ئاڵفۆرتفێڵ و ئەبڵەق بوو.

بێچارە بڕوای بەوەنەدەکرد کە دەیبینی و دەیبیستێت، چۆن ئاخر؟ .......

بیست وچوار کاتژمێر پێشتر براکەی لەبارەی پرۆژەی داهاتوو و چی بکات و چی نەکات لەگەڵی دەدوا کەچی ئێستا..........

لەپڕ خەونەکانی هەرەس دێنن و براکەی دەکوژرێت، کارگەکەشی دەسوتێنرێت وهەموو سەروەتەکەشی لەناودەچێت و نامێنێت.

ڕیکۆی ژمێریار لە سیرەوە تا پیاز هەمووی بۆ خاتوو لابرۆ باسکرد هەر لەسەرچاوەی ئاگرەکە تا دەگاتە هەڵهاتنی جان، ئافرەتە بەبەزەییەکە وتی: ئەوە چییەڵێی بەڕێز ڕیکۆ؟! براکەم جگە لەباشە بە هیچ شێوەیەکی دیکە باسی خاتوو جانی نەکردووە، تەنانەت داواشی لێکردم بیخەمە ژێر سێبەری خۆم. ئیتر چۆنەتوانی تاوانێکی لەوشێوەیە بکا، مەحاڵە. نا، گومانی تیانیە هەڵەیەك ڕوویداوە، بەهەڵە پەنجەتان داناوە.

_ بەڵام بەڵگەکان لەدژی زۆر بەهێزن.

بەنکۆڵییەوە شانەکانی هەڵتەکاند و وتی: دڵم پێمەڵێت بێتاوانە و هیچ تاوانێکی نییە.

ژمێریارەکە لەسەر بنکەی دارایی لەگەڵ خاتوو برتان کەوتە قسەکردن و وتی کەوا کارگە سەدهەزار فرەنکی قەرزارە بەڵام کۆمپانیاکانی دڵنیایی ئەو ئەرکە لەئەستۆ ئەگرن.

_ براکەم هیچ پارەیەکی لەبانك نەبوو؟

_ نا، پێش مردنی هەموو پارەکانی لەبانك ڕاکێشا بەمەبەستی کڕینی ئامێری نوێ بۆ کۆتا داهێنانی.

_ پارەکە لەکوێیە؟

لەبارەی دزینی پارەکەش ژمێریارەکە بۆی باسکردبوو چیبووە.

_ کەواتە هیچ بۆ برازاکەم نەماوەتەوە؟

_ بەڵێ، بێجگە لەو زەویەی کە کارگەکەی لەسەر بنیادبوو، بەڵام ناتوانرێت بفرۆشرێت.

_ لوسیان لەژێر باڵی من ئەبێت و خۆشم خەرجی ئەکێشم، و ئەیکەم بەپیاوێك کەیادی باوکی بە زیندووی بهێڵێتەوە.

برتانی خوشکی بەڕێز لابرۆ بەمەبەستی بینینی دادەوەری لێکۆڵینەوە بەرەو پاریس بەڕێکەوت.

دادوەری لێکـۆڵینەوە دڵنیـایی پێـدا کەوا سـزایەکی توند بەسەر بکوژەکەدا دەسەپێنرێت.

_ سـزای ڕەوا بەمـن چـی؟ خـۆ تـازە بـراکەم بـۆ ناگەڕێندرێتەوە.

_ بەداخەوەم، ڕاســت ئەفەرمــووی، بەڵام خــۆ نابێ خوێنەکەی هەروابڕوات.

_ تۆدڵنیایی جان فۆرتییە بکوژەکەیە؟

_ گومانم نییە خانمەکەم.

_ ژنێـك چـۆن لە توانایـدایە ئەو هەمـوو تـاوانە بکات؟

_ ڕق.....خـانمەکەم ڕق ئەبێـتە سـەرچاوەی هێـز و بوێری لەناخی لاوازترین ئافرەتدا.

_ ئەی ڕق بـۆچی؟ لەکاتێکـدا بـراکەم زۆر گرنگـی بەداهاتووی ئەوەدا؟

_ دیـارە تـۆ بێئاگـایی لەوەی دووڕۆژ پێشـتر جـانی وەدەرناوە.

_ ئەزانـم گەورەم، ئەوەش ئەزانـم لەهەمـان کاتـدا گرنگـی زۆر بەوەدا، داوای لێکـردم بیبـەم بـۆ لای خـۆم و جـێگەی بـۆ بـکەمەوە؛ وە قبـوڵم کـرد، نەیەویســت هەردەرییکــات دەرییکــات بەڵکــو

ئەیویست لەکارێك دووریبخاتەوە کە گونجاو نییە بۆی.

_ ئەی جان بەوەی ئەزانی براکەت وائەکات بۆی؟

_ پێم وانییە.

_ کەوایە گومانی تیانییە ڕق بووە بەرامبەری، یەك تۆسقاڵ گومانم نییە کە ئەو بکوژەکەیە، لەگەڵ ئەوەشدا چ بەڵگەیەك لەهەڵهاتنی بەهێزترە لەم کاتەدا؟

خاتوو برتان سەری لەقاند و وتی: بەدڵنیاییەوە ڕاکردنەکەی گومانی دروست کردووە، بەس کێ ئەزانێ کێ نالێ لە ترس و تۆقاوی و پەشۆکاویدا ڕاینەکردووە؟

_ ئەی ئەگەر تاوانی نەکردبێت چی ئەبێتە هۆی ئەوەی وا بپەشۆکێت و بتۆقێت؟ دوای ئەوەش کڕینی نەوت بەڵگەیەکی تەواو یەکلاکەرەوەیە.

خاتوو برتان کەمێك بێدەنگ بوو، وتی: کەواتە تۆمەتەکەی لەسەر سەپێنراوە؟

_هەمووی.

_ هیچ بیرت لەوە نەکردۆتەوە ئەکرێت کاری یەکێك لە کرێکارانی کارگە بێت؟

_ خـــــانمەکەم ئەم بگـــــرە و بەردە تۆمەتەکـــــان لەسـەر جـان لانابـات ناکرێـت لێـی خۆشـبیت، دیـارە تــۆ بــێجگە لەو گومانـــت لە یەکێکـــی دیـــکە هەیە بیڵێ بزانین کێیە.

_ پێکــات گەورەم، دوێنـــێ کــاتێ بــراکەم ســەردانی کـــردم باســـی داهێنــــانی ئـــامێرێکی ئەکـــرد کەوا ســەدان ملیـۆن دێنێــت، دوور نیــیە ئەم تــاوانە بــۆ دزینی ئەو داهێنانە کراوە.

_ براکەت نهێنی داهێنانەکەی بە کەس وتووە؟

_ بەڵـــێ، بەیەکێکـــی وتـــووە چـــاودێری کـــارگەیە، داوای هەمـــاهەنگی لێکـــردووە و بەڵێنـــی پێـــداوە پێنج لەسەدیشی پێبدات.

_ قســـــەکەت وادێـــــتەوە چـــــاودێری کـــــارگەکە بکوژەکە بێت؟

_ ڕای منە گەورەم.

_ ڕایــیەکەت مــاقولە و ئەبــێ لەبەرچــاو بگیرێــت، بەڵام کێیە؟

_ ناوی جاك جارۆدە.

دادوەرەکە ســـەری بـــادا، و وتـــی: جـــاك جـــارۆد؟ گومانەکانت بخەلاوە خانمەکەم.

_ بۆ؟

_ لەبەرئەوەی جاك جارۆد نموونەی بوێری وگیانفیدای بوو، کاتێ هەوڵی پاراستنی قاسەی براکەتی دەدا ئاگرەکە لەناوی برد.

دوای گفتوگۆیەکی درێژ و دڵنیایی لەلایەن داوەرەوە کەوا خوێنی براکەی هەروا ناڕوات، خاتوو برتان وەدەرکەوت.

_١٠_

دوای داپۆشینی خەمەکانی بە چاکەتێکی سۆز و خواردنێکی بەتام و پشوویەك و خەوێکی قوڵ و شوێنێکی پارێزراو بۆ کوڕەکەی دەمتوانی جان فۆرتییە لەماڵەکەی باوکە لۆژێ ببینم.

لەهۆڵی میوان باوکە لۆژێ لەگەڵ کلارێسی خوشکی و ئاتیینی وێنەگری هاوڕێیان لەبارەی کارەکانەوە دەدوان.

باوکە وتی دەزانی ئەم بێچارەیە لە ئالْفۆرتفێڵ ەوە هاتووە؛ بەڵام هۆکارەکەی نەوت: بێگومان هەژاری و لاتی تەنگی ڕۆشتنی پێ هەڵچنیوە، لە گنیەتمە کارێك یان بڕە پارەیەکی پێ بدەم.

لەم قسانەدا بوون پێشوازی لەپۆستەچییەکە کرد و ڕۆژنامەیەکیشی پێبوو.

باوکە لۆژێ یەکێک لە ڕۆژنامەکانی هەڵگرتوو خوێندیەوە، چاوی کەوتە سەر ناونیشانێکی دیار لەبارەی ئاگرکەوتنەوەیەك لە ئالفۆرتفێل، هەرئەوەنەی دێڕەکەی خوێندەوە وتی: خوایە! ئەمە مانای چییە؟

خوشکە و وێنەگرەکە ڕوویان لێکرد و لێیان پرسی، لەبارەی سووتانی کارگەیەك و کوشتنی خاوەنەکەی و تۆمەتبارکردنی ژنێك بەناوی جان فۆرتییە و ڕاکردنی لەگەڵ کوڕەکەی بەناوی جۆرج بۆ گێڕانەوە.

ئەبلەق بوون بەم هەواڵە، خاسیەت و تایبەتمەندییەکانی کت ومت بەتەواوی لەهەمان ژن دەکات کەئەوان داڵدەیان داوە، کوڕەکەشی ناوی جۆرجە هەمان ناوی کوڕەکەی ئەم.

گومانیان ڕەویەوە و دڵنیابوون هەمان ئەوژنەیە پۆلیس کون و قوژبنی بۆ دەگەڕێ.

وێنەگرەکە وتی: سەیرە، ڕووخسارێکی بێتاوانی هەیە.

قەشەکە وتی: جارێ پەلەمەکەن، لەژێر باڵ و داڵدەی ئێمەدایە جوان نییە پێش ئەوەی ڕاستییەکان بزانین تۆمەتباری بکەین. لەسەرخۆ قسەی لەگەڵ دەکەم.

خوشکە وتی: ئەگەر ئەوبێت چییەکەی؟

هەنــدێك پــارەی پێــدەدەم و داوای لــێکەم بــڕوات، هەواڵ لە ژنێـك نـادەم هـاتۆتە ژێـر سـەقفی مـاڵەکەم و داوای پاراستنی کردووە.

جــان خەبەری بــویەوە و بــاوکە لــۆژێ و خوشــکە و وێنەگــــــرەکە وەژوور کەوتـــــــن سوپاســـــــی ئەوهەمـوو چاکەیـانی کـرد، بـاوکە لێـی پرسـی، کچـم ئێستا ئەتوانی بەردەوامی بدەی بە گەشتەکەت؟

ڕووخســـاری ســـوور هەڵــگەڕا و وتـــی: گەورەم لەڕاســـتیدا مـــن نەهـــاتووم بـــۆ ئەم لادێـــیە تــابگەڕێمەوە، لەوەدابــووم تکــات لێــبکەم کــارێکم پێبدەی خۆم و منداڵەکانمی پێ بژێنم.

_ کەوایە منداڵی تریشت هەیە؟

_ منـــــداڵێکی یەك ســــاڵانەیە لەلای بەخێــــوکەرم داناوە لەلادێ، ئەمەش جۆرجە.

_ مێردەکەت لەکوێیە؟

_ مرد.

_ بەڵام چـــۆن کارێکـــت لێـــرە وەچنـــگ خەم لەکاتێکدا ناوت نازانم، کاغەزی کەسیت پێ نیە؟

موچــــوڕکەیەك بە لەشـــیدا هـــات، بـــاوکە لـــۆژێ نەیتـــــوانی لەوەزیـــــاتر بەرگە بگـــــرێ و لێـــــی پرسییەوە: کچم ناوت چییە؟

_ جان.

_ نازناوەکەت؟

_ فۆرتییە.

بـــاوکە بەپەلە وتـــی: کەوایە تـــۆ لەئاڵفۆرتفێـــڵ ەوە هاتوی؟

بەوپەڕی تۆقـــاوی و ترســـــەوە جـــان ســـــەری هەڵپـــڕی و لەناوچـــاوی قەشـــەی دەڕوانـــی: هەمـــوو شتێك ئەزانی؟

_ بەڵـــێ، بێچـــارە تەواوی پـــۆلیس بەدواتـــــدا دەگەڕێ.

_ چ تۆمەتێکیان داوتە پاڵم؟

_ سووتاندنی کارگە و کوشتنی خاوەنەکەی.

ڤیژانـــدی وتـــی: ســـوێندئەخۆم بێتـــاوانم و هـــیچ تـــاوانێکم نیـــیە، ســـوێندەخۆم کە مـــن هـــیچ تـــاوانێکم نەکردووە و بێبەریم.

تۆنی دەنگی جێگەی بڕوابوون بون.

قەشـــەكە و خوشـــكە و وێنەگـــرەكە لە یەكـــدیان دەڕوانـــی بە جۆرێـــك دیـــاربوو كـــاریگەربوون بەوتەكانی.

قەشەكە وتی: ئەگەر بێتاوانی بۆ ڕاتكرد؟

_ بـــۆ ڕامكـــرد؟ بەڵـــێ... بـــۆ ڕامكـــرد؟ ئەو پرسـیارەیە هـیچ وەڵامێـك نـادۆزمەوە بـۆی، گومـان و لێــك چونەكــان ئەوەنــدە زۆربــوون لە هەمــوو لایەك؛ بەس بـــوو بـــۆ ئەوەی تۆمەتبـــاربكرێم، منـیش بەڵگەیەكـم هەبـوو بـۆ بێتـاوانیم كـاتێ گەڕام بەدوایـــــدا نەمـــــدۆزیەوە و هـــــیچ چـــــارەیەكم نەدۆزیەوە بێجگە لە ڕاكردن.

_ بەڵگەكە بۆ كوێ ڕۆشت؟

_ نـــازانم، گومـــانم نـــیە لەوەی كـــاتێ ژوورەكەم گڕی گرت لەناوچووە.

كەمێك بێدەنگی....

دواتــر قەشــەكە وتــی: كچــم ئەتــوانی هەموویمــان بۆ باسبكەی؟

جــان دەســتی كــرد بە گێــڕانەوەی ژیــانی، هەر لە مردنـــی پیـــاوەكەی و بینینـــی جـــاك جـــارۆد لە كـــاتی كوشـتنی بەڕێـز لابـرۆ و تـا دەگـاتە خزمەتـی بـاوكە لۆژێ.

کاتێ تەواو هەمووی گێڕایەوە، باوکە لۆژێ وتی: چیرۆکێکی سەیرە، بەڵام بڕوات پێدەکەم، ئەزانم درۆناکەی بەڵام ئەو خاڵەی ناتوانم لێی بگەم ئەوەیە جاك جارۆد مردووە.

جان سەرسامبوو و پرسی: جاك جارۆد مرد؟

_ بەڵێ، لەڕۆژنامەکەدا هاتووە. ئەوەی نوسرابوو بۆی خوێندەوە.

_ فێڵە گەورەم، جاك بۆیە وایکردووە تا تۆمەتەکان لەسەر خۆی لابات، ئەیناسم گەورەم، پیسترین و چەپەڵترین کەسە.

_ بەڵام پۆلیس لە مردنەکەی کۆڵیوەتەوە.

_ لەمردنەکەی، ئەی هاوار. لەناوچووم، ئەگەر مردبێت هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ سەلماندنی. تکامەکرد ڕووبەڕووی ئەوەی بکەنەوە کە کردوویەتی.

باوکە وتی: کچەکەم ئەگەر ڕاکردنەکەشت تۆمەتەکانت لەسەر بسەلمێنێ من بڕوات پێدەکەم، واباشە بڕۆینە بنکەی پۆلیس و خۆت ڕادەست بکەی هەوڵەدەین بێتاوانیت بسەلمێنین، ئەمەباشتر ئەبێت بۆت هەتا هەتایە ناتوانی هەروا ڕابکەی و دەربەدەربیت.

_ ئەگەر بخـــرێمە زینـــدان بـــاوکە چارەنوســـی منداڵەکانم چی؟ بەرگەی دابڕانیان ناگرم.

_ ناتوانیـــت لێـــی ڕاکەی کچـــم، زووبێـــت یـــان درەنگ ئەم جیابونەوەیە ئەبێ ڕووبدات.

_ مـــاڵ وێـــران خـــۆم، یـــانی کـــوڕەکەم و کـــچەکەم نەبینم.

_ بەڵام بێتاوانیـــت دەســـەلمێنی و دەگەڕێیـــتەوە ناویان.

جـۆرج کـاتێ بینـی دایکـی دەگریـا خـۆی هەڵـدایە ئـامێزی و مـاچی کـرد، وتـی: دایە بـۆچی ئەگریـت با ماچت بکەم.

دەســتەکانی بە جەســتە لاوازەکەیــدا ئاڵانــد و خەم و پەژارە دڵـــی ئەو و ئەوانەشـــی لە دەووروبەری بوون گرت.

لەوساتەدا لە دەرگا درا.

جـان هەر گـوێی لەدەنگـی دەرگـا بـوو تۆقـا، وتـی: خوایە! هاتن، شوێنەکەمیان زانی.

منـــداڵەکەی بەتونـــدی لە ئـــامێزگرت، دەرگـــا کـــرایەوە و ســـەرۆکی شـــارەوانی و دەســـتەیەك لەپیـــاوانی پـــۆلیس وەژوورکەوتـــن. لەقەشـــە نزیـــك

بـویەوە و بەڕێـزەوە سـڵاوی لێکـرد، وتـی: بـاوکە، من بەناوی یاساوە هاتووم.

_ ئەزانـم، قۆڵبەسـتکردنی ژنێـك بەنـاوی جـان فۆرتییە.

_ خـۆیەتی بـاوکە، تۆمەتبـارە بە کوشـتن و دزی و سوتاندن.

جـان هەنگـاوێکی بەرەو سـەرۆکی شـارەوانی نـا و هاواری کرد: درۆیە، بێتاوانم.

_ تۆ جان فۆرتییەی دەرگاوانی؟

_ بەڵێ.

_ کەوایە بەناوی یاسا قۆڵبەستت دەکەم.

_ قۆڵبەسـتم کەن، ئەگەر ئەشـتانەوێ حـوکمی پەتـم بـۆدەرکەن، ئەوهۆکـارە واکـا مـن بکـوژبم و بڕیارەکـانی ئێـوە هەڕەشـە لەبێتـاوانیم یـان شێواندنی ناکات، ئەوە گەواهی بێتاوانیم دەدات.

یەکێـك لە پیـاوانی پـۆلیس نزیـك بـویەوە تـاوەکو کەلەپـچەی لە دەسـت بکـات، جـان ترسـا و هەنگاوێـك بەرەو دواوە کشـایەوە، وتـی: قۆڵبەستم مەکەن.

قەشـەکە وتـی: هیـوات هەبـێ کچـم، بەرگـری هـیچ سوودی نییە.

دەستی بۆ کەلـپچەکە برد. منـداڵەکەی لەولاوە دەستی کردبـوو بەگریـان، لە چـاوە پـڕ فرمێسـکەکانیەوە لەدایکـی دەڕوانـی کە دەیـبەن و دووری خەنەوە.

کـاتێ جانیـان دەبـرد جلەکـانی گـرت و وتـی: دایە، مەڕۆ، ئەترسم، مەڕۆ.

_ مەگری کوڕەکەم، ئەتوانی بێیی.

سەرۆکی شارەوانی: نا، قەدەغەیە.

_ چی، کوڕەکەم چیلێکەن؟

_ تـۆ بـۆ زینـدان، و کوڕەکەشـت بـۆ خـانەی بێسەرپەرشتان.

کـاتێ ئەم وشـانەی بیسـت ڕەنگـی پەڕی: خـانەی بێسەرپەرشـتان، کـوڕەکەم ئەنێـرن بـۆ بێسەرپەرشتان، مەحاڵە، بێسەرپەرشتان!

ئـاوڕی دایەوە بەرەو لای قەشـە و دەسـتی بـۆ درێـژ کـردوو دەپـاڕایەوە: بـاوکە کـوڕەکەم لـێکەن و ئەینێـرن و بـۆ داڵـدەدان، بۆخـاتری خـوا تێیـان بـگەیەنە، جیـاکردنەوەی دایـك لە منـداڵەکەی ئەستەمە.

_ کـچەکەم بەرگـری بێسـوودە، بەڵام کـوڕەکەت نانێردرێـت، لای خۆمەبێـت تـا بێتاوانیـت

دەسـەلمێنرێت و ئەگەڕێیتەوە، ئەگەریش حوکم درایت و نەگەڕایتەوە... لەژێر سێبەری منائەبێت و گەورەبێت وازی لێناهێنم کچم، دڵنیابە.

کڵاریسی خوشکی قەشە وتی: متمانەت هەبێت خوشکەکەم، جۆرج دایکێك دەدۆزێتەوە تاوەکو دایکە ڕاستەقینەکەی خۆی دەگەڕێتەوە.

_ کوڕەکەم نەبینم؟ چ دڵێك بەرگەی ئەم برینە ئەگرێت؟ گوێ نادەم بەوەی چ تۆمەتێکم ئەخەنە پاڵ، یان لەتاریکی زیندان بڕزێم، بەڵام لێکردنی منداڵەکانم......

بارودۆخەکە پڕاوپڕ بوو لەئازار، تەنها دڵی ئەو لەت لەت نەئەبوو، دڵی هەموو ئامادەبوانیش لەت لەت ئەبوو، تەنانەت پیاوانی پۆلیسیش فرمێسك نەما نەیڕێژن.

هێشتا جۆرج ئەگریا کاتێ کڵارێس لە باوەشی کرد، قەشە وتی: دایکت بۆگەشت ئەڕوا کوڕەکەم، زوو دێتەوە و یاریت بۆ دێنێت.

_ لێرەبم؟

_ بەڵێ کوڕەکەم، زۆریش یاری ئەکەی.

جان بە دڵی هەزار پارچەبویەوە وتی: بەڵێ، لێرە بمێنەرەوە کوڕم.

_ بەمەرجێ زوو بێیتەوە.

_ بەڵێ، زوو دێمەوە.

دواتـــر بەرەو خوشـــکی قەشـــە ئـــاوڕی دایەوە و وتـــی: بیبـه خـانمەکەم، وەکـو کـوڕی خـۆتێ دانـێ، خۆشـت بوێـت، هەمیشـەش دایکـی بـخەرەوە بیـری و فێـری بـکە خۆشـی بوێـت، و پێشـی بڵـێ کەوا هیچ تاوانێکی نەبووە بێتاوانبووە.

منــداڵەکەی لە ئــامێز گــرت و تێــر بەدڵــی خــۆی مــاچی دەکــرد، وتــی: کــوڕەکەم، دایکــت لێــت جیـائەبێتەوە، ئەگەر بەدەسـتی خـۆم بـوایە شـەو و ڕۆژ لەئـــامێزم دەگرتیـــت و لەنـــاو ماچەکانمـــدا نقــومم دەکــردی.... خۆشــمەوێی لەبیــری نەکەی؛ لەبیری نەکەی.

بەخێرایــی ڕۆشــت، لە کــونجێکی ژوورەکە ئــاتیینی وێنەگــر وەســتابوو، کاتێــك ئــاپۆڕاکە ڕۆشـــتن و نەمـــان ڕووی لە قەشـــە کـــرد و وتـــی: ئەم دیـــمەنە ئەکەمە تابلۆیەکی نەمر.

یـــادەوەرییەکەی دەرهێنـــا و چەنـــد هێڵێکـــی تێـــدا کێشا و تێبینی نوسی.

لێکـــۆڵەرەکە بە جـــان فـــۆرتییەی وت: ســـەبارەت بەو سێ تۆمەتە چییەڵێی کە ئاڕاستەت کراوە؟

_ هیچ بێجگە لەوەی بێتاوانم.

_ ئەگەر بێتاوانی بۆ ڕاتکرد؟

بێدەنگ بوو هیچی نەوت.

دووبارە وتی: قسەبکە، چیتە بۆ قسەناکەی

_ سوودی چییە لە کاتێکدا تۆ بڕوا بە یەك پیتیش ناکەی.

_ لەبەرئەوەی درۆیە.

_ بێجگە ڕاستی هیچی تر ناڵێم، بەڵام چیبکەم کە هەموو بەڵگەکان دژمن.

_ نکۆڵی لەوەکەی خاوەن کارگەکەت کوشتوو؟

_ بێ پێچوو پەنا.

_ نکۆڵی لەوەش ئەکەی ڕقت هەبووە بەرامبەری؟

_ بێگومان، چی والێکا ڕقم لێی بێت؟

_ لە کارگەکەی دەری کردی.

_ دەری نەکردم گەورەم، کاتێك زانی بۆ دەرگاوانی شیاونیم بەڵێنی پێدام کارێکی دیکەم بۆ بدۆزێتەوە.

_ نکۆڵی لەوەش ئەکەی کە کارگەکەت سووتاندوە؟

_ هەموو نکۆڵییەك.

_ چ بەڵگەیەکت هەیە بۆ بێتاوانیت؟

_ هیچ.

_ بەڵام بەڵگەکـــان ئەوە دەســـەلمێنن تـــۆ بکـــوژی، لە دووڕۆژی ڕابـــــردوودا بڕێکـــــی زۆر نەوتـــــت کڕیووە؟

_ ڕاستە.

_ شوشـــــەی بەتـــــاڵ لە شـــــوێنی کرێکارەکـــــان و نوسینگەکە دۆزراوەتەوە.

_ ڕێکخراوە تامن تێوە بگلێم.

_ قاســەکەت شــکاندووە و هەرچــی پــارەی تیــابووە دزیــوتە، کاتێــك بەڕێــز لابــرۆ تــۆی بینیــوە بــێ یەك و دوو کوشتوتە.

پێـــــداگربوو لەســـــەر ڕای خـــــۆی و وتـــــی: ئەم سووتاندووە، ئەم کوشتووە، و ئەم دزییوە..

_ چـــۆن قـــایلم دەکەی؟ لە ناوچـــاوم نوســـــراوە ساویلکە.

_ هەر چـــــــاوەڕێی ئەوەم لێکـــــــــردی گەورەم، تۆباوەڕ بەیەك وشەش ناکەی کە پێتی دەڵێم.

_ ئەی هەڕەشــــکەت بــۆ بەڕێــز لابــرۆ، نکــۆڵی لەوەش ئەکەی بەڵێنــــت پێــــداوە دوای دەرکردنــــت خێر لەخۆی نابینیَ؟

_ بەڵـــێ، وامـــوت، بەڵام بەوشـــێوەیە مەبەســـتم نەبـوو، مەبەسـتم بـوو بڵـێم دەرکردنـی بێـوەژنێکی بێچارەی وەکو من ناکرێ ئاماژەی خێربێت.

بەبێ ئەوەی هیچ نیەتێکی ترم هەبێت واموت.

_ بەڵام ئەتزانـی قاسـەکە پـارەی تیـایە، ئەوکـاتەی ژمێریارەکە پارەی هێناوە تۆ لەوێ بووی.

_ ڕاسـتە گەورەم کـێ هەیە شـوێنی پـارە نەزانێـت و نەیدزێت.

_ ڕاکـــردنەکەت؟ تـــاکە بەڵـــگەی یەکـــلاکەرەوەیە لەسەر تاوانەکەت.

_ بەڵکـو بەڵـگەیە بـۆ لاوازیـم، ئەوەی بکـوژەکە وتی تۆقاندمی.

_ هاوار بۆتۆ، ئەتەوێ بڵێی بکوژەکە ئەناسی؟

_ بەڵکو کاتێك بەڕێز لابرۆی کوشت بینیم.

_ کێیە؟

_ جاك جارۆد چاودێری کارگە.

لێکـــۆڵەرەکە پێکەنـــی و وتـــی: کەســـی تـــرت نەدۆزیـــیەوە تۆمەتبـــاری بـــکەی، بـــێجگە لە پیـــاوێکی مـــردووی بینـــراو کە بەشـــەرەفەوە مردووە؟

_ پێیان وتم مردووە.

_ کەوایە چـــۆن بە مێشـــکتدا هـــات تۆمەتبـــاری بکەی؟

_ لەبەرئەوەی ئەوە ڕاستیەکەیە.

_ چ بیانویەکت هەیە؟

_ نامەیەکی یەکلاکەرەوەم هەبوو.

_ لەکوێیە؟

_ ئاگرەکە لەناوی برد.

جـارێکی تـر بەقـوڵی پێکەنـی و وتـی: خـوایە لە تـۆ ئەتەوێ بڕوات پێبکەم.

_ گەورەم، ئەتـــوانی گـــوێ لە تەواوی مەینەتـــی من بگری؟

_ بڵێ.

هەروەك چـۆن بـۆ قەشـەی گێـڕایەوە ئـاواش بـۆ ئەم.

بەڵام هەمـــــان بـــــڕوای قەشـــــەی لەلایەن لێکـۆڵەرەکەوە بەدەسـت نەهێنـا، بـێجگە لە نکـۆڵی کردن و گاڵتەپێکردن.

کاتێـك تەوابـوو لە بەسـەرهاتەکەی، لێکـۆڵەرەکە وتـــی: بەڕاســـتی ئەبـــێ گەواهـــی ئەوەبـــدەم ئەندێشەیەکی چاکت هەیە.

لەگەڵ ئەوەشـــدا خـــۆت ئەخەیـــتە درۆوە، ئەڵێـــی جـــاك جـــارۆد نـــامەیەکی بـــۆ نـــاردوی کە بەڵگەیەکـــی یەکـــلاکەرەوەیە لەســـەر بێتاوانیـــت، ئەی کـوا چارەنوســی ئەم نـامەیە؟ فڕێتـدایە سـەر زەوی، مـــرۆڤ چـــۆن کـــارێکی وا لەهەمـــبەر نامەیەکی واترسناك ئەکات؟

ئەشـڵێی بەڕێـز لابـرۆ کەسـێکی بە بەزەیـی بـووە و هـیچ ڕقێکـت نەبـووە بەرامـبەری، لەگەڵ ئەوەشـدا کـــاتێ بکـــوژ ئەوی دەکوشـــت تـــۆ هـــیچ هەوڵـــی ڕزگارکردنیت نەداوە؟

دواتـــریش تۆمەتەکـــانی خـــۆت دەدەیـــتە ســـەر کەســـێکی مـــردوو بە شـــەرەف تـــاخۆت قوتـــار بکەی.

نا، نا، خانمەکەم، ئەم چیرۆکە قایلم ناکات.

_ هـــیچ بەڵگەیەکـــم لەســـەر بێتـــاوانیم نـــیە، بەڵام لێتەپاڕێمەوە بڕوام پێبکە.

_ باشتر نییە لەبری ئەم بگرە و بەردەییە ڕاستییەکە بڵێیت وخۆت ئەوەنەیترە شەرمەزار نەکەی؟

_ بەڵام ڕاستییەکەم پێوتی گەورەم.

_ هێشتا هەر نکۆڵی ئەکەی؟ لەسەر خۆت.

لەزەنگۆڵەکەی داو و فەرمانی کرد بەناردنی بۆ زیندان.

دوای چەند ڕۆژێك جان ڕۆشتە بەردەم دادوەر.

بەڵگە بە بەڵگەی ئەوت بڕۆ ئەولا، ئەو بێچارەش بەڵگەیەك هیچی نەبوو، چیرۆکەکەشی بە لایەنی خەڵك و دادوەر هیچ نەبوو جگە لەخەیاڵێکی هیچ.

لە کۆتاییدا ساتە هەستیارەکە کاتی هات، دادوەر حوکمی دەرکرد....... زیندانی هەتا هەتایی!!

جان لە تاوا دەستی کرد بەقیژەو هات و هاوار.

هاوارکردنێکی پڕ لەئازارو ماڵئاواییەکی هەمیشە لەکوڕەکە بچکۆلەکەی.

## _ ١١ _

کەشتی لۆردمیر بەرەو شارەکانی ئەمریکا مەلەوانی دەکرد؛ لەنێویشیاندا جاك جارۆد کە ناوی پۆڵ هرمانی لە خۆی نابوو لەسەربوو.

پۆلیسی کەشتییەکە هات و یەك بە یەك ناوی سەرنشینانی پلەی یەکی دەخوێندەوە و کاغەزێکی پێدەدان.

جارۆد چاوەکانی لەسەر ئەو دەریایەی کەوتۆتە نێوان ئەو و ئەوشارەی تاوانەکەی تێدا کردووە جێگیر کردبوو.

جار جار لەسەرنشینێکی ئەمریکی کە لەگەڵ کچە شۆخ و شەنگەکەی دانیشتبوو دەڕوانی.

پۆلیسەکە بەناوی نایۆمی مۆرتیمۆر و خاتوو مۆرتیمۆر بانگی کردن و کاغەزەکانی پێدان.

لەکۆتایشدا ناوی جاك جارۆدی هێنا و کاغەزەکانی پێدا.

لەنێو سەرنشینەکانی پلە دوو گەنجێك بە ناوی ئۆڤید سۆلیفەر لە سەرنشینەکانی پایەی یەکی دەڕوانی.

وشـــك ببــوو كـــاتێ نـــاوی پـــۆڵ هرمـــانی بیســـتبوو، لەبەر خـــۆیەوە دەیـــوت: ســـەیرە! پـــۆڵ هرمـــانی کوڕە خاڵم! وامزانی مردووە.

چـــاوی بڕیبـــووە نـــاو چـــاوی جـــاك جـــارۆد و بەخـــۆیەوت: ســـەیرە! تەنیـــا دووجـــار زیـــاتر و نـــا کـــوڕی خـــاڵم بینیـــوە. لەگەڵ ئەوەشـــدا هـــیچ لێکچوونێـك لەنێـوان ئەم پیـاوە و کـوڕە خـاڵم نـابینم، لەوەیە دووپیـــاوی جیـــاواز بـــن و هەمـــان ناویـــان هەڵگرتبێت.

ئۆڤید بەردەوام بـوو: ئەبـێ بـزانم ئەم پیـاوە چییـە، بەڕاســـتی کـــوڕی خـــاڵمە؟ بەڵام چـــۆن بـــڕۆم بـــۆ پـــلەی یەك لەکاتێکـــدا بـــۆ پـــلە دووەکـــان قەدەغەیە بچنە پلە یەکەکان؟

نامەیەکی بۆ ئەنێرم تا بمبینێ.

لە شـــوێنەکەی خـــۆی هەســـتا و نزیکـــی پـــلەی یەك وەستا.

_ گەورەم، چاکەیەکم لەگەڵ کەی؟

_ لەخزمەتدام.

_ لەنێـــو سەرنشـــینەکانی پـــلە یەك سەرنشـــینێکی لێـــیە کـــوڕی خـــاڵمە وامزانـــی مـــردووە، ئەتـــوانی بـــانگی بـــکەی تاچـــاوی بە مـــن بـــکەوێ. خـــۆتەزانی قەدەغەیە بۆ ئێمە بێینە شوێنەکانی ئێوە.

_ لەخزمەتدام، ناوی خاڵۆزاکەت چیە؟

_ پۆڵ هرمان، خۆشم ناوم ئۆڤید سۆلیفەرە.

_ باشە بانگی دەکەم بۆت.

ئەمەریکیەکە بەرەو نوسینگەی کارگێڕی بەڕێکەوت ، بە یەکێك لە خزمەتکارەکانی وت نامەیەکی پێیە بۆ کەسێك بەناوی پۆڵ هرمان.

کاتێك خزمەتکارەکە نامەکەی هێنا بۆ جاك، ڕووخساری پەڕی و وتی: بەڵام کەس ناناسم بەو ناوەوە.

_ لەدیجونە گەورەم، ئەڵێت تۆ خاڵۆزای ئەویت و وایزانیوە مردوویت.

_ اەەەە، کوڕی پورم، ئۆڤید سۆلیفەر، لێرەیە، دەڕۆم بۆلای.

بەخێرایی ڕۆشت بۆ ژوورەکەی و لەکاغەزەکانی دەکۆڵیەوە، بۆی دەرکەوت بەڕاستی پۆڵ هرمان پەیوەندی بە خێزانی سۆلیفەرەوە هەیە. بەخۆی وت: ئێستا چیبکەم؟ ئەگەر چاوم پێی بکەوێ لەوەیە گومانی لادروست ببێت. ئەگەر بڕۆم ئەزانێ درۆکەم، لەگەڵ ئەوەشدا چاکەبێت بڕۆم.

بێ دوودڵی بەڕێکەوت.

ئۆڤید: کەوایە تۆکوڕی خاڵمی، وامزانی مردوویت.

_ چۆن ئەم هەواڵەتان بۆهات؟

_ پێنج ساڵ پێش ئێستا، لەدیجون کرێکارێك لە پاریسەوە هات بۆلای دایکت و پێی وت کەوا لە خستەخانە مردوویت. تووشی شۆك بوو، دواتر توشی تابوو و لەئەنجامدا بەرگەی نەگرت و مرد، هەمووان ئەوەندە شپرزەبوون نەیانکرد پەیوەندی بەخەستەخانەوە بکەن تابزانن ئاخۆ ڕاستە یان نە، گومانی تیانیە تۆ هەواڵی مەرگیت زانیوە.

_ بەڵێ، زۆر خەمباربووم.

_ بێگومان ڕۆشتی بۆ دیجۆن تاوەکو ببیتە جێگرەوەی ئەوەی کەبۆت ماوەتەوە.

_ بێگومان.

_ من هیچم پێنەهات.

_ کەوایە باوانت مردوون؟

_ بەڵێ، دووساڵ پێش ئێستا، خێزانەکەمان لەناوچوو، لەسولیفەرەکان تەنها من ماوم و لەهرمانەکانیش تەنها تۆ.

دواتــر پێکەنــی و وتــی: شــەش ســاڵە یەکمــان نەبینیـــوە، ئەگەر نـــاوی خـــۆت نەهێنـــایە نەمدەناسـیتەوە، پـێم بڵـێ؛ کۆتـا کۆبونەوەمانـت بیـرە لە مرسـیلیا؟ تـۆ لەودەوڵەمەنـدانە نەبـووی؟ لەکوێ ئەم ڕووکارەت هێناوە؟

_ دوڵەمەنــدنیم، بەڵام هەژاریــش نــیم. لەســەر داهێنانێـک ڕازی بــووم و کەمێـک پـارەی وەچنــگ خستم.

ئۆڤید سۆلیفەر سـەری بـادا و وتـی: سەرسـام نـیم داهێـنەر بیـت لەقوتابخـانەی هـونەر و پیشەسـازی ئێمەت سەرسام کردبوو.

_ بەڕاســتی ڕۆژەکــانی قوتابخــانە لەبیرنــاکرێن. بەچییەوە سەرقاڵی؟

_ بەکاری خۆم.

_ کاری خۆت چییە؟

_ سەیرە! لەبیرت چووە من میکانیکم.

جـاك ئـاوڕی دایەوە زانــی دەمـی بەگـوێی نەکـردوە و هەڵەیە، وتـــی: بیگومـــان، لەبیـــرم نەکـــردووە، بەس کەمێــک مێشــکم ســـەرقاڵە. بــۆچ شــارێك دەڕۆی؟

_ نیویۆرك.

_ پێت وایە دۆزینەوەی کاری میکانیکی ئاسان بێت؟

_ بەڵکو دۆزیویشمەتەوە، وەکومیکانیك لە کارگەیەکی ئەمریکی بەناوی نایۆمی مورتیمۆر کارەکەم.

_ کەواتە ئەیناسی؟

_ ئەو ئەمریکیە کە بەتاسەوە لێت دەڕوانی، لەڕاستیدا لە بیریت جوانترە.

_ بیریت کێیە؟

_ چۆن وا زوو لەبیرت کرد؟ ئەو کچەی لەڕابردوودا شێتی بویت.

بۆجاری دووەم جاك زانی زیادەڕۆی کردووە.

_ سەدەیەکە لەبیرم کردووە.

بەڵام ئەم بەهانانەی نەیتوانی فێڵ لە ئۆڤید بکات، بەخۆیەوت: ئەمە چییەتی؟ لەبیری چوو من میکانیکیم، ئەوکەسەشی کەبۆی دەمرد ئەویشی لەبیرکردووە، مرۆڤ بەئاسانی ئەو کەسە لەبیرناکات کە خۆشیویستووە.

جاك بەپەلە قسەکانی گۆڕی و وتی: کەواتە لەکارگەی نایۆمی مۆرتیمۆر کارەکەی؟

_ بەڵێ، بۆماوەی سێ ساڵ لەگەڵ بریکارەکەی گرێبەستم کردووە، مۆرتیمۆریش یەکێکە لەگەورە داهێنەرەکان، لەم دوایەدا ئامێرێکی سافکردنی داهێناوە هەر لەگەڵ دەرچوونی شۆڕشێکی پیشەسازی دروست دەکات.

جاك ڕەنگی زەردهەڵگەرا، ئامێری سافکرن؟!

تۆبڵێی بەسەر ئامێرەکەی ئەم کە سێ تاوانی لەسەر ئەنجامداوە ببەزێ؟

ئۆڤید: لەوەیە لەبەر شارەزایم لەو ئامێرانە لەسەر پێنج سەد فرەنکی مانگانە ڕێکەوتبێتن لەگەڵم.

_ ئەتوانی وەسفی ئەو ئامێرەی مۆرتیمۆر کە شۆڕشێك دروست دەکات بۆم بکەی؟

ئۆڤید سۆلیفەر لەبارەی ئەوئامێرەی سافکردن کەوا بازاڕ دەلەرزێنێت دەدوا.

لەدرێژەی قسەکانیدا جاك کڵاوەکەی لابرد، توێڵی ئارەقی کردبۆوە و دەیسڕی.

ئەوبۆیەی لەقژی دابوو پێنج ڕۆژی بەسەرا گوزەرابوو، ئۆڤید هەستی بەجیاوازییەك کرد لەنێوان قژی کوڕە خاڵەکەی وئەوکوڕەی لەبەردەمیدایە.

بەخۆیەوت: قژی کوڕە خاڵەکەم ڕەشێکی خەڵوزییە، بەڵام قژی ئەم کوڕە بۆیەیە.

چیدی گومانی لەوەنەمابوو کەوا ئەم کوڕەی لەبەردەمیدایە کوڕە خاڵەکەی نییە و ناوی ئەوی بۆ خۆی بردووە.

جاك جارۆد زانی ئۆڤید گومانی کردووە، لەدڵی خۆیدا وتی: هاوار بۆخۆم، ئەگەر نەجوڵێم گومانەکان جێگیرئەبن، هەردووکیان تەوقەیان کردوو، دواتر هەر یەکیان لایەکی کەشتییەکەیان گرتە بەر.

لەسوچێکی دوور و تەنیادا ئۆڤید کارەکانی خۆی ڕادەپەڕاند، ئێستا تەواو یەقینە کە ئەم پیاوە ناوەکەی بەکارهێناوە، بەڵام چ سوودێکی پێ ئەگات لەو کارەی کەدەیکا؟ کوڕە خاڵەکەی دەوڵەمەند نەبوو، بەکارهێنانی ناوەکەی چ خێرو بێرێکی تێدایە؟

بەهیوابوو لە پلەی یەکەم بێت تابتوانێ بە ئاسانی چاودێری بکات، بەڵام پارەی لەکوێبوو تا بیگوازێتەوە بۆ پلەی یەك؟ لەم بیرانەدا بوو پیاوێکی شەست و پێنج ساڵ بە جانتایەکی قایشی مام ناوەند سەرکەوت. ئۆڤید بەخۆیەوت: لەو جانتایەدا شەست هەزار فرەنکی کاغەزی

تێــدایه؛ خــۆم بینــیم دەیژمــارد. خــۆزگە ئەمــدزی یەکسەر ئەچووم بۆ پلەی یەك.

لەنــــاو کەشــــتییەکە هەر بیرکـــــردنەوەی ئەوەی چۆن بیدزێت هەر دەهاتوو دەچوو.

لەم هــاتوچۆیە بــێ ئۆقرەیەیــدا گــوێی لەورتە ورتــی دوو پیــاو بــوو، قســەکانیان ئۆڤیــدیان ڕادەکێشــا بــۆ خۆیان.

لەقســـەکانیاندا زانــــی یەکێکیــــان پزیشــــکە وئەوی دی کەنەدی، کـــــابرای کەنەدی باســـــی گیــــایەکی عەجیبـــــی دروســــتکراوی هنــــدییە ســــوورەکانی دەکـــــــرد لەهەنـــــــدێك نـــــاوچەی ئەمریکـــــــا، تایبەتمەنـــدییەکانی نەهێشـــتنی تــــایەکی ســــەختە لەمـــــاوەیەکی زۆر کەمـــــدا، لەهەرە تایبەتمەنـــدییە عەجیبەکـــــانی ئەوەبـــــوو هەرکەس یەك دڵـــــۆپی لێبخـــــواردایە هەرچـــــی کـــــاری شـــــاراوەی هەیە دەیخــــاتە بــــاس، کەوچکێکــــی لێبخــــوات چارەکێــــك نابــــات کەســــەکە دەســــەکات بە وڕێــــنە کــــردن و هەرچــــی نهێنــــی وئەمــــلا ولای هەیە ئاشــــکرای دەکات.

ئۆڤیــد ســۆلیفەر کە گــوێی لەم قســانەبوو بەخــۆی وت: ئەگەر یەك کەوچــك بــدەم بەکــوڕە خــاڵەکەم هەموو شتێك ئاشکرا ئەبێ.

دکتۆرەکە بە کەندییەکەی وت: بەهەقەت سەرنج ڕاکێشە، بەڵام تاخۆم تاقی نەکەمەوە بڕواناکەم، لەکوێ ئەتوانم بیدۆزمەوە؟

کەنەدییەکە:لەنیویۆرك، لەلای شوشیلینۆ. ژمارە ٢٤ لەشەقامی یانزە.

ئۆڤید بەهەڵپەهەڵپ ڕۆشت و ناونیشناکەی لای خۆی نوسی: ئەبێ هەر کەوچکێکم دەسکەوێ لەم ڕەچەتە.

لەوادەی ئەم ڕووداوانەی نێوان دکتۆرەکە و کەنەدییەکە جاك جارۆدیش لە هۆڵی پێشوازیکردن وێڵی ڕێگایەك بوو تا خۆی لەنایۆمی مۆرتیمۆر نزیك بکاتەوە.

ئاوڕی دایەوە بینی کچەکەی ئاوازێکی فەرەنسی لەسەر پیانۆکە دەژەنێ، کاتێ تەواویکرد سەرسامی خۆی بەژەنینەکە دەربڕی و وتی: هەتا ئێستا ئەوەندە سەرنجم بۆ ئاوازی فەرەنسی ڕانەکێشراوە.

زەردەخەنەیەکی کردوو وتی: تۆ فەڕەنسیت گەورەم؟

لەو دەستەواژە کورتەوە جاك ئەوەی بیرهاتەوە کەوا میکانیکیە، دەڕوات بۆ نیویۆرك بۆ سەردانی کارگەکەی، وتی: وەك دەوترێت

کارگەکـــانی مۆرتیمـــۆر لە مەزنتـــرین کارگەکـــانی نیویۆرکە.

کـــچە زەردەخەنەیەکـــی کـــرد، ڕاســـتەوخۆ نەیـــوت لەگەڵ کـــچەکەی قســـەکەی، وتـــی: تـــۆ ئەو پیـــاوە دەناسی گەورەم؟

_ نا، لەنیەتمدابوو بیناسم.

_ پێت خۆشە پێتی بناسێنم؟

_سوپاسگوزار ئەبم، کەوایە تۆ ئەیناسی؟

هیلین پێکەنی و وتی: باوکمە.

جـــاك خـــۆی واپیشـــاندا کەوا سەرســـامە، وتـــی: باوکـــت؟ کەوایە بـــا پیرۆزباییـــت لێـــبکەم خـــانمەکەم، لەگەوهەرەکانی سەردەمە.

_ باپێتی بناسێنم، ناوت چییە گەورەم؟

_ پۆڵ هرمان.

_ دەی وەرە.

کـــچەکە و پـــۆڵ هرمـــان بەرەو نـــایۆمی مۆرتیمـــۆر بەڕێکەوتـــن وەئەمـــریکیەکە پێشـــوازییەکی گەرمـــی لێکـــــرد، لەبـــــارەی بـــــارودۆخی پیشەســـــازی و داهێنانە تازەکان دەدوان.

مۆرتیمۆر لەبارەی مەکینەی خەیاتی و قازانجە زۆرەکەی بۆکارگەکەی دەدوا.

جاك وتی: بەڵام ڕێگەم پێبدە یەکەم کەموکوریت پێ بڵێم.

_ تۆ بڵێ چ کەموکوڕییەکی هەیە؟

_ دەنگی بێزارکەرە.

_ بڕوام کرد، پێنج ساڵە کاری لەسەرەکەم هیچ ئاکامێکیم نەبینیوە.

جاك پێکەنی و وتی: ئەگەر بەڕاستی هەوڵت دابێت.

_ یانی تۆتێت پەڕاندووە؟

_ ئەکرێت.

_ فزوڵی نابێت ئەگەر ڕێگای لابردنەکەی بپرسم؟

جاکیش بە لێهاتووی و بەباشی لەسەر بیردۆزەکەی دەدوا، بەزمانی میکانیکی وردوو درشتی بابەتەکەی ڕوون کردەوە.

کاتێ تەواو بوو مۆرتیمۆر، وتی: گومانم نییە کەوا تۆ سەرکەوتنت پێکاوە، ئەم داهێنانە ئەبێت

ناوبنرێت (( ئامێری خەیاتی بێدەنگ))، ئەتەوێ کەی بیخەیتە بازاڕ؟

_ کەی ئەمەوێ بیخەمە بازاڕ؟ هەرگیز نامەوێ بیخەمە بازاڕ؛ ئەم داهێنانە نوێیە بۆتۆ وازلێدێنم.

_ مەحاڵە قبوڵی بکەم، ئەو ئامێرە قازانجێکی زۆری هەیە، چۆن وازیلێدێنیت؟

_ سوورم لەسەر ئەوەی سەدان هەزاریشم بۆبێنێ.

مۆرتیمۆر بە خۆیەوت: وەك ئەبینم پیاوێکی بەڕێزە، خۆزگە ئەمکرد بە بەڕێوبەری کارگەکەم.

دواتر وتی: ئەگەر وازیلێدێنیت مەرجێکم هەیە.

_ چییە؟

_ قازانجەکەی بەشبکەین، ئامێرەکەم داهێناوە بەڵام تۆ ئەم چاکردنەوە بەسوودەیت بۆزیاد کردووە، مافی خۆتە قازانجەکەی بەشبکەین.

جاك شانەکانی هەڵتەکاند و وتی: سوپاست دەکەم بۆ ئەم پێشنیازە بەخشندەیەت، بەڵام ئێستا نامەوێت بەم داهێنانە لاوازە خەریك بکەم، بیرم بە پڕۆژەیەکی گەورەتر سەرقاڵە.

_ ئەتەوێت لەشارەکەمان کارگەیەك بکەیتەوە؟

_ بەڵێ، بۆ بەرهەمهێنانی ئامێری سافکردن.

مۆرتیمـــــۆر هەرکە ئەم دەســـــتەواژەی بیســـــت پەشۆکا، هەمان ئامانجیان هەیە.

لەئۆڤیـــدەوە زانیبـــوی کەوا مۆرتیمـــۆر بەنیـــازی ئامێرێکی وایە؛ بەهەلی زانی و وتی.

نـــایۆمی کـــپ بـــوو لەســـەر نهێنـــیەکەی خـــۆی، وتـــی: پێم وانیە ئامێری سافکردن باشتر بکرێت.

جـــارۆد پێکەنـــی و وتـــی: چییەڵێـــی؟ مـــن خـــۆم لەداهێنانەکەدام؟

_ مەبەستت چییە؟

_ مەبەســـــــتم ئەوەیە ئەو ئـــــــامێرەی کەهەیە جەســـتەی تەخـــتە ســـاف ولـــووس دەکـــات، بەڵام ئەوئـــامێرەی کەدەمەوێ بەرهەمـــی بێـــنم تەنـــانەت چاڵ وچۆڵیەکانیشی چاکدەکاتەوە.

هەرئەمەی بیســـــت مۆرتیمـــــۆر ڕەنگـــــی زەرد هەڵـــگەڕا، ئەوئـــامێرەی کە بـــازاڕی دەهەژانـــد لەبەرچـــاوی بـــوو، ئێســـتا ئەم فەڕەنســـیە هـــاتووە تاڕکابەرایەتی بکات!

کەمێـك بێـدەنگی دایگـرت، مۆرتیمـۆر نقـومی نـاخی خـۆی ببوو.ســـەری هەڵبـــڕی و وتـــی: گـــوێبگرە

هاوڕێ، ئەمەوێ هەندێك شتت پێ بڵێم، گومانم نییە ئەو ئامێرەی کەباست کرد قازانجێکی زۆرت بۆ ئەهێنێت، بەڵام نابینی کردنەوەی کارگەیەك لە شارەکەمان بێ ئەوەی نەریت و کلتورمان بزانی مەترسییەکی گەورەیە؟

_ ڕاستە، هیچ پێشنیازێکت هەیە؟

_ بێگومان.

_ چۆن؟

_ ببی بەهاوبەش مو قازانجەکەی بە شبکەین لە بری ئەوەی پارەکانت بخەیتە مەترسییەوە لە کردنەوەی کارگەیەکی نوێ، ئەتوانیت وەکو بەرهەمهێنانی مەکینەی خەیاتییەکە و سافکردنەکە دەست بە کارکردن بکەی نیوەی قازانجەکەشی ببەی، ئێستا چەکێکی پەنجا هەزار دۆلاریت پێدەدەم.

خۆشی باڵی کێشابوو بەسەر جاك جارۆددا، بەڵام بۆئەوەی ئەمریکییەکە بخاتە تەڵەی خۆیەوە دەیویست ناڕەزایی بنوێنێ.

هیلین خۆی هەڵقورتاندە قسەکانیان و وتی: گەورەم ئەگەر هاوبەشی باوکم ڕەت بکەیتەوە هاوڕێیەتیمان هەڵدەوەشێتەوە.

**جـاك پێكەنــی و وتــی: لەبەردەم ئەم تكــایە نــاتوانم بكشێمەوە خانمەكەم.**

**مۆرتیمـۆر دەسـتی گووشــی و وتــی: كەواتە بـووین بەهاوبەش، ئێستا پێم بڵێ تۆخێزانداری؟**

**_ نا، گەورەم.**

**_ كەوایە لەمـــاڵەكەی خۆمـــدا ژوورێكـــت بـــۆدابین دەكەم.**

**_ زۆر سوپاس گەورەم.**

**دواتـــر بەخـــۆی وت: چەنـــد مـــانگێكی كەم و ئەبـــم بە زاوای.بەڕاستی بەخت بۆم پێدەكەنێ.**

**كاتێـــك وێـــنەی ئۆڤێـــد ســـۆلیفەر لەبەر چـــاوی دەركەوت ڕەنگـــی پەڕی، وبەخـــۆ وت: كەســـێكی ڕێگـــرە ئەبێـــت لایـــبەم لەژیـــانی خـــۆم، ڕێگـــایەك ئەدۆزمەوە بیخەمە ژێر ڕكێفی خۆمەوە.**

**_ ١٢_**

**نیـــوەڕۆی ڕۆژی دواتـــــر تەواوی سەرنشـــینەكان لەســـــەر بـــــاخیرەكە كۆببـــــونەوە ولەو كەشـــــتیە جەنگانەیان دەڕوانی كە بەلایاندا تێدەپەڕی.**

جاك جارۆد ئاپۆڕاكەی جێهێشت و بەدووی ئۆڤید سۆلیفەر وێڵ بوو، لەكونجێكی باخیرەكەدا خەنجەرێكی بەدەستەوە بوو هەوڵیدەدا بیشارێتەوە، جاك جارۆد نزیك بویەوە و بەوردی چاودێری دەكرد تابزانێ چییەكا، بینی وەدووی پیاوێكەوەیە كە سەرقاڵ بوو بەسەیركردنی كەشتییە جەنگیەكە.

ئۆڤید جانتاكەی لەناوەندەكە بینی، خەنجەرەكەی دەركردوو جانتاكەی بڕی و دەستی بۆناو گیرفانەكانی درێژ كردوو و دواتر بەخێرایی گەڕایەوە بۆ ژوورەكەی.

جاك ڕۆشت بۆشوێنی مانەوەی و وتی: هاوار بۆتۆ، ئەوە چیت دزی؟

ڕووخساری ئۆڤید پەڕی وتورك بوو وتی: چیت دزی؟ هیچ ....... بێ.......بێگومان.

_ واز لەنكۆڵی بێنە سوودت پێناگەیەنێ.

باڵی گرت و ڕایكێشا بۆ سوچێكی دوور لەسەرنشیەكان و پێی وت: بینیم تۆ كیسێكت دەدزی، ئەبێ بیگەڕێنیتەوە بۆ خاوەنەی، شەرەفی خێزانەكەمانت لەكەدار كرد، ئەگەر لەئابڕوو چوون نەترسامایە هەر ئێستاڕادەستی پۆلیسم دەكردی تا لەزیندانداا بڕزێی.

**سۆلیفەر دەپاڕایەوە تالێی خۆشبێت، جاك وتی: ئەو کیسەم پێبدە و پێم بڵێ چی تێدایە.**

**_ شەست هەزار فرەنکی تێدایە.**

**_ باشە، چاوەڕێکە تادەگەڕێمەوە، ئەڕۆم ئەیگەڕێنمەوە بۆخاوەنەکەی.**

**جاك ڕۆشت بۆلای خاوەنی کیسەکەو ڕایکێشایە دواوە و وتی: ئەمە هی تۆیە گەورەم؟**

**پیاوەکە چاوێکی لێکردوو وتی: خوایە! خۆ ئەوە خۆیەتی.**

**_ لێت دزراوە و ئەوەتا بۆتی دەگەڕێنمەوە، سەیریکە بزانە هیچی کەمە.**

**پیاوەکە دەستی کرد بەژماردنی و بینی سەلامەتە وهیچی لێ نەبراوە، وتی: چۆن گەشتۆتە دەستی تۆ گەورەم؟**

**_ وەرە لەگەڵم پێتی دەڵێم.**

**سۆلیفەر لەکونجێی دوورەوە دەیڕوانی تابزانێ چییەبێ.**

**جاك بردی بۆلای و وتی: ئەوەتا گەورەم، ئەم پیاوە دزی لێکردبووی، بەڵام ئەزانم لەخێزانێکی بەخشندەیە، پێم خۆشە لێی خۆشبی لەسەر کارەکەی.**

سۆلیفەر دەستی کرد بەپاڕانەوە و پیاوەکە وتی: لەبەر خاتری ئەم پیاوە و خێزانەکەت لێت خۆشەبم، بەڵام وریابە نەکەی لەسەر ڕێگام بت بینم ئەگینا فڕێت دەدەمە زیندان، ڕووخسارت لەبیرناکەم وریابە.ناوت چییە؟

جاك: ئۆڤید سۆلیفەر.

پیاوەکە هەرکە گوێی لەم ناوە بوو، وتی: ئۆڤید سۆلیفەر؟ دەیناسم کرێکاربوو لەکەناری ئاڵتونی، بەتۆمەتی دزی گیرابوو.

سۆلیفەر نەیدەتوانی نکوڵی لێبکات، جاك وتی: ئەوەی تۆ لەسەر ڕابردووی دەیزانی من نایزانم، تکایە لەسەر قسەی خۆت بەو خەبەری نەدەی.

_ لەسەر قسەی خۆمەبم گەورەم، سوپاسگوزاری کارەکەت وهەڵوێستتم. خۆشحاڵەبم لە نیویۆرك لەماڵەکەی خۆمدا پێشوازیت لێبکەم، لەشەقامی یانزە ژمارە ٥٦ م، ناوم ڕینیە بۆسکە، پێشتر ئەفسەری نهێنی پۆلیس بووم ودواتر وازم لەکارەکەم هێناوە.

کاتێك ئەفسەرەکە ڕۆشت؛ جاك ڕووی لە ئۆڤید کردو،وتی: نەفرەتت لێبێت کوڕە پوور، دوای ئەو هەموو ماوە هێشتا یەکترمان نەبینیوە

لەسەر شەرەف و ناوی من خەریکی کاری گەوجانەی.

_ ببورە؛ کوڕە خاڵ. پارەیە، هەژارم، بێجگە لە پلەکەم هیچی ترم نییە.

_ تەنها شەست هەزاری تیابوو، سەری خۆت بۆئەم بڕە کەمە لێکەیتەوە؟

بێدەنگی........

جاك وتی: ئەگەر بەڵێنی دڵسۆزیەکی کوێرانەم پێبدەی، پارەت بەسەرا دەڕژێنم.

_ بەڕاست!!!؟

_ بێ شك.

_ چاوەڕێی ئاماژەی تۆم، چۆن بێ فەرمانیت بکەم لەکاتێکدا تۆ لەسزای ئەم دزییە لەزیندان ڕزگارت کردم؟

_ ئەگەر بێیتە ژێر باڵی منەوە هەواڵت لەسەر نادەم؟

_ چیتەوێ لێم؟

_ لەشوێنێکی چۆڵدا نەبێ قسەم لەگەڵا نەکەی، ئەگەر لەبەردەم خەڵك بویت واخۆت بنوێنە کە

نامناسی، نامەوێت بڵێن لەخێزانی هاوبەشەکەی مۆرتیمۆر دزێك بوونی هەیە.

_ بوویت بەهاوبەشی مۆرتیمۆر؟

_ هەر زووش ئەبم بەزاوای، نەکەی تورەم بکەی ئەگینا دەرتەکەم لەکارگەکەی مۆرتیمۆر. بەڵام ئەگەر گوێڕایەڵم بیت و ڕەزامەندیم بەدەست بێنی کرێکەت بەرزەکەمەوە و ئەتکەم بەچاودێری کارگەکە و ڕەزیلیشت لێناکەم لەپارەکانم.

_ ئەزانم پێویستیت بەهاوکاری منە، لەسەر منیش نییە لێت بکۆڵمەوە، بەڵام هەرئەوەنە باخەڵم پڕبکەی ئیتر تەنها ئاماژەیەکم بۆبکە.

_ ڕێکەوتین وابێ.

جاك دەستی لەباخەڵی ناو دەستەیەك پارەی کاغەزی دەرهێنا و وتی: ئەم بڕەیە تا نیویۆرك خەرج بکە.

_ سوپاست دەکەم کوڕە خاڵ.

_ شششششش...... حەزناکەم چیتر گوێم لەو نازناوەبێت، نەکەی هەرگیز وابکەی یەکێك بزانێت کەوا پەیوەندی خزمایەتی لەنێوانماندا هەیە.

ئۆڤید بەخۆیەوت: کوڕە خاڵە ئازیزەکەم شەست هەزار فرەنکی لەباخەڵمدا گرت، بەڵام کێشە نییە مادام ئەتوانم زیاتری لێ وەکێش بکەم، بەهەرحاڵ ئەزانم نهێنیەکی مەترسیداری لەکۆشە، نهێنییەکەی ئاشکرا ئەکەم و پارەی زیاتری لێ وەکێش کەم، بێجگە لەودەرمانە ڕاستییە هیچ ڕێگەیەك نییە تا بۆم ئاشکرابێت. هەتا ئەگەمە نیویۆرك.

لەنیویۆرك خەونەکانی جاك جارۆد هاتنەدی.

دوومانگ تێنەپەڕی داوای هاوسەرگیری لەکچەکەی نایۆمی مۆرتیمۆر کرد و ڕازی بوو.

ئۆڤید ئامادەی ئاهەنگەکەیان بوو، سەیری کاغەزی کەسێتی کوڕە خاڵەکەی دەکرد و بەخۆیەوت: خوایە، تۆبڵێی هەڵە بوبێتم و ئەندێشەم کردبێت؟! بەڕاستی ئەو پیاوە کوڕە خاڵەکەمە؟

جاك هەتا دەهات پلەی سۆلیفەری بەرزدەکردەوە، هەتا وایلێهات بوبە یاریدەدەری چاودێر لەچەند مانگێکی کەم و مانگانە دووسەد دۆلاری وەردەگرت.

ڕۆژەکان بەردەوام بوون و جاك ڕابردووی لەبیرکردبوو.

لەبیـــــری نەبـــــوو کە بکـــــوژێکی ژەهـــــراوییە، ئەوناوەشـــی کەبـانگی دەکەن بەکاریهێنـاوە. پڕبـوو لەپیـــرۆزی ســـەروەت وســـەرکەوتن وزیرەکـــی . ئەوداهێنانەی کەخاوەنەکەی لەسەر کوشت.

دووربوو لەڕابردوو لەئێستا و داهاتوودا دەژیا.

هەتـــــا ئەوڕۆژەی لەڕۆژنـــــامەی فەڕەنســـــی نوســـــرابوو دادگـــای بڕیـــاری ئەبەدی، بەتـــۆمەتی دزی وســـووتان وکوشـــتن بەســـەر جـــان فـــۆرتییە ناوێك داوە.

یەك تۆســـقاڵ بەزەیـــی لەناخیـــدا نەبـــوو، ویژدانـــی بۆکارەکـانی نەجـوڵا، بەڵکـو دڵخۆشـبوو، دڵینـابوو لەدەربازبوونی بەهۆی ئەوحوکمەوە.

لەهەمـــان ئەوکـــاتەی جـــاك بەهـــۆی حـــوکمەکەوە لەخۆشـــیدا دەفـــڕی، جـــانی بێچـــارە بەهـــۆی حـــــوکمەکەوە تووشـــــی تـــــایەکی زۆر بـــــوو و دەیناڵاند.

جـان لەحـاڵەتێکی زۆر مەترسـیداردا گـوازرایەوە بۆخەستەخانە، کاتێ چاکبوەوە شێت بوو.

هیچـی لەڕابردوویـدا بیرنەبـوو، پەردەیەکـی تـر بەسەر بیریدا درا بەڵام جیاواز لەوەی جاك.

شێتبونەکەی ئارام بوو تووشی هیچ بەرکەوتنێک نەبوو، دکتۆرەکان دڵنیایان کردەوە ڕۆژێک لەڕۆژان چاکەبێتەوە.

جۆرجی بچووک لەژێر سێبەری باوکە لۆژێ دەژیا، خوشکە کلاریس وەکو کوڕی هەڵیگرتبووەوە و نازناوی بنەماڵەکەی خۆشی پێدابوو. ناوەکەی ببوو بە جۆرج دارییە.

بەم شێوەیە پەردە لەسەر ڕابردوویەکی دووردرا، هیچ شتێك لەیاد نەمابوو.

بکوژە ژەهراوییەکە لە ئێستادا ئەژی و ڕابردووی لەبیرکردبوو، تۆمەتبارە بێتاوانەکە شێت بووە و سزاکەی و منداڵەکانیشی لەبیرکردبوو، کوڕەکەشی ئەوناوەی بەدایکیەوە دەیبەستەوە لێی کراوەتەوە بووە بەبونەوەرێکی نوێ.

ئەگەر ئەوانیش زیندووبن ڕابردوو مرد.

_ ١٣ _

دوای تێپەڕبوونی ساڵێك جاك ئۆڤیدی کوڕە پوری بانگکردوو پێی وت: سبەینێ

**بــۆجێبەجێکردنی ڕێکەوتنێکـــی گەورە گەشـــتەکەم حەزدەکەم تـــۆش وەك چـــاودێری گشـــتی هـــاوەڵێم بکەی.**

**یەکەم کـــار کەســـۆلیفەر ئامادەکـــاری بـــۆدەکرد لەم گەشـــتە کڕینـــی دەرمـــانی ڕاســـتی بـــوو لەلای شوشلینۆ.**

**ئەیویســـت ئەم هەلە بقـــۆزێتەوە تـــانهێنی جـــاك هەڵماڵێ.**

**کـــاتێ شـــەمەندەفەر لەزەوی هەڵیگـــرتن، جـــاك وتی: ئێستا پێم بڵێ؛ ڕازیت لەگوزەرانی خۆت؟**

**_ هەمـــوو ڕەزامەنـــدییەك؛ تەنهـــا ڕقـــم لەو پەیوەنـــدییە خزمەیەتیەمـــانە کەناچـــارین بیشارینەوە.**

**_ ئەەەە، ئۆڤیـــد ئەوکـــارێکە هـــیچ قوتـــاربونێکی بۆنییەو ئەبێ وریابین.**

**_ ئەی چـــی واتلێـــدەکات نهێنـــی ســـەروەتەکەت بشـــاریتەوە، بـــێجگە لەوپـــلەیەی پێـــت بەخشـــیوم هیچی ترم نییە؟**

**_ ئەوداهێنانە پارەی زۆری بۆهێنام.**

**_ چ داهێنانێك؟**

**_ مافی ئەم داهێنانە تەنها بەمن فرۆشراوە.**

سۆلیفەر بێدەنگ بوو زانی یەك پرسیاری ترو پۆڵ گومانی لێکات.

جاك بۆئەوەی بابەتەکە بگۆڕێت، وتی: شەوەکانی نیویۆرکت چۆن بەڕێدەکەی؟

_ لەسەر مێزی قومار.

_ اەەەە، کەواتە تۆ قومارچیت! وریابە ئەگینا بەرەو لەناوچونت ئەبات.

_ هەموو پارەکانم لەسەر مێزی سەوز دادەنێم؛ لەهەمان کاتدا هیوادارم قازانجێکی باشیشم دەسکەوێت.

_ فێڵبازانەیە، ئامۆژگاریت دەکەم وازی لێبێنیت.

لەکۆتایدا لەهۆتێلێك مانەوە و نانی ئێوارەیان لەژورێکی تایبەت خوارد.

خزمەتکارەکە قاوەی بۆبردن، ئۆڤید کاری تێکردنەکەی لەئەستۆگرت، هەلەکەی قۆستەوە و چەند دڵۆپێکی لەڕەچەتەی ڕاستی تێکرد.

جاك جارۆد بێ ئەوەی هیچ بزانێت هەڵی قوڕاند.

دوای کەمێك ئاسوودەیی خۆی وەرگرت و وتی: هەست بەماندووبون و سەرئێشەدەکەم.

شڵەژان وشپرزەیی پێوە دیاربوو.

سۆلیفەر گەشایەوە وزانی کەڕەچەتەکەی دەستی کردووە بەکارکردن.

جاك وتی: قومێك شەرابم پێدەدەی.

سۆلیفەر پەرداخ لەدوای پەرداخ پێی دەدا.

لەپڕ جاك دەستی کرد بەپێکەنین و هیلاك هیلاك وەکو شێت.

ئۆڤید دەستی کرد بەقسەکردن لەگەڵیدا: گوێبگرە پۆڵ هرمان!

جاك جارێکی دیکە بەقوڵی پێکەنی و وتی: پۆڵ هرمان؟ پێت وابوو ئەوە ناوی منە شێت؟

بەردەوام بوو لەقسەکردن.

نهێنییەکە ئاشکرابوو، پەردەکان بەرزبونەوە، پەردە لەدوای پەردە هەڵدەدرایەوە هەتا هیچ شتێکی شاراوە لەسەر جاك نەما.

سۆلیفەر بەسەرسامیەوە بەردەوام بوو لەگوێگرتن.

لەکۆتایدا جاك جارۆد لەقسەکانی بویەوە و دەمی داخست و خەوی لێکەوت، ئۆڤید زەردەخەنەیەکی کرد لەجێگەی خۆی و دواتر هەستا ولەسەر جێگەی نا.

سـۆلیفەر بەخـۆیەوت: ئێسـتا نهێنـیەکەیم زانـی! هەروەك پێشبینی سەرەتام دەرچوو؛ تەڵەکەبازە.

سـبەی بەبـێ ئەوەی هیچـی بیربێـت هەڵدەسـتێت، وام لەکەنەدیـیەکە بیسـت کـاتێ لەگەڵ دکتـۆر قسەی دەکرد.

سـۆلیفەر بزەیەکـی شـەیتانی کـردو وتـی: ئەو بـێ ئەقـڵە وایزانـی مـن لەچنگـی ئەوم دەئێسـتا ببیـنە کێ لە چنگی کێیە.

ئەگەر هەژار بـوبێتم پێچـوو پەنـای تیـانیە ئێسـتا لەسـایەی کـوڕە خـاڵەوە ئەبـمە یەکێـك لەگەورەتـرین دەوڵەمەنـدەکان، سـەروەتی کـوڕە خاڵە ئازیزەکەم هەڵئەلوشم.

بەیـانی ڕۆژی دواتـر جـاك بەسەرئێشـەیەکی تونـدەوە هەسـتا و ڕووی لەهـاوڕێکەی کـرد و وتـی: تـۆبڵێی چـیم بێـت!؟ هەسـت بەئـازارێکی زۆرەکەم.

_ دوێنـێ شـەو تووشـی جەڵتەیەکـی لەناکـاو بوویت و وەك شێتت لێهات و وڕێنەت دەکرد.

_ وڕێنەم دەکرد! چیم وت؟

_ هیچ، وڕێنەی گاڵتەجاڕانە.

دوای دوو ڕۆژ بـــۆ ئەو ڕێکەوتـــنەی بـــۆی هاتبوون گەڕانەوە بۆ نیویۆرك.

دانیشـــتن و دانەنیشـــتن ئۆڤید نـــامەیەکی ڕەوانەی ئەوخەسـتاخانەی کە پـۆڵ هرمـانی خـاڵۆزای گیـانی سپاردبوو نارد تاڕاستی هەواڵەکە بزانێت.

دوای مانگێـــك وەجوابیـــان کـــرد و وێنەیەکـــی وەفتانـــامەکەش کەمردنـــی پـــۆڵ هرمـــانی دەسەلەماند ناردیان بۆی.

لێوەکـانی ئۆڤیـد پێکەنینێکـی تـۆقێنەری ڤێزەونیـان لەســـەر ڕووخســـاری دروســـتکرد، بەخـــۆی وت: دوا ئەوەی لەچنگـــی جـــاك بـــووم ئێســـتا مـــیلەکە گۆڕاوە و ئەو لەچنگی منە.

# _ ١٤ _

یـانزە سـاڵ بەسـەر ڕووداوەکانـدا تێـپەڕی لەمـانگی تشـــرینی دووەم/ نـــۆڤەمبەری ســـاڵی ١٨٧٠ مەیتێـك بەشـەقامەکانی شـینری دەبـردرا، لەژێـر دارە مەیـتەکە سـێ کەسـی لێبـوو بـاوکە لـۆژێ و وێنەگـــرە هـــاوڕێکەی و هەرزەکـــارێکی چـــواردە ساڵان.

هەرزەکـــارەکە بـــێجگە لەکـــوڕەکەی جـــان فـــۆرتییە کەســـی ترنەبـــوو، ئێســـتا نـــاوی جـــۆرج داریـــیەیە کە کلاریسی خوشکی قەشە لەخۆی گرتبوو.

کۆچکردوو کلاریسی دڵپاك بوو.

لەپـــڕ مـــردن لەســـەر جـــێگە یەخەی گرتبـــوو، جـــۆرجی کـــوڕی بەپەلە لەپـــاریس گەڕابـــویەوە تاوەکو فریای ماڵئاوایی کردن بکەوێت.

کاتێـــــك گەڕانەوە مـــــاڵەوە قەشـــــەکە لەگەڵ هـــاوڕێکەی دەدوا: خوشـــکەکەم وەســـیەتی کـــردووە هەرچی سەروەت سامانی هەیە بۆجۆرج بێت.

_ باشە، کردم.

_ منـــیش وەســـیەتێکم هەیە، ئەمەوێـــت بیگەیەنـــی لەگەڵ وەســـیەتەکەی منـــدا؛ وئەمەوێـــت ئاگـــات لەجۆرج بێت، ڕازیت؟

_ بەوپەڕی ئاســـــــــــوودەییەوە، هەمـــــــــــوو خۆشەویستیەکی خۆمی پێدەدەم هەروەك ئەو.

_ ســـوپاس، نـــامەیەکی بـــۆ دەنوســـم ســـەبارەت بەدایکـــی و ڕاســـتییەکان؛ بەڵام بەڵێـــنم پێبـــدە هەتـــا نەبێتە بیست وپێنج ساڵ پێی نەدەی؟

قەشـــەکە دوونـــامەی دابە ئـــاتینی وێنەگـــر یەکێکیان ڕاستی لەدایکبوونەکەی بوو.

چەند هەفتەیەکی کەم تێنەپەڕی و قەشەکەش گەشتەوە بە خوشکەکەی، جۆرج لەژێر چاودێری ئاتین کاستڵی وێنەگر بوو.

هەمان ئەوهەفتەی باوکە لۆژێ مرد، ژنەکەی جاك جارۆدیش مرد.

جاك ژنەکەی زۆر خۆشەویست بە مردنی خەمباربوو و دڵی پارچە پارچەبوو، بەڵام ئەوی لە کچەکەی دەدۆزییەوە کە بۆی بەجێهێشتبوو هەموو شتێکی بوو دەیپەرست.

سۆلیفەر هێشتا لە بەلەمەکەی جاك مەلەی دەکرد، هەرکات پێویستی بەپارە بوایە داوای لەجاك دەکرد و پێی دەدا بێ ئەوەی لەهۆکارەکەی بپرسێ.

هەرلەبەرئەوەش سۆلیفەر جارێ پێویستی بەوەنەبوو کە نهێنییەکە ئاشکرابکات، جاك هێشتا بێ خەبەربوو لەوەی سۆلیفەر پێی زانیوە.

جۆرج دارییە لە قوتابخانەی هنری چوارەم هاوڕێیەکی بەناوی لوسیان ناسیبوو.

لوسیان تاقە کوڕەکەی بەڕێز لابرۆی خاوەن کارگەبوو کە بە حساب جان فۆرتییە لەناوی بردووە.

بەم شێوەیە بۆ ئەوەی یەکدی بناسن هاوڕێیەتی لەنێوان بکوژی بێتاوان وکوژراو دروست ببوو.

ڕقی دایکی جۆرج باوکی لوسیانی کوشتبوو، بەڵام هاوڕێیەتی لەنێوان کوڕەکان پەیدابببوو، کەسیان نهێنی ئەوی دیکەیان نەدەزانی.

لوسیان لەپورییەوە چیرۆکی مردنی باوکی بیستبوو، دەیزانی دادوەر حوکمی بەسەر جان فۆرتییە ناوێك داوە.

بەڵام هەروەك پوری بڕوایەکی کوێرانەی هەبوو کەوا جان فۆرتییە بێتاوانە و ئەوچەپەڵ ناوە جاك جارۆد تاوانبارە، باوکی کوشتووە تاداهێنانەکانی بدزێت.

ئێستا بابگەڕێینەوە بۆلای جان فۆرتییە.

لەشێتخانە کەوتبوو، هەروەك وتمان تووشی نەخۆشییەك بوە و هیچی لە ڕابردوو بیرنەماوە.

لەماوەی ئەم ساڵە کاولبووەدە؛ ساڵی ١٨٧٠، سوپای ئەڵمانی هێرشی هێنایە سەر پاریس وسێ بۆمبی خستە خوارەوە یەکێك لەوبۆمبانە بۆ بەدبەختی لەشێتخانەکەی دا و وێرانی کرد ئاگریش لە باڵێکی بەربوو.

جان لەخەستەخانەکەی دەڕوانی کەواچۆن ئاگر والەناوی دەبات.

لەپــــڕ پەردە لەســــــەر چـــاوی هەڵمـــاڵڕا، پەردەی ڕابردوو هەڵماڵڕا.

ئەوئـــاگرەی کەوتەوە یـــاد کە کـــارگەکەی بەڕێـــز لابردۆی لەناوبردبوو.

بیرەوەری بۆگەڕایەوە و لەشێتی قوتاری بوو.

بەیـانی ڕۆژی دواتــر دکتــۆر ســەردانی کــرد، بەڵام چ ســـــەردانیەك وەکـــو جارەکـــانی پێشـــترنەبوو جیـاوازبوو سەرسـامبوو بەوەی کەبینــی. جـان لێـی پرســـی: گەورەم ئەزانـــم تـــۆ دکتـــۆری، لێـــرە لەخەســـــتەخانەم، بیریشـــمە حـــوکمی ئەبەدیـــم بـــــۆبڕاوەتەوە بەتـــــۆمەتی دزی و کوشـــــتن و ســـوتاندنی کـــارگەکەی بەڕێـــز لابـــرۆی بێچـــارە. ئەمە چ خەستەخانەیەکە؟

_ شێتخانەیە.

_ کەواتە شـــێت بـــووم! واهەســـــتەکەم ئێســـــتا باشبووم و شیفام بۆ هاتووە.

_ هەرواش دەرەکەوێ بـــۆ منـــیش، تووشـــــی لەبیرچـوونەوە بوویـت ئەوەتـا ئێسـتا ئەبیـنم بیـرت بۆگەڕاوەتەوە.

_ چەنێکە لێرەم؟

_ لەسـاڵی ١٨٦٢ ەوە لێرەی ئـێمەش ئێستا لەساڵی ١٨٧٠ دا داین.

جان لەبارەی هەموو شتێکەوە لێی دەپرسی، بۆی دەرکەوت بەدرێژایی ئەم نۆساڵە کەس تەنیا بۆجارێکیش بوبێت لێی نەپرسیوەتەوە.

جان هەرگوێی لەم وشە ڕەقانە بوو بەقووڵی دەستی کرد بەگریان و وتی: خوایە، کوڕێکم هەبوو بەناوی جۆرج و کچێکیش بەناوی لوسی.... چیان لێهاتووە؟ چۆن کەسیان لێمیان نەپرسیوەتەوە؟

کاتێ هێوربوویەوە بە دکتۆرەکەی وت: جەنابی دکتۆر ئێستا چاکبومەتەوە چارەنووسم چیلێدێت؟

_ دووبارە ئەگەڕێندرێیتەوە بۆزیندان.

جارێکی تر دووبارە دەستی کردەوە بەگریان، وتی: خوایە، بەمشێوەیە ئەبێ ئەوتەمەنەی ماومە لە زیندان بم و منداڵەکانم نەبینم؟

بەو خەموو ئازارانەوە دکتۆر جێیهێشت.

دوای هەفتەیەك ڕەوانەی زیندان کرا.

هەرکە جان لە زیندان جێی گەرمبوو؛ دوو نامەی ئاڕاستەی دەرەوەکرد یەکێکیان بۆ باوکە

لـــۆژێ كە جـــۆرجی لابـــوو، یەكێكیشـــیان بـــۆ ئەو بەخێوكەرەی كە لووسی لابوو.

سێ چاوەڕێی بوو تاوەڵامێكی بۆبێتەوە.

لەكۆتایـــــدا چـــــاوەڕوانی كۆتـــــایی هـــــات و وەڵام گەشت.

نـــامەی یەكەم لەگونـــدی شـــیفری ەوەبـــوو، قەشـــە نـــوێیەكە نـــاردبووی نوســـیبووی و دەڵێـــت: كەوا قەشـــەی پێشـــوو كـــۆچی دوایـــی كـــردووە و خۆشـــی خەبەرێكی نییە لەسەر ئەوەی كە دەیڵێت.

نـــامەی دووەمـــیش هەرنـــامەكەی خۆیبـــوو لەســـەری نوســـــــرابوو (( ئەم نـــــامەیە دەگەڕێنـــــــدرێتەوە بۆنێردەر چونكە نێردراو نەناسراوە)).

جـــان فـــۆرتییە لەگەڵ گەشـــتنی نامەكـــان لەهـــۆش خۆی چوو و دوای كاتژمێرێك بە ئاگاهاتەوە.

كـــاتێ بە ئاگاهـــاتەوە دەســـتی كـــرد بە بیركـــردنەوە و بەخـــۆی وت: خـــوایە! ئەبـــێ تاكۆتـــایی تەمەنـــم منـــداڵەكانم نەبیـــنم؟ ئەبـــێ لێـــرە ڕاكەم، ڕاكەم و وەدوویـــــان ئەگەڕێـــــم، زەوی تەخـــــتەكەم و وەدوویان ئەگەڕێم.

ڕۆژ تێـــپەڕی، كـــورە ســـاڵیش تێـــپەڕی هێشـــتا هـــیچ ڕێگەیەكی وەچنگ نەخست تاڕابكات.

حەوت ساڵ لەم زیندانە، بێجگە لەو یانزە ساڵەشی کە لە شێتخانەبوو.

ناڵاندنێکی بەردوام، خەمیش دڵی پارچە پارچە کردبوو، دڵی دایکێك کەدەزانێ منداڵەکانی لەسەر زەوین بەڵام نازانێ چارەنوس و گوزەرانیان چۆنە. ئاخۆ بە مردوویی ئەیانبینێ؟ بەبرسێتی؟ ئاخۆ لە ئەهلی پیاوماقوڵان و ڕێزدارانن؟ یان تۆبلێی لەزبڵدان بن و کوڕەکە دەستی کردبێت بە قۆڵبڕین و کەسێکی کوشتبێت و لەزیندان بێت؟ یان کچەکەشی وادەبینێ مروڤی گورگ دەوریان لێداوە؟!

ئەم بیرو خەیاڵانە ساڵ لەدوای ساڵ دەهاتوو دەچوو تا حەوت ساڵی ڕەبەق درێژەی کێشابوو.

لەماوەی ئەم ساڵانەدا جان بە ڕەفتار و ئەتواری باش لەقەڵەم درابوو دادوەر فەرمانی کرد بگوازرێتەوە بۆ خەستەخانە وەکو سستەرکاری پێبکرێت و موچەی مانگانەشی وەردەگرت. ئەوئازادییەی بەدرێژایی ساڵانی ڕابردوو لێی زەوت کرابوو ئێستا بۆی دەستەبەرکرابوو. ساڵێکی نەگوزەراند کردیان بەسەرپەرشتیاری سستەرەکان.

سێ ساڵی لەخەستەخانە تێ پەڕاند، بەحوکمی کارەکەی دەرمانی دەبرد بۆدکتۆرەکان لەنۆڕینە لەکاتی سەردانی نەخۆشەکان.

لەیەکێك لەڕۆژەکان هەلی قۆستەوە و شوشەیەکی دەرمانی خەوی دزی و لەسنگی شاردییەوە وتالەکاتی پێویست بەکاری بێنێت.

لەکۆتایدا ساتی ڕاکردن هات.

یەکێك لەقەشەکان لەگەڵ جان فۆرتییە بوو هەرکە ئێوارە داهات دەرمانەکەی لەخواردنەکەی کرد.

ئێوارەی ڕۆژی شەمە بوو خوشکەکانیش وەك هەمیشە بەیانی یەکەشەمان دەڕۆشتن بەرەو کڵێسا.

بەیانیەکەی جان هەستا و بینی خوشکە قەشە پرخەی دێت دەیزانی دەرمانەکەیە ئاوای هێشتۆتەوە.

جان بەخێرایی ڕۆشت بۆلای سەرۆکی قەشەکان و وتی: خوشکە قەشە سەرقاڵە بەپێدانی دەرمان بەیەکێك لە نەخۆشەکان داوات لێدەکات تۆپێش ئەو بڕۆیت ئەویش تۆزێکی دیکە دێتە خزمەتتان.

_ باشە لەبەردەرگا ئەبم.

هەرئەوەبوو کە جان دەیویست.

خوشـــکە قەشـــەکان هێشـــتا نەڕۆشـــتبوون جـــان بەخێرایـــی جلـــی خوشـــکە قەشـــەکەی لەبەرکـــردوو ڕۆشت.

لەزینـــــــدانەکەدا کـــــڵاوەکەی لەســــــەرکردوو پاســـاوانەکە شـــکی بـــۆهیچیش نەبـــرد، وایـــدەزانی یەکـــێکە لەخوشـــکە قەشـــەکان و دەڕوات بـــۆلای ئەوان.

بەم شـێوەیە دوای بیسـت سـاڵ جـان بـۆیەکەم جـار زیندانی جێهێشت و بۆنی ئازادی کرد.

زەوی داکوتـــــــــابوو لەتـــــــــاوگەڕانی بەدوای منداڵەکانیدا.

_ ١٥_

بائێستا بگەڕێینەوە دواوە.

چوارمانـــگ پـــێش ئێســـتا جـــاك جـــارۆد لەگەڵ کچەکەی و کوڕە پورەکەی دانیشتبوو دەدوا.

مـــــاری کچـــــی ببـــــوو بەهەژدە ســـــاڵ، بەڵام جەســـــتەیەکی لاواز و تەندروســـــتیەکی خراپـــــی

هەبـوو، دكتۆرەكـان بۆيـان دەركەوتبـوو كە سـيلی هەيە و لەقۆناغێكی خراپدايە.

لەپـڕ مـاری ئـاوڕی دايەوە بەرەو لای بـاوكی، و وتی: باوكە، سەروەتەكەت چەندە؟

بە شڵەژاوييەوە لێی ڕوانی و بێدەنگ بوو.

وەڵامـی دايەوە وتـی: داهـاتی سـاڵانەم سـەت هەزار دۆلارە.

_ كەواتە ئەتوانيـت سـەروەتەكەت بە دەمليـۆن دۆلار بخەملێنيت بێجگە لەم كارگەيە؟

بەئەرێنـی سـەری لەقانـد، مـاری وتـی: نرخـی ئەم كارگەيە چەندە؟

_ مليۆنێك دۆلار.

_ كەواتە ئەبێ بەم نرخە بيفرۆشی.

بەسەرسـاميەوە هـاواری كـرد: ئەتەوێ كـارگەكەم بفرۆشم؟

_ بەڵێ.

_ بەڵام........

_ نـاڕازيی دەرمەبـڕە، تـۆ زۆر دەوڵەمەنـدی، چيتـر پێويسـتت بەكـاركردن نيـيە، بـۆچی ئەم

کـــــارگەیە نافرۆشـــــیت و ئەوتەمەنەی ماومـــــانە لەفەڕەنسا نەیبەینە سەر؟!

جاك وئۆڤید نیگای شپرزەییان دەگۆڕییەوە.

مـــاری: حەزم لە فەڕەنســـایە، ئەمەوێ لێـــی بـــژیم وبمرم.

_ بەس باسی مردن بکە کچەکەم؟

دەیزانـــی کـــچەکەی ســـیلی هەیە، ژیانیشـــی چەنـــد ســـــالێکە، هەر نیشـــــانەیەکی مەرگ دڵـــــــی دادەخورپاند و بەخەم لەت لەت دەبوو.

بەپێکەنیـــنەوە مـــاری وتـــی: خۆنـــاڵێم بـــڕۆم ولەوێ بمـــرم، بەڵام حەزەکەم نیشـــتیمانەکەم ببیـــنم، دوای ئەوەش ئەم شارە بێزارم دەکا.

_ ئەی بـــۆچی دوو بـــۆ ســـێ مانـــگ لەوێ نەبـــین و دواتر بگەڕێینەوە؟

بەڵام ســـووربوو لەســـــەر قســـەکانی و پێـــداگربوو، ئۆڤیدیشـــی تـــێکەڵ بە قســـەکانی کـــرد، هیچـــی بـــۆ نەمایەوە جگە لەوەی کچە پەڵمەگریان بوو.

جـــاك دەیزانـــی هەر فرمێســـکێك دەیڕێژێـــت یەکســـانە بە تەمەنـــــی کـــــچە نـــــازدارەکەی دەیزانـــــــی تـــوڕەییەکەی لەوەیە سەربکێشـــێ بـــۆ مـــردن و تەندروستی بەرەو لەناوچوونی ببات.

وتــی: باشــه کــچەکەم خــۆزگەکەت بەدی دەهێــنم، کــارگەکەم ئەفرۆشــم و دەڕۆیــن بۆفەڕەنســا، لەوێ کــارگەیەك دروســت دەکەم خــۆتەزانی نــاتوانم بــێ کار بژیم.

کــچەکە ئــاوڕی دایەوە بەرەو لای ئۆڤیــد و وتــی: وەتۆ سۆلیفەر، ناتەوێ لەگەڵمان بێیت؟

شانەکانی هەڵتەکاند و وتی: نازانم.

بەتونــدییەوە لێــی ڕوانــی و وتــی: ئەزانــم ئەتەوێــت ڕێگربیــت بەرامــبەر بــاوکم بەڵام بــێ ســوودە هەوڵەکانــت، بوونمــان لێــرە خەریــکە کۆتــایی پــێ دێت.

بەخێرایی لەهۆڵەکە دەرچوو.

ســۆلیفەر وتــی: بەڕاســتی ئەتەوێــت کــارگەکە بفرۆشیت؟

_ گومــانی تیــانیە، نــابینی تەندروســتی چەنــد خراپە.

_ ئەم سۆزەی تۆ لاوازییە.

جــاك شــانەکانی هەڵتەکانــد و وتــی: لەگەڵ ئەوەشــدا بــۆچی لێــرە بمێــنمەوە؟ لێــرە قــازانجێکی زۆرم کــردووە، ئەتــوانم لە فەڕەنســاش کــارگەیەکی لەم

شـــێوەیە دروســـت بـــکەم و قـــازانجێکی باشـــیش وەچنگ بخەم هیچ لەدەست نادەم.

بێدەنگی...

سۆلیفەر وتی: دووقسەم هەیە لەگەڵ تۆ..

_ قسەبکە.

بـــابڕۆین بـــۆ نوســـینگەکەم ئەترســـم یەکێـــك گـــوێی لێبێت.

بەڕوونـــی پەشـــۆکاوێ لەڕووخســـاری جـــاك بەدی دەکرا: ئەوەندە ترسناکە؟

_ ئەبینی.

کاتێـــك لەنوســـینگەکە بـــوون ســـۆلیفەر وتـــی: چارەنووسی من چیلێکەی دوای ڕۆشتنت؟

_ ئەتـــوانی هاوەڵیمـــان بـــکەی و بەڵێنیـــت پێـــدەدەم کارێکی نوێت بۆ بدۆزمەوە لە کارگە.

_ بەڵام فەڕەنسا بۆمن نابێت.

_ بۆ؟

_ پۆلیسی فەڕەنسی داوامەکات.

_ تـــازە بەتـــۆچی، حـــوکمەکە زۆری بەســـەرا ڕۆشتووە.

_ حەزەکەم لێرە بمێنمەوە.

_ باوابێ، ئەوکەسەی کارگەکە ئەکڕێت داوای لێکەم بەکرێیەکی باش لای خۆی بتهێڵێتەوە.

ئۆڤید پێکەنی و وتی: بەڵام ئەوەم ناوێت ئەمەوێت کارگەکەی تۆبکڕم.

جاك بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕانە وتی: وامەزانی لەهەژارانی نەمزانی لەملیۆنلەرانی.

ئۆڤید جارێکی ترپێکەنی و وتی: وەکو ئەوەی خەیاڵی دەکەی لە ملیۆنلەران نیم، هەژارێکی تەواوەتیم لەگەڵ ئەوەشدا ئەمەوێت کارگەکەت بکڕم.

_ سەیرە، واز لەم پێچووپەنایە بێنە و قسەبکە.

سۆلیفەر لەسەرخۆ وتی: کارگەکەم پێ ئەفرۆشی، دواتر چەکێکی پەنچا هەزار دۆلاریشم وەکو هەدییە پێدەدەی تاوەکو بتوانم بەڕێوەی ببەم.

_ بۆچی وابکەم؟

_ نرخی کپ کردنم؟

_ نرخی کپ کردنت؟ بۆچی پێت وایە شتێکم کردبێت و بترسم ئاشکرابێت؟

_ دڵنیایت هاوڕێ ئازیزەکەم؟

_ مەبەستت چییە؟

_ مەبەستم ئەوەیە خۆ جاك جارۆد ناتوانێ بڕوات بۆ فەڕەنسا تا دڵنیانەبێت لەوەی پۆلیسی فەڕەنسی ناوەکەی پێ نازانێت؟

جاك قوت بۆی هەستا و دەستو باڵی سۆلیفەری گرت و هاواری کرد، وتی: ئەوناوە چییە هێنات؟

_ ناوی پیاوێکە لە ئاڵفۆرتفێڵ کارگەیەکی سووتاندووە و خاوەنەکەشی کوشتووە و پارەکانی دزیوە، ئەوکەسەش تۆیت.

ترس و تۆقان جاکی وشك کردبوو بەدەنگێکی لەرزۆکەوە وتی: درۆیە...... کێ .....پ ...پ...پێی وتی؟

_ وەفتنامەی پۆڵ هرمان، وێنەیەکیم لایە.

_ درۆیە و بوختانە.

ئۆڤید بەئارامی وتی: واز لەم خۆهەڵخەڵەتاندنە بێنە هاوڕێ ئازیزەکەم، ئەتوانی بە ئەقڵێکی ساف وئارام و دڵنیابڕۆیت بۆ فەڕەنسا تا ئەو کاتەی کارگەکەم پێ ئەفرۆشی، هەمیشە تۆپیاوێکی بەڕێز و بێتاوانی و ئەو جان فۆرتێیە تاوانبارە.

بێدەنگی....

جاك وتی: هەڕەشەكانتم بەلاوە گرنگ نییە، ماوەیەكی زۆرە سزام لەسەر نەماوە.

ئۆڤید پێكەنی و وتی: ماوەیەك تێپەڕیوە، هەریەك لە تاوانی كوشتن وسوتاندن ودزیكردن وپەردەپۆشكردنی و بەكارهێنانی ناوی پۆلی هرمانیش بوەستێ هێشتا وائەڵێی؟

_ مەبەستت ئەوەیە ئەتەوێ هەواڵم لەسەر بدەی؟

_ ئەكەوێتەوە سەرخۆت، تۆپیاوێكی زۆر دەوڵەمەندی پێویستت بە پارەی تازە نییە ئیتر بۆچی كارگەكەی خۆتم پێنادەی؟ بەوشێوەیە ئابڕووی خۆت ئەكڕیت و ئارامی كچە بێچارەكەشت.

جاك بەشێوەیەكی دڕندانە وتی: سوێند دەخۆم نەفسم پێم دەڵێ هەرئێستا بتكوژم.

_ جاسوودی هەیە بۆت؟ نامەیەكم لە شوێنێكی پارێزراو داناوە. وەوەسیەتم كردووە هەتا نەمرم نامەكە نەكرێتەوە، ئەگەر بمكوژی بیست و چوار كاتژمێر تێناپەڕێت پۆلیس ئەتدۆزێتەوە و ڕاپێچت دەكەن.

جارێكی تر بێدەنگی.....

لەکۆتایا جاك وتی: باشە، ڕازیم بە مەرجەکەت.

_ ئافەرین، بەوشێوەیە ئابڕووت دەگەڕێنیتەوە.

_ سبەی دەڕۆین بۆ لای پارێزەر تا کاروباری فرۆشتنەکە تەواوبکەین.

ڕۆژی دواتر ئۆڤید بە تەواوی دەستی گرت بەسەر کارگەکە؛ یەك قڕوشیش چییە نەشیدا، تەنانەت چەکێکی پەنجا هەزار دۆلاریشی لەکوڕە خاڵە ئازیزەکەی وەرگرت.

هەفتەیەك دواتر جاك بەرەو فەرەنسا بەڕێکەوت، هێشتا پێی گەرم نەببوو زەویەکی کڕی تاکارگەیەکی لەسەر بنیاد بنێت.

جاك ڕۆشت بۆ بانك بۆلای دۆستێکی تا ئاشنای بکات بەپارێزەرێك تاکاروبارەکانی بۆبەڕێوەببات.

_ پارێزەرێکی باش ئاشنام، ناوبانگێکی باشیشی هەیە.

_ ناوی چییە؟

_ جۆرج دارییە، ژمارە ١٩ لەشەقامی بۆناپرت.

ڕۆشت تا گەنجەکە ببینێت.

ئەگەر ڕابــردووی بیربێــت بــۆ یەك و دوو دەیزانــی جــۆرج داریــیە جــۆرج فــۆرتێیە، کــوڕی ئەو ژنەی ئەبەدی بـــۆ بـــڕاوەتەوە بەهـــۆی تاوانەکـــانی ئەمەوە.

جــۆرج داریــیە هەرچەنە تەمەنــی بیســت وپێــنج ساڵ بوو بەڵام لە گەورە پارێزەرەکان بوو.

لەشـــەقامی پۆناپـــارت نووســـینگەیەکی بەکـــرێ گرتبــوو بــێجگە لەوکتێبخــانەی بــاوکە لــۆژێ پێــی دابوو، هیچی تری تیانەبوو مایەی سەرنج بێت.

لەســوچێکی ژوورەکەی ســتونێکی درێــژی لێبــوو کەلەنوکەکەیدا ئەسپێکی دارینی لێ بەدی دەکرا.

هەمــان ئەســپە منــداڵیەکەی بــوو، بەباشــی بە ڕووپۆشــێکی ڕەش داپۆشــیبوو وەك وەفــایەك بۆخوشــکە کلارێــس. بــێ خەبەر لەوەی جــان فۆرتێ دایکیەتی.

بەم شــێوەیە جــاك دوای بیســت ویەك ســاڵ چــاوی کەوت بەکــوڕی قوربــانیەکەی دەســتی، بــێ ئاگــا لەیەکتر.

جــاك ئەوەی لەنێــوان ئەو حکــومەت ڕوویــداوە لەســـەر مـــافی تێـــپەڕین لەزەوییەکەیـــدا بـــۆ پارێزەرەکەی گێڕاوە.

کاتێـك جـۆرج لە ئەوڕاقـو کاروبارەکـانی ڕوانـــی و تەواوبـــــوو، وتـــــی: گەورەم تـــــۆ ڕاســـــتەکەی، هـــــۆیەکەت بەهێـــــزە و حەتـــــمەن دۆســـــێیەکە ئەبەیتەوە.

_ تکایە بەڕێوەی ببەبۆم.

دوای مانگێـك حکـومەت ناچـاربوو پاشـگەزبێتەوە لەهەمـبەر جـاك و مـۆڵەتی دروسـتکردنی کـارگەی پێبـــدات دڵنیاشـــی کـــردەوە ئەگەر دۆســـێیەکەیان بچـــوایەتە دادگـــا بـــۆ شـــك دادگـــا لەهەمـــبەر پارێزەرەکە دەدۆڕا.

جـــاك ڕۆژانە ناچـــاربوو زۆربەی کاتەکـــانی بە چـــاودێری کردنـــی دروســـتکردنی کـــارگەوە بەسەرببات.

لەســـەر نەبـــوونی، کـــچەکەی لـــۆمەی نەدەکـــرد، هاوڕێکـــانی بـــاوکی بەخشـــندەبوون و نـــاو بەنـــاو ســـەردانیان دەکـــرد. هێشـــتا چەنـــد هەفـــتەیەك تێنەپەڕیبـوو کەشـی پـاریس تەندوسـتی تێـك دابـوو، نەیـــدەرانی نەخۆشـــی ســـیلی هەیە. هەرکـــات ڕووخســـارە تـــۆق و ترســـاوییەکەی بـــاوکی ببینـــایە پێکەنینی پێدەهات و سەیری لێدەهات.

مـــاری لەترۆپکـــی کەشـــخی و جوانیـــدابوو، بۆجلەکـــان باشـــترین بەرگـــدووری پاریســـی بەکـــرێ گرتبوو بەناوی خاتوو ئۆگستین.

لەنیــو كرێكارەكــانی كچێكــی بەرگــردووری لێبــوو بەنـــاوی لووســـی، ئۆگســـتین زۆر سەرســـامی لووســی بــوو تەنــانەت هەنــدێك جــاریش دەیبــرد تاوەكو قیاسی كرِیارەكانی بۆبكات.

لووســـی جــوان ورِەوشـــت چــاك بــوو، خەڵكــی نمـــوونەی وایـــان زۆر نەدیبـــوو، دەزگیـــرانەكەی نــاوی لوسـیان بــوو شــارەزای بــواری میكــانیكی و وێنەكێشــانی میكانیــك بــوو، بەرِێــكەوت ئاشــنای یەكدی بوون ورِێككەوتن لەسەر هاوسەرگیری

_١٦_

لووســیانی وێنەكـێش كـورِەكەی بەرِێـز لابـرۆ بـوو، ئەوپیاوەی جاك لەناوی برد.

ئـــاگرەكە ئەوەنـــدە بـــێ بەزەیـــی بـــوو هـــیچ برِەپـارەیەكی بـۆئەم كـورِە بێچـارەیە جێنەهێشـتبوو تـــاخەرجی پێـــدەركات، پـــورەكەی بەخێـــوكردنی لەئەســتۆ گرتبــوو، لەتەمەنـــی بیســتو یەكساڵیشــدا تــاكە پەنــاگەی پــورەكەی كــۆچ دەكــات و بەتەنیــا دەمێنێــتەوە، ناچــاربوو لەپێنــاو دەركردنـــی قــوتی ژیانی شارەزای لەوێنەكێشان پەیدابكات.

لەهەمـــان ئەو خـــانەی لووســـی كـــاری بەگـــردووری دەكرد لوسیانیش ژوورێكی بەكرێ گرتبوو.

ڕۆژێـــــك لەســــــەر پلیكانەكـــــان بەڕێـــــكەوت یەك دەبینن و ئاشنای یەكدی ئەبن.

هـــاوڕێیەتی هێشـــتا دروســـت نەببـــوو خۆشەویســـتی چـــاوی هەردووكیـــانی كـــوێر كردبـــوو، لووســـیان ئـــاواتەخوازبوو لووســـی ببێـــت بەخێزانـــی تـــاكە ڕێگریش لەبەردەم ئاواتەكەی پارەبوو.

ســـاڵێك تێنەپەڕیبـــوو هێشـــتا ئەو بێچـــارەیە خـــۆی كۆنەكردبـــووە وە، ئەوەشـــی قـــازانجەكرد بەشـــی نەدەكرد.

لووسـیش خێزانێكـی نەبـوو تادەسـتی هاوكـاری بـۆ درێژبكــــــات، لەیەكێــــــك لە خانەكـــــــانی بێسەرپەرشـــتانی منـــداڵان گەورەببـــوو، ڕۆژێـــك كەســـێك دێـــت و لەوێ بەجێـــی دەهێڵێـــت، منـــداڵێك بەنـــاوی لووســـــی، ئەم لووســـــییە كەواباســـــی دەكەین.

بەخێـــوكەرەكە وتبـــووی كەوا دایكـــی هەمـــوو مانگێـــك پـــارەی بـــۆ دەنـــاردن بەڵام لەپـــڕ دەنـــگ و باسێكی نەماوە و ناچاربوون وەدەری نێن.

***گومـــانی تیـــانییە ئەبـــێ خـــوێنەر درك بەوەبكـــات كەوا لووســـی كـــچەكەی جـــان فـــۆرتێیە و خوشـــكی جۆرج دارییەی پارێزەرە.***

**لووســـیان لابـــرو چـــاوی بە لوســـی كچـــی جـــان كەوتبـــــوو خۆشەویســـــتییەكی كوێرانەشـــــی بۆهەبـــوو، جـــاك جـــارۆدیش پەیوەنـــدی بە جـــۆرجی كـــوڕی جـــان كـــرد. ئێســـتا هـــیچ نەمـــاوەتەوە جـــگە لەوەی جاك لووسیانی كوڕی كوژراو ببینێ.**

**ڕۆژێـــك لووســـی لەپـــڕ خـــۆی كردبـــووە ژووەرەكەی لووســـــیان و بەڕەنگێكـــــی زەردهەڵـــــگەڕاو و پەڕیـــوەوە و چـــاوی وەكـــو چـــاڵی لێهـــاتبوو بینـــی، دەســـــتی گـــــرت و لـــــۆمەی دەكـــــرد: ئەمە چیـــــیە لووســـیان؟ ئاگـــادارم نەكـــردیتەوە خـــۆت بەكـــارەوە ماندوونەكەی؟ خەریكە خۆتەكوژی.**

**_ وێنەیە خاوەنەكانیان زوو ئەیانەوێت.**

**_ بەڵام ئەبـــێ ئاگـــاداری تەندروســـتی خۆشـــت بیـــت ئازیزەكەم.**

**_ چیـــبكەم جـــا؟ بەڕۆژ لەم شـــوێن بـــۆ ئەو شـــوێن بەدوای كـــاردا وێڵـــم هـــیچم بۆنـــامێنێتەوە جـــگە لەمانـــــدووبن، ئەوەی بـــــۆم ئەمێنێـــــتەوە ئەبـــــێ لەشەودا بیكەم.**

**بێدەنگی....**

لوسی: هاوڕێکانی قوتابخانەت دەوڵەمەندەکان، بۆناڕۆیت بۆ لایان تاکارێکت بۆ بدۆزنەوە.

زەردەخەنەیەکی پڕ لەخەم و دەردەسەری کرد، و وتی: بۆلای هەموویان ڕۆشتم بێجگە لەڕەتکردنەوە هیچی ترم دەستنەکەوت.

_ تەنانەت ئەو کوڕەشی کە بەباشە باستدەکرد بۆم؟

_ مەبەستت جۆرج دارێیە، هاوڕێکەم لەقوتابخانەی هنری چوارەم؟

_ بەڵێ، چاوت پێکەوت؟

_ نا، ناونیشانەکەی نازانم، یاسای ئەخوێند.

_ کەوایە ئێستا لەپارێزەرانە، دۆزینەوەی ئاسانە.

شانەکانی هەڵتەکاند و وتی: بەهەرحاڵ لەوانی تر باشتر نابێت.

_ چوزانی؟ زەرەناکەی بیبینی.

_ سبەینێ دەڕۆم.

لوسی لوسیانی دەزگیرانی جێهێشت و بەرەو لای خاتو ئۆگستین بەڕێکەوت، جلی نوێی بۆ دانابوو.

کاتێ وەژووورکەوت سەرسامبوو کاتێ خاتوو ئۆگستینی بینی جلەکان لەبەر کچێکی جوانی قژزەرد تاقی دەکاتەوە.

هەرزوو لووسی زانی کچێکی زۆردەوڵەمەندە، چونکە ئەگەر وانەبوایە خاتوو ئۆگستین جلەکانێ لەبەری تاقی نەدەکردەوە.

خاتوو ئۆگستین ئاوڕی دایەوە بەرەو لای لوسی و وتی: خەریکبوو بنێرم بەشوێنتا، ئەمە پۆشاکی سەمایە ئەبێ زوو دەریبکەین، خاتو ماری هرمان زۆری پەلەیە.

ماری هرمانی کچی جاك وتی: ئەم خاتوونە دوورینی پۆشاکەکانم لەئەستۆ ئەگرێت؟

_ بەڵێ، لەباشترین بەرگدوورەکان.

_ لەخانەکەی باوکم سبەینێ چاوەڕێت دەبم، ئەبێ زوو بیدووری.

کاتێ ماری وەدەرکەوت خاتوو ئۆگستین بە لوسی وت: تکایە زۆر وردبە خاتوو ماری زۆر هەستیارە بۆ پۆشاکەکانی.

لوسیان بەڵێنەکەی بردەسەر و ڕۆشت بۆخانەی دادگا و لەناونیشانی جۆرج داریەی پرسی و پێیان وت لە ژمارە نۆزدەیە لەشەقامی پۆناپارت.

بەخێرایی بۆدیدەنی بەڕێکەوت.

لەودەمەی هەوڵ و تەقەلایەی لوســــیان دەیـــــدا، جــۆرجی پــارێزەر لەنوســینگەکەی خــۆی ســەرقاڵی پێــداچوونەوەی دۆســێیەك بــوو کەئــاتینی وێنەگــر وەژووورکەوت.

جــــۆرج بەخێرهــــاتنی وێنەگــــرە بەناوبــــانگەکەی کــردوو وتــی: ئەبێــت گلەییــت لێــبکەم، دووهەفــتەیە تۆم نەبینیوە.

ســەرقاڵ بــووم بەتەواوکردنــی هەنــدێك وێــنە، خۆتــۆ ئەتتوانی سەردانم بکەی.

_ تکایە لێم مەگرە دۆسییەی زۆرم لایە.

_ لێـت نـاگرم، ئەمـڕۆ هـاتم تانـانی نێـوەڕۆ پـێکەوە بخـــۆین و لەســــەر تــــابلۆیەك بــــدوێین کەئەمەوێ بیکێشم.

_ لەسەر چییە؟

_ پـــێش بیســـتویەك ســـاڵ ڕووداوێـــك لەمـــاڵەکەی بـــاوکە لـــۆژێ لەشـــیفری ڕوویـــداوە ئەمەوێـــت لەتابلۆیەکـــدا ڕەنگـــی بـــدەمەوە، ئەســـپێکی دارت هەبـــوو لەکـــاتی ڕووداوەکە یاریـــت پێـــدەکرد ئەمەوێت تیایدا بەکاری بهێنم.

_ مەبەستت ئەم ئەسپەیە؟ یادگاری دایکمە، هەرلەبەر ئەوەشە پاراستوومە.

ئاماژەی بۆئەسپەکەی کرد کە لەنوکی ستوونەکەدا دانرابوو.

_ بەڵێ، ئەوئەسپەیە ئەمەوێ بەکاری بێنم.

_ بەڵام بابەتی تابلۆکە باسی چییەکات؟

_ چیرۆکێکی کاریگەرە دڵ پارچە پارچەدەکات، پیاوانی پۆلیس هەڵەکوتنە سەر خانەکە و ژنێکی بێچارە ڕاپێچەکەن بۆ زیندان، تابلۆکە زۆرێك لەخۆدەگرێت لەوانە پیاوانی پۆلیس و ملازم و دایکت و قەشەی خاڵۆت ومن وتۆ.

جۆرج شپرزە بوو، وتی: من؟

_ بەڵێ، چاوەکانت وەکو باران وابوون، وەکو ئەوەی فرمێسکەکانت لە پیاوانی پۆلیس بپاڕێنەوە تاوەکو ئەو ژنە نەبەن بۆ زیندان.

_ چ سەیرە هیچم بیرنییە.

_ لەبەرئەوەی سێ ساڵان بوویت، هەوڵدەبیرت بکەوێتەوە، لەباخچەکەدابوو، ئەسپەکەت بۆلای سنگت ڕاکێشابوو.

_ ئەتەوێ تابلۆکە بفرۆشی؟

_ بۆئەپرسی؟

_ لەبەرئەوەی دایکـــم و خـــاڵمی تیـــایە و وێـــنەی تۆیە ئەمەوێت.

پێکەنـــی وتـــی: دڵنیـــابە، ئەمەوێ بـــیکەمە هەدیـــیە بـــۆت، ویســـتم بـــیکەم بەســـوپرایز بـــۆت کـــاتێ تەواو بووم بەڵام ئاشکرات کردم.

پێکەنـــین و پـــارێزەرە گەنـــجەکە وتـــی: بەڵام پـــێم بڵێ چی ئەم ژنەی هەڵپێچابوو؟

_ بەدزین و کوشتن و سوتان تۆمەتبارکرابوو.

_ چارەنووسی چی بەسەرهات؟

_ زیندانی ئەبەدی.

_ یانی تۆمەتەکان سەلمێنران؟

_ بێگومان بەڵگەکان زۆر بەهێزبوون.

_ ناوی چیبوو؟

_ لەبیرم نییە.

لەم ســـــــاتەدابوو خزمەتکـــــــــارەکە وەژوورکەوت وگەورەکەی ئاگـــادارکردەوە کەوا گەنجێـــک بەنـــاوی لوسیان لابڕۆ داوای دیدەنی دەکا.

جـــۆرج داریـــیە ورتەیەکـــی کـــردوو وتـــی: هـــاوڕێی قوتابخانەمە، پێنج ساڵە یەکمان نەبینیوە.

_ لابــــرۆ؟ واهەســـــتەکەم پێشــــتر ئەو نـــــاوەم بیستووه.

پـــــاش کەمێـــــك میوانەکەیـــــان وەژوورکەوت و بەگەرمـــی تەوقەیـــان کـــرد و پـــارێزەرەکە بەئـــاتینی ناساند. باسی سەردەمی قوتابخانەیان دەکرد.

جـــۆرج وتـــی: خەریکـــی میکـــانیکی بویـــت ئێســـتا حاڵـــت چـــۆنە؟ هیـــوادارم بەڕێـــوبەری یەکێـــك لەکارگەکان بیت.

لوســیان ســەری لەقانــد و وتــی: لەڕاســتیدا بەخــت یاوەرم نەبوو.

_ چۆن؟ تۆ لەبواری خۆتدا زۆرباشبوویت.

_ بەڵام باشـــییەکەم هیچـــی بۆنەهێنـــام ناچـــاربووم شـــارەزایی لەوێنەکێشـــاندا پەیـــدابکەم و خـــۆمی پـــێ بژێنم.

_ ئەبـــوایە پێشـــــتر بهاتیتـــــایە لام تـــــاوەکو لای هاوڕێیـــــانی کـــــارگەم کارێکـــــت بۆپەیـــــدابکەم. ئەتەوێ یەکێـــــك لەکارگەکـــــانی دروســـــتکردنی کەرەستەی ئاسنین بەڕێوەببەی؟

_ خۆزگە.

_ زۆرباشـــە، یەکێـــك لەبریکـــارە فەرەنســـییەکانم بۆمـــــاوەیەکی زۆر لەئەمریکـــا ژیـــاوە لەم دوایەدا

هاتۆتەوە و ئەیەوێت کارگەیەك دروست بکات. پێم وابێت داواکەم ڕەتناکاتەوە. ناوی پۆڵ هرمانە.

_ پۆڵ هرمانی هاوبەشی نایۆمی مۆرتیمۆر؟

_ خۆیەتی. دەیناسی؟

_ نا، بەڵام بۆخۆی ناوبانگێکی هەیە، داهێنەری مەکینەی خەیاتی بێدەنگە لەگەڵ ئامێری سافکردنی تازە لەهەمان ئەو ئامێرەی باوکم دەچوو کەپێش مردنی بەپورمی وتبوو ئەیەوێت دروستی بکات.

ئاتیین: باوکت لەداهێنەران بوو؟ تۆ کوڕی لابرۆی کەپێش زیاتر لەبیست ساڵ کارگەکەی سوتا؟

_ بەتەواوی وایە گەورەم، باوکم لەکاتی ئاگرکەوتنەوەکە کوژرا.

جۆرج بەپەشۆکاویەوە پرسی: سەیرە، پێشتر باسی ئەم کەلێنەت بۆ نەکردبووم.

_ لەبەرئەوەی نەمەزانی هەتاپورم مرد، بەڵام گەورەم پێم بڵێ تۆهاوڕێی باوکم بویت؟

_ نا، نەمدەناسی، بەڵام گوێم لەخەڵك بوو ناویان دەهێنا و باسیان دەکرد بۆیە لەبیرم ماوە.

دواتــر لەدڵــی خۆیــدا وتــی: چ ڕێکەوتــێکە، کــوڕی بکوژ هاوڕێی کوڕی کوژراوە.

جۆرج پرسی: بکوژەکە دەسگیرکرا؟

_ ئافرەتێـــك بەم تـــاوانە تۆمەتبـــارکرا و ئەبەدی بۆبڕایەوە.

_ ئافرەتێك؟

_ بەڵـــــێ، بەهـــــۆی ڕووداوەکە ڕایکردبـــــوو لەکڵێســـایەك خـــۆی حەشـــاردابوو لەگونـــدی شـــیفری بەڵام پۆلیسەکان قۆڵبەستیان کردوو بردیان.

جـــۆرج بەتێبڕینێکـــــی پـــڕ لەڕوونکـــــردنەوەوە لەئـــاتیینی ڕوانـــی و وتـــی: بەڵـــێ، ئەوەهەمـــان ئـــافرەتە کەتۆباســـت کـــردوو ئەتەوێ تـــابلۆیەکی لەسەر بکێشی.

_ تۆئافرەتەکەت بینیوە گەورەم؟

_ قسەشم لەگەڵدا کرد.

_ تۆبڵێی دانی بەتاوانەکەیدا نابێ؟

_ بەڵکـــو بەپێـــداگرییەوە نکـــۆڵی لێـــدەکرد، بەڵام نکۆڵییەکەی هیچ سوودی نەبوو.

لوســـیان: حـــوکمەکە بەڵگەنیـــیە لەســـەر دروســـتی تۆمەتەکە بەهەڵە حوکم درا.

_ بەڵام بەڵگەکان تەواوبوو.

_ لەوەیە ڕێکەوت بوبێت، مادام تۆ لەناو دۆسییەکەبویت ڕات چییە لەسەری؟

ئاتیین بێدەنگ بوو دواتر وتی: لەوەیە تاوانبار بوبێت.

لوسیان وتی: لەوەیە، تۆ وەکو دادوەر دڵنیابیت، بەڵام من دڵنیام لەبێتاوانی ئەو ژنە، لەوڕۆژنامەی کەپورم پاراستبوی ووردەکارییەکانیم خوێندەوە، تەواو دڵنیابووم لەبێتاوانی جان فۆرتێیە لەوتۆمەتانەی کەئاراستەی کرابوو، پوریشم هەمان ڕای هەبوو.

جۆرج پرسی: بەچی بەرگری لەخۆی کرد؟

_ چاودێری کارگەکەی تۆمەتبارکرد، ناوی جاك جارۆدە. دڵنیای کردەوە کەوا نامەیەکی خۆشەویستی بۆناردووە داوای لێکردووە لەگەڵیدا لەفەڕەنسا هەڵبێن، بەڵام نەیتوانی ئەونامەیە بدات بەدادگا.

ئاتیین: ئەوەت لەبیرچوو جاك بەکەرامەت و شەڕەف و بوێرییەوە مرد؟

لوسیان بەپێداگرییەوە وتی: دڵنیام ئەو بکوژەکەیە، مردنەکەشی تەنها خۆڵ کردنە

چاوی خەڵکی بوو، ئارامم نابم تائەوژنە بێچارەیە لەزیندان ڕزگارنەکەم.

_ سەلماندنی تاوانەکە لەسەر جاك جارۆد چ سوودی هەیە لەکاتێکدا دادگایکردنەکە کاتی بەسەرا ڕۆشتووە؟

لوسیان بەکاردانەوەوە وتی: ئەزانم چۆن تۆڵەی خۆم بکەمەوە.

_ تۆبڵێی هێشتا لەزیندان بێت؟

_ هەرئەوەیە کەنایزانم،،بەڵام ڕوونییەکەمەوە.

جۆرج: وەکو پارێزەرێك دۆسییەکە لەئەستۆ ئەگرم.

باسی هاوسەرگیریان کرد لوسیان وتی: دەزگیراندارم ناوی لوسییە ئەگەر هەژاری نەبوایە دەمێك بوو هاوسەرگیریمان کردبوو.

_ کێیە ئەم خاتوونە؟

_ کچێکی بێنازە لەیەکێك لە خانەکانی بێسەرپەرشتانی منداڵان گەورەبووە، ناوی خێزانەکەی نازانێت. لەکچە میهرەبانەکانە.

_ وادیارە خۆشتەوێ؟

_ خۆشەویستییەکی شێتانە؟

_ هیـــــــــــــوادارم زۆر زوو پیرۆزبـــــــــــــایی هاوسەرگیرییەکەت لێبکەم.

لووســـــی چـــــاوەڕێی گەڕانەوەی دەزگیــــرانەکەی بوو. کاتێ گەڕایەوە وتی: چیت کرد؟

_ بەباشـــــی پێشـــوازی لێکـــــردم، بەڵێنـــــی پێـــدام یارمەتیم بدات.

بـــــۆی گێـــــڕایەوە چـــــی لەنێـــــوان ئەو وهـــــاوڕێ کۆنەکەی ڕوویداوە.

_ اەەەە، بـــڕوام بەخەونەکـــان کـــرد، اەەەەە، ئەگەر بڕوات دەکرد.

بەیـــانی ڕۆژی دواتـــر جـــۆرج داریـــیە بەمەبەســـتی بـــابەتەکەی لوســـیان ڕوی لەمـــاڵەکەی جـــاك جـــارۆد کرد.

خـــاوەن مـــاڵ لەوێ نەبـــوو، پێیـــان وت لەگەشـــتە و تادوو سێ ڕۆژ تەشریفیان ناگەڕێتەوە.

ئەم نەبـــونیە وای لەجـــۆرج کـــرد بیرلەوەبکـــاتەوە ئـــــاخۆ ئەتـــوانێ ئەو چـــــاکەیە لەگەڵ هـــــاوڕێکەی خـــۆی بکـــات. بەڵام ئەیزانـــــی قســـەی مـــاری لای بـــــاوکی ڕەتنەکــــراوەیە، بەخـــۆی وت: بـــۆچی داوا لەونەکەم.

هەرزوو داوای بینینی کرد.

پێشــوازی لێکــردو و وتــیً: تەندروســتیت چــۆنە خانمەکەم؟

_ تەندروستیم باشە.

لەپــڕ کــۆکە کــۆك قســەکانی بــڕی و وتــی: ئەگەر ئەم کۆکەیە نەبێت زۆر باشم.

جــۆرج دەیزانــی کەوا ســیلی هەیە و مــاری نــازانیً وتی: دکتۆرەکان ...... ئەوان چییەڵێن؟

بەتەنــزەوە پێکەنــی وتــی: دکتۆرەکــان، نەفرەتیــان لێبێــت، گیــانم دەرچــوو بەدەســت دەرمانەکانیــانەوە، تەنهــا کــۆکەیەکی ئینتیهابــاتی قــوڕگە کەچــی دەیــان دەرمانم بۆدەنوسن.

ڕێچــــکەی قســــەکانی گــــۆڕی و وتــــی: وابــــزانم هاتبووی بۆدیدەنی باوکم؟

لەپاریســە تــادوو ســێ هەفــتەی دیــکە نــاگەڕێتەوە، سەرەتای مانگی داهاتوو دەگەڕێتەوە.

_ کەوایە ئەتــــوانم لەکــــارگە نــــوێیەکەی باوکــــت داوای دامەزرانــــدنی هــــاوڕێییەکی قوتابخــــانەم بــــکەم؟ گەنجێکــــی لێهاتووشــــە لەهەمــــان کاتــــدا. جــۆرج ئەمەشــی بۆقســەکانی زیــادکرد، دەرچــووی قوتابخانەی هونەری پیشەسازییە.

_ هاوڕێیەکی ئازیزتە؟

_ بەڵێ خانمەکەم، لەقوتابخانە یەکدیمان دەناسی، کاتێ منداڵ بووە دزی لەباوکی کراوە و کوژراوە و پوری ئەرکی چاودێریکردنی لەئەستۆگرتووە، بەبێ کارێکی مسۆگەر ناتوانێ بژی.

بەوپەڕی سنگ فراوانیەوە وتی: گەورەم دڵخۆشەبم دەستی هاوکاریت بۆدرێژبکەم، هاوڕێکەت دڵنیا بکەرەوە باوکم داوای من فەرامۆش ناکات، لەبەرئەوەی باوکم سێیەم ڕۆژی مانگی داهاتوو دەگەڕێتەوە بادووەم ڕۆژ شەرەفمەندمان بکات بەهاتنی.

جۆرج سوپاسی کردو و ڕۆشت. نامەی بۆلوسیانی هاوڕێی نووسی.

_ ١٧ _

بەم شێوەیە چارەنووس ئەوکەسانەی دوور و نزیك پەیوەندیان بەکارگەکەی بەڕێز لابرۆوە بوو کۆکردەوە.

تەنیا جان فۆرتێیەیان کەم بوو.

جان بەجلی خوشکە قەشەکانەوە لەزیندان هەڵهاتبوو، بەخێرایی بەرەو دووکان ڕۆشت تاجلەکانی بفرۆشێت و جلی ئاسایی بکڕێت، لە کونجێکی دارستانێکی نزیك پۆشاکە نوێیەکانی لەبەرکردو و بەرەو شەمەندەفەری پاریس بەڕێکەوت.

جان کەسێکی گەمژە و بەهلەوانی نەبوو، دەیزانی ئاشکرابوونی هەڵهاتنەکەی درێژەناکێشێ و پۆلیس حەتمەن دەزانێ بەرەو پاریس ڕۆشتووە و ئەوکات کەلەپچە چاوەڕێیەکات.

کاتێك شەمەندەفەرەکە گەشتە یەکێك لەوێستگە نزیکەکان دابەزی و ترۆمبیلێکی بەرەو پاریس بەکرێ گرت.

بەمشێوەیە توانی ڕزگاری ببێت، لەژاوەژاوی شارەکەشدا ئارام بوونەوە مەحاڵ بوو.

جان هەرکەگەشتە پاریس کەمێك چاوەڕێی کرد و دواتر داوای خواردنی کرد دیارە خواردنی دەرەوە زۆر جیاوازترە، دوای تێربوون بەرەو گوندی شیفری بەڕێکەوت، بەرەوماڵی قەشە ڕۆشت. لەڕێگادا بیرەوەرییەکانی بیست ساڵی ڕابردووی هاتەوە یاد.

پیاوانی پۆلیس پەلکێشی دەکەن بۆزیندان.... جۆرج کوڕەکەی ئەسپەدارینەکەی لەباوەشدایە..... وە کلاریێس خوشکی قەشە هەوڵەدا فرمێسکی منداڵەکە بسڕێت و ژیری بکاتەوە.

جان لەدەرگای ماڵی قەشەی داو داوای دیدەنی کرد، کاتێ تەشریفی هێنا پێی وت: باوکە ئافرەتێك لەپاریس داوای لێکردم ئەمەت پێ بڵێم.

_ بڵێ کچم.

_ قەشەی پێشوو خوشکێکی نەبوو بەناوی کلاریێس؟

_ بەڵێ کچم، بەڵام چەند هەفتەیەك پێش مردنی باوکە لۆژێ مرد.

_ ئەم خوشکە منداڵێکی بەخێودەکرد؟

_ خۆیەتی ئەو کوڕەی بۆیان باسکردم.

جان وشك بوو لەجێگەی خۆی.

کوڕەکەی! خوایە ئەکرێت ئەمە دایکە نەوێرێت بیڵێت؟

پرسیاری کردو و وتی: ئەی نازانی ئەو غولامە لەکوێیە ئێستا؟

سەری لەقاند و وتی: نا، هەموو ئەوەی ئەیزانم ئەوەیە لەپاریسە و لەکاتی مردنی خاڵی هاتۆتە شیفری و لەگەڵ یەکێك لەهاوڕێیانی باوکە لۆژێ سەفەری کردووە.

_ ناوی ئەو هاوڕێیە پێ دەزانی؟

_ نا.

_ لەوەیە بەڕێوبەری گوندەکە بزانێت؟

_ مەحاڵە، بەڕێوبەری پێشوو مردووە دوای ئەو دووکەس شوێنیان گرتووە.

_ خزمەتکاری قەشە لەکوێیە؟ هیچی لەسەر نازانێ؟

_ ئەویش مرد.

_ خوشکی قەشەلێرە مرد؟

_ بەڵێ.

_ کەوایە گومانی تیانیە ناوی لەتۆمارەکانی کڵێسایە، ئەگەر ئەتوانی لێی بڕوانی و ناوی خوشکە و نازناوەکەیم پێبدەی تەنها ئەوە ئەزانم ناوی کلارێسە. بەم شێوەیە ئەتوانی ناوی کوڕەکەی و نازناوەکەیشیم پێبدەی.

_ ئەی جەنگ خانمەکەم؟ لەبیرتچووە جەنگ سێ لەسەر چواری خانووەکانی گوندەکەی لەناوبردووە و تۆمارەکانی کڵێساش سوتا و هیچی لێنەمایەوە.

نیشانەی خەم وبێچارەی بەڕووخساری جانەوە بەڕوونی بەدی دەکرا وتی: خوایە ئەبێ هەرشتێك نەزانم؟

قەشە لەخەم و گرنگیدانی ئەم ژنە سەری سوڕما و وتی: بۆچی ئەوەندە گرنگە بەلاتەوە؟

پرسیارەکەی تۆقاندی، ترسا پێی بزانێ بەپەلە وتی: لەبری هاوڕێیەکەم هاتووم بۆئێرە باوکە بەڵێنی پێدام ئەگەر زانیاری تەواوەتی بۆبێنم کرێیەکی زۆرم پێدەدا. حەزەکا ناوی کوڕەکەی خوشکە کلارێس بزانێت.

جان بەبێ ئەوەی هیچ زانیارییەکی دەست بکەوێت قەشەی بەجێ هێشت.

لەبەردەم دەرگای کڵێسا کڕنووشی برد و بەگەرمی وچاوی پڕ لەفرمێسکەوە دەپاڕایەوە و نزای دەکرد: خوایە! ئێستا چی بکەم؟ وەکو ئەوەی لەقەشە گەشتبم کوڕەکەم لەپاریسە. لەگەڵ هاوڕێی باوکە لۆژێ. تۆبڵێی چ ناوێکی هەڵگرتبێت؟

مادام خوشکە کلاریس هەڵی گرتۆتەوە، ئەگەر لەخەڵکی گوند بپرسم لەوەیە بزانن، لەوەشە ڕۆژنامەکان ئێستا هەواڵی هەڵهاتنمیان بڵاوکردبێتەوە ئەگەر ئێستا بپرسم تەنها گومان دروستەکەم لەسەر خۆم و دووبارە قۆڵبەست ئەکرێمەوە.

_ با بەدوای کچەکەمدا بگەڕێم.

بەڕێکەوت و ڕۆژی دواتر گەشتە ئەوگوندەی ئەوبەخێوکەرەی کچەکەی بۆ بەخێودەکرد.

ئەیزانی بەخێوکەرەکە لەوێ نییە چونکە لەزینداندا نامەکەی بۆگەڕابویەوە. هیوادارم ئەهلی گوندەکە شتێك بزانن.

ڕۆشت بۆ ماڵەکەی، کاتێك تەشریفیان هێنا وشك بوو لەجێگەی خۆی و ئەبڵەق بوو.

ماڵەکە نەمابوون و هیچ ئاسەوارێکیشیان نەمابوو، لەجێگەی ئەوان خێزانێکی دیکە پێشوازیان لێکرد.

جان قسەی لەگەڵ دەرگاوانەکەدەکرد، ئافرەتەکە پێی وت کەوا لەئەهلی گوندەکەیە و بەخێوکەرێکی بەناوی خاتوو فریمی دەناسی و لەساڵەکانی جەنگدا خۆشیو کوڕەکەشی مردوون.

_ پێش بیست ساڵ چاودێری کچێکی لەئەستۆ گرتبوو بەناوی لووسی هیچە زانی لەبارەی منداڵەکەوە چی بەسەر هاتبێت؟

_ لەوکاتەدا من لێرە لە جوانی نەبووم ، بەڵام گومانی تیانیە ڕادەستی پۆلیسی کردووە، چونکە ئەگەر خێزانی منداڵەکە ئامادەنەبن وەریبگرن ڕادەستی پۆلیسی کردووە تا بیبەن بۆ یەکێك لە خانەکانی بێ سەرپەرشتان. سەردانی پۆلیس بکە زانیاری وەرئەگری.

جارێکی دیکە شەپۆلی خەم و دەردەسەری و بێچارەیی بەسەر جاندا شەپۆلی دەدا.

سەردانی پۆلیس بکات، ئەزانێ کەوا تاکە ڕێگایە تاوەکو بەجگەر گۆشەکەی شادببێتەوە وەتاکە ڕێگاشە کە ئەکرێت بۆهەمیشە لەدەستی بدات، قۆڵبەستی دەکەن و ڕاپێچی زیندانی دەکەن.

هەمان ڕۆژ جان بەوپەڕی شکاوییەوە گوندەکەی بەجێهێشت و ژوورێکی بۆخۆی بەکرێ گرت، ئەترسا ئەوپارەی کەوەك سستەر کۆیکردبۆوە پێی نەمێنێت .

هەرچەنە ڕووخابوو بەڵام بەردەوام بوو تامنداڵەکانی بدۆزێتەوە.

ئەیویست کارێك بكات نەبادا لەپڕ پارەی پێ نەمێنێت و كڵۆڵ ببێت.

لەشوێنەكەی وەدەركەوت، بەدوای شوێنێك دەگەڕا تاخواردنی لێ نۆش بكات، چەند مەترێك ڕۆشت و تابلۆیەكی لەبەردەم دەرگایەكی دووكانێكدا بینی لەسەری نووسرابوو ( چاوپێكەوتنی نانەوایان).

_ ١٨ _

لوسی بێ ئاگالەوەی جۆرج داریە كاری لەكارگەكەی باوكی ماری بۆ لوسیانی دەزگیرانی دۆزیوەتەوە پۆشاكی سەماكردنەكەی بۆهەڵگرت و بەرەو ماڵی جاك جارۆد بەڕێكەوت، لوسیان لەسەر داوای جۆرج داریە ناوی خاوەن كارگەی لە لووسی وهەموو خەڵكیش شاردبۆوە. ئەگەر بەڵێنەكەی جۆرج نەبوایە زۆر لەمێژبوو بەلووسی وتبوو.

كاتێك لووسی تەق تەق لەدەرگای دەدا ماری هرمان بەخۆی دەوت: من زۆر دەوڵەمەندم ئیتر بۆچی هەوڵدەدەم ئەم سەروەتە لە دڵخۆشكردنی خەڵكیدا بەكاربێنم و باری سەرشانیان كەم نەكەمەوە.

ناخی لەبەزەیی و سۆز خۆی دەخواردەوە و هیواداربوو ئەو خەم وخەفەتە هەڵبوەرێت، بەڵام کاتێك کۆکەی لێدەهات دونیا ژێراو ژوور دەبوو لەسەری هیواداربوو جارێکی تر دونیا ببینێتەوە.

وەژوورکەوتنی لوسی بیرکردنەوەکانی بڕی، بەخێرهاتنی کرد. لەکاتی گۆڕینی پۆشەکەکاندا لەگەڵی دەدوا.

زانی کەوا هەتیوە و لەیەکێك لە خانەکانی بێ سەرپەرشتان گەورەبووە. ماری بەنکۆڵیەوە دەیوت: چۆن؟ لەخانە بەجێت دەهێڵێت و دڵی لێنادات بۆبینینت؟

لوسی بەداخەوە وتی: هیچ دایکێك بەئارەزووی خۆی منداڵەکەی بەجێناهێڵێت،

_ ئەی هەوڵت نەدا لەخانەکە داوای نازناو و زانیارییەکانی ژیانت بکەی؟

_ هەوڵمدا خانمەکەم، بەڵام هیچ داتایەك نادەن بەکەس بۆیە ناوی خێزانەکەم نازانم.

دوای کەمێکی تر ماری وتی: خاتوو ئۆگستین وتی تۆ باشترین کارمەندی ئەویت، بۆچی دووکانێك بۆخۆت ناکەیتەوە؟

_ پێویستی بەسەرمایەیە.

_ تۆ زۆر جوانیت بۆچی هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێك ناكەیت تایارمەتیت بدات و پارەت پێبدات؟

لوسی شەرم دایگرت كاتێ گوێی لەم وشانە بوو، ماری پێكەنی وتی: وابۆم دەرەكەوێ بەڕاستی بیر لە هاوسەرگیری بكەیتەوە ئەگەر وانەبوایە ڕووخسارت سوورهەڵنەدەگەڕا.

_ ڕاستە خانمەكەم، بەڵام دەزگیرانەكەم هەژارە و ناتوانم داوای پارەی لێبكەم، بۆیە ئەبێ دوای هاوسەرگیریش كاربكەم.

_ دڵخۆشەبم كاتێك هاوسەرگیریت كرد تێچووی كەرەستەكانت لەئەستۆ بگرم بەومەرجەی پیاوەكەت ڕووخسەتت بدات جلم بۆ بدووریت.

_ دڵنیام ئەگەر داوای لێبكەم ڕەتی ناكاتەوە خانمەكەم.

_ ئەتوانی بۆ پێنج شەمەی داهاتوو ئەم پۆشاكەم بۆ بدووری؟ لەیەكێك لەئاهەنگەكانی سەماكردن ئامادەدەبم.

_ ناونیشانەكەت لەكوێیە لەوەیە خۆم سەردانت بكەم؟

_ ژمارە نۆ شەقامی بۆربۆرن خانمەكەم.

_ باشـــــه، کەواتە ماڵئـــاوا. ڕۆژی پێـــنج شــــەمە چاوەڕوانت دەبم.

کــاتێ مــاری دووبــارە تەنیــا بــوویەوە، خەمەکــانی دەســـــتی پێکــــردەوە و بەخـــۆیەوت: ئەم کــــچە بێچــارە، نەبــاوکی دەناســێت نەدایکــی، لەســۆزی دایکــی بــڕاوە و بــووە بەبــێ بەختتــرین کچــی دونیــا، لەگەڵ ئەوەشـــدا بەخـــتەوەرە، بــۆچی؟ لەبەرئەوەی لەخۆشەوســـــــــتییە لەبەرئەوەی کەســــــــێکی دۆزیــوەتەوە کەخۆشـــی ئەوێــت. منــیش هەرچەنە دەوڵەمەنـــدم کەچـــی هێشـــتا کەســێك نیــیە منـــی خۆشـــبوێت! خـــوایە! بەڕاســـــتی ژیـــان بەبـــێ خۆشەویستی وەکو سزای دۆزەخە.

لەم ســـاتەدا کــۆکە بەرۆکـــی گــرت، زۆر کــۆکی و دەستەسڕەکەی لەســەر دەمــی نــا ئەبڵەق بــوو کــاتێ دەســتە ســڕەکەی لەســەر دەمــی لابــرد و پەڵەیەکــی بچــووکی خــوێنی بینـــی. بەترســەوە وتـــی: خــوایە! ئەم خــوێنە چیبــوو؟ واهەســتەکەم ســنگم وائەبێــتە دووپارچەوە.

هەرچۆنێــك بێــت هەســتا و دەرمانەکــانی خــوارد، دووبـــــارە گەڕایەوە بــــۆ شــــوێنەکەی خـــۆی و لەبەردەم ئـــــاگردانەکە خــــۆی ڕادەســـــتی خەون و خەیاڵەکانی کرد.

خەیـــــــاڵی کچێـــــــك کە بەدوای خـــــــۆزگە و خۆشەویســـتییەوەیە، بـــێ ئاگـــا لەوەی لە لێـــواری گۆڕە.

خـــانەی (( چـــاوپکەوتنی نانەوایـــان)) بەڕاســـتی کۆبـــوونەوەی نانەوایـــان بـــوو، کـــاتێ لەکـــاردەبنەوە دێن لێرە سەروشەراپێك دەخۆن و دەخۆنـەوە.

جـــان دانیشـــت و نـــانی دەخـــوارد، دەنگیـــان ئەوەنـــدە بڵندبوو پێویستی بەوەنەبوو گوێ هەڵخەی.

لەقســـــەکانیان تێگەشـــــت کەوا نانەواخانەکـــــان بەدوای کەســـــــانێکن تـــــــاوەکو نانەکەیـــــــان بۆدابەشبکات.

جـــان وتـــی: بـــۆچی وەکـــو نـــان فـــرۆش کـــارنەکەم؟ لەڕۆژێکـــدا ســـێ فرەنـــک و نیـــو وەچنـــگ خەم، شـــفتی یەکەمـــی ڕۆژ کـــارەکەم و ئەوبـــاقی بەدوای مداڵەکانمدا دەگەڕێم.

بەخێرایـــــی بەرەو نانەواکـــــان کەباســـــی قەیرانـــــی فرۆشـــیاریان دەکـــرد ڕۆشـــت و ئاگـــاداری کـــردنەوە کەوا بەدوای کـــــاردادەگەڕێ. وتیـــــان: دڵنیـــــام نـــــانەواکە دڵخۆشـــــەبێ بەڵام پـــــاریس بەباشـــــی شارەزای؟

_ ڕاســتت بــوێ، ئەســتەم نــابێ بــۆم زوو شــارەزای ئەوماڵانە ئەبم کەوا نانیان بۆدەبەم.

نانەواکە ناوی لەسەر دەفتەری تێبینیەکەی خۆی نووسی، و داوای لێکرد ڕۆژی دواتر لەهەمان کاتدا سەردانی نانەواخانەکە بکات، بەڵام نەیوت ناوم جان فۆرتێیە، ناوی لیزا بیرین ی بۆخۆی هەڵگرتبوو.

ڕۆژی دواتر بەرەو نانەواخانەکە بەڕێکەوت، دوای دوانێکی کورت خاوەن نانەواخانەکە بەسێ فرەنك و نیوی ڕۆژانە دایمەزراند.

خاوەن نانەواخانەکە وتی: دوو ڕۆژی سەرەتا خزمەتکارەکەم هاوەڵیت ئەکا تائەوەنەی ژمارەی ماڵەکان شارەزائەبی.

ڕۆژی سێیەم جان باوەشێك نانی پێبوو دابەشی ئەکرد بەسەر ماڵەکاندا.

لووسی بەرگدوور یەکێك بوو لەکڕیارەکانی.

کاتێ نان فرۆش لوسی بینی هەرزوو هەست و سۆزی بۆی هەبوو، غافڵ لەوەی ئەمە کچەکەیەتی کە بەدوی وێڵ و سەرگەردانە، بەڵام بەجوانی دەیزانی ئەم کچە شوێنی لەدڵیدا دۆزیوەتەوە.

لووسیش هەمان هەستی بۆی هەبوو.

جان بەئەستەم هەناسەی دەدا، لوسی وتی: ئەگەر سەرکەوتن بەسەر پلیکانەکاندا ماندووت

**دەکات هەر لەبەردەم دەرگا بەدەرگاوانەکە بڵێ بۆخاتوو لوسییە.**

**جان وشك بوو کاتێك ناوەکەی بیست، لوسی! هەمان ناوی کچەکەیەتی! ئەگەر کچەکەی ئێستا زیندوو بوایە هەمان تەمەنی ئەمی هەبوو. چەند جوانە!**

**نان فرۆشەکە وتی: نا کچم، ماندوونیم، هەموو ڕۆژ نانەکەت بۆ هەڵدەگرم لەبەردەم دەرگا داینانێم. تۆم خۆشەوێت.**

**بەڵام نەیوت خۆشی ویستووە و هیوادارە هەموو ڕۆژێك بیبینێت، لەبەرئەوەی کچەکەی بیرەخاتەوە کەپێش بیست ساڵ بینینی لێ حەرام کراوە.**

**جان ڕازی و دڵخۆشبوو بەکارەکەی و هەموو ڕۆژێك نانی بۆ لوسی دەبرد.**

**هەستی بەسۆزێکی زۆرەکرد بەرامبەر لوسی، لەکاتی خەیاتیدا بەچاوێکی پڕ خۆشەویستی لێی دەڕوانی، ڕۆژێکیش بوێری ئەوەی نەبوو پرسیار لەڕابردووی بکات.**

**هەندێك جار لوسیان لابرۆی دەبینی لەگەڵی دەدوا، هیچ ڕۆژێك بەخەیاڵیدا نەهات ئەم کوڕە هەمان کوڕی ئەوپیاوەیە کەتۆمەتبارکرا**

بەکوشتنی و بەهۆیەوە بیست ساڵی ڕەبەق لەپشت شیشەکانی زیندانەوەبوو.

ڕۆژی دووەمی مانگی داهاتوو جۆرج داریە نامەی بۆلووسیان نارد و داوای چاوپێکەوتنی دەکرد.

کاتێ وەژوورکەوت پێی وت: خاتوو هرمان نامەی بۆناردووم تاوەکو دەی سەرلەبەیانی سەردانی بکەی تا بەباوکی بت ناسێنێت.

_ سوپاست دەکەم هاوڕێ.

منیش هەرچییەك لەسەر تۆ دەمزانی بۆم نووسیوە.

_ نازانم چۆن سوپاست بکەم.

سبەی ڕۆژی دواتر لوسیان ڕۆشت بۆلای دەزگیرانەکەی و وتی: ئێستا ئەڕۆم بۆبینینی خاوەن کارگەکە، جۆرج داوای لێکردم ناوی نەهێنم تاشوێنی خۆمەگرم، بەڵام هیچ نهێنییەك لەنێوان من و تۆدا نییە. ناوی پۆڵ هرمانە.

لووسی بەپەلە وتی: لەشەقامی مۆرێڵە.

_ خۆیەتی، چۆن ئەیناسی؟

_ ماری کچی دەناسم، ئەم پۆشاکەی لەبەردەمم دایە هی ئەوە، ئازیزەکەم هیوادارم ئەوەی ئەتەوێ بەدەستی بێنی.

لوسیان لەهۆڵی پێشوازی دانیشتبوو لەگەڵ ماری دەدوا.

کاتێك ماری چاوی پێیکەوت لەبەڕێزی و جوانی پیشەکەی سەری سوڕمابوو، وتی: جۆرج داریەی پارێزەر پێشنیاری تۆی کردووە زۆر مەدحی کردووی، بۆیە دڵخۆشەبم لەبارەی تۆوە لەگەڵ باوکم بدوێم.

_ سوپاسگوزاری تۆم خانمەکەم؛ بۆ گرنگی دانت بەداهاتووم. ئەم پۆستەش ڕزگارم دەکات لەوئەزمە داراییەی کەتێیدام.

_ لێت ناشارمەوە چەندین کەسی دیکەهەن شەڕەکەن لەپێناو بەدەست هێنانی ئەم جێگەیە بەڵام باوکم هێشتا بڕیاری نەداوە، پێم وابێت تکاکەم بەلاوە ناخات، سروشتی منە کەخۆم لەکارەکانی باوکم هەڵنەقوڕتێنم بەڵام ئەمجارە لەبەر ڕێزی بەڕێز دارییە ئەمەوێ بیکەم.

لوسیان دووبارە سوپاسی کرد.

دواتر لەسەر شتی دیکە و بابەتی دیکە دەدوان.

ماری بەدڵێکی فراوانەوە گوێی بۆ هەڵخستبوو، چاوەکانی سەیربوون، وتی: گەورەم ئەمڕۆ بانگم کردی تا بەباوکمت بناسێنم بەڵام نامەیەکم پێگەشت کەوا ڕۆژێك لە بەلجیکا دوادەکەوێ باچاوپێکەوتنەکەمان سبەی بێت.

دواتر پێکەنی وتی: چەند سەیرە گەورەم هەتا ئێستا تەنانەت ناویشت نازانم؟

_ لوسیان.... لوسیان لابرۆ.

زەردەخەنەیەکی بۆکرد و وتی: ئەم ناوە لەبیرناکەم، ئەتوانی بێخەم بیت لەوبارەیەوە.

لوسیان چۆڵی کرد و ماری بەخۆیەوت: لوسیان....! ناوێکی جوانە، بەڵام ئەم هەستە سەیرە چییە بۆم دروست بوو؟ کاتێ لێرەبوو بەووردیوو ئاگاییەوە گوێم بۆ هەڵخستبوو هەر وشەیەکی لەدەم دەردەچوو وام هەستەکرد دڵم لەتاو ترپە بەهێزەکەی لەسینەم دەردەچێت. بەڵێ ئەبێ وا لەباوکم بکەم بەڕێوبردنی کارگەی پێبسپێرێت.

ماری بەبروسکەیەك باوکی ئاگادارکردبۆوە جاك جارۆدیش وایزانیبوو شتێکی خراپ ڕوویداوە دڵی لەحەسرەتا پارچە پارچە دەبوو، جاك وەژوورکەوت ماری زۆر لاواز و زەردهەڵگەڕاو دەرەکەوت.

دڵـــی ئەم تاوانبـــارە کەســـێ تـــاوانی کردبـــوو بەبـــێ ئەوەی تۆســـقاڵێك هەســـتی بجوڵێـــت بەجۆرێـــك بـــوو وەك ئەوەی لەجـــێگەی خـــۆی نەبـــێ وەك ئەوەی لەجەستەی ئەم نەبێ.

هەمیشـــە خـــۆی هەڵدەخەڵەتانـــدوو دەیـــوت: نـــا.... دەژی.

ئەمـــڕۆ بەڕوونـــی ڕاســـتییەکەی بـــۆدەرکەوت، زانـــی مەرگ لە ئـــامێزی نزیـــك بـــۆتەوە و دەیەوێـــت کـــچە تاقانەکەی لەباوەش بگرێت.

بەرەو ســـــنگی ڕایکێشـــــاو هەناســـــەیەکی پـــــڕ لەخەمی هەڵکێشاو، وتی: کچەکەم چۆنیت؟

_ باشم... باشتریش بووم.

دووبارە بەقوڵی و پیسی دەکۆکی.... درۆیەکرد.

بـــاوکە بێچـــارەکەی خەریکبـــوو شـــێتەبوو، ئـــازار چەشـــــتنەکەی ئەونـــــدە زۆربـــــوو نەیەتـــــوانی بەرگەبگرێت.

## _ ١٩ _

سـبەی ڕۆژی دواتـر جـاك لەنوسـینگەکەی دانە بەدانە ئەو نامانەی دەخوێندەوە کەبۆی هاتبوو.

مـۆری ئەمریکـایی بەسـەر یەکێـك لەنامەکـانەوە بـوو، بەپەلە هەڵـی پچڕانـد تـاوەکو بزانێـت لەئۆڤیدەوەیە.

لەنـامەکەدا ئۆڤیـد نوسـیبووی کەوا قەرزی قومـار سـەری لەقوڕنـاوە و ناچـاربووە لە کۆتایـدا کارگەکە بفرۆشێت.

ئۆڤیـد درێـژەی بەنـامەکەی دابـوو نوسـبووی (( ئـازیزەکەم کوڕەخـاڵ لەمـدووایەدا هەسـتەکەم نـاتوانم لەتـۆدووربم وزەی ئەوەم نیـیە لەتـۆدووربم بـۆیە بـارگەم پێچـاوەتەوە و بەرەو فەڕەنسادێم تالێت نزیك بم)).

کـاتێ جـاك ئەمەی خوێنـدەوە توڕەبـوو، و لەبەردەم خـۆیەوە دەیبۆڵانـد و دەیـوت: نەفرەتـی لێبێـت، ئەم نەگبەتـی هـیچ و پـووچە دەرگـای هەزاران دۆلاری بەرەو ڕووی کـارگە داخسـت و ئێسـتاش بەتەمـایە بەرەو ئێـرە بێـت، پـێم وابـوو نەجـاتم بـوو لێـی چـوزانم ئیسـراحەتی لێنـاکەم ئەگەڕێتەوە تاداوای زیاتربکات.

کەمێکی مابوو بۆکاتژمێر دە خزمەتکارەکە وەژوورکەوت و بە ماری وت: ئەوغولامەی دوێنێ هاتبوو ئێستا لەبەردەم دەرگایە.

هەرکە ماری ئەمەی بیست ترپەی دڵی خێراتر و خێراتر دەبوو... ڕووخساری سووربۆوە و لەدڵی خۆیدا دەیوت: ئەمە چییە؟ تۆبڵێی خۆشەویستی بێت لەدڵمدا لێدەدا؟

فەرمانی بەخزمەتکارەکەی کرد تاوەکو وەژووری نێ.

کاتێ لوسیان وەژوورکەوت پێی وت: لەبارەی تۆوە لەگەڵ باوکم قسەم نەکردووە، بەڵام ئەزانم تائێستا کەسی دانەمەزراندووە، تکایە کەمێك چاوەڕێ بکە تاوەکو بانگت دەکەم.

چاوەڕوانی درێژەناکێشێت، پێویستی بەقایل کردنی باوکی نەبوو، تکای ڕەتناکاتەوە، گومانیشی تێدانییە جۆرجی پارێزەر بەباشی پیایدا هەڵیداوە.

پاش کەمێك لوسیان لەحزووری جاك جارۆد دابوو ئەو نامەی پێدا کە جۆرج نوسیبووی.

جاك لێی پرسی: تەمەنت چەندە؟

_ بیست وحەوت ساڵ گەورەم.

_ لەكوێ لەدایك بوویت.

_ لەئالْفۆرتفێڵ.

کاتێك جاك ئەم ناوەی بیست وای هەستدەكرد خوێنی لەجەستەیدا وشك بووە..... ئالْفۆرتفێڵ؟ ئەوشارەی كارگەكەی بەڕێز لابرۆی لێبوو ئەوشارەی سێ تاوانەكەی لێكرابوو.

_ دایك وباوكت لەژیاندان؟

_ مردوون گەورەم.

_ باوكت ئیشی چیبوو؟

_ ئەندازیاری میكانیكی بوو، لەئالْفۆرتفێڵ كارگەی هەبوو.

جاك ڕەنگی پەڕی، ئاڕەقەی دەكردەوە، وتی: باوكت ناوی چییە؟

_ جۆڵ لابرۆ.

جاك بەكاردانەوەوە وبێ خەوشییەوە وتی: لابرۆ لا لا لا لا لابرۆ.

لوسیان شڵەژانەكەی جاكی بینی و وتی: گەورەم باوكمت دەناسی؟

_ یەکێـــك بـــوو لە خۆشەویســـترین هاوڕێکـــانم، هەر لەبەرئەوەشـــە پێشـــوەختە ئەوەنـــدە شـــڵەژام، کاتێ لەئەمریکا بووم هەواڵەکەیم بیست.

_ کەواتە تۆئەزانی چۆن مردووە گەورەم.

_ بەڵێ لەکاتی ئاگرەکە دەرگاوانەکە کوشتی.

_ دادوەر وایـــوت بەڵام مـــن پـــێم وایە بێتـــاوانە گەورەم.

جـاك وشـك بـوو. وتـی: بەڵام بەڵگەکـان چییەڵێیـت لەسەری؟

_ ڕێکخستنی بـاردوودۆخی بـوو، پـورم وتـی ئەبـێ بکـوژەکە پیـاوێکی باڵادەسـتی ژێـر دەسـتی بـاوکم بێت.

_ ئەوپیاوە کێیە؟

_ چـــاودێری کـــارگەکە، بـــاوکم نهێنـــێ داهێنـــانە نـــوێیەکەی پـــێ وتبـــوو ئەوەی کەئەیویســـت بەرهەمـی بهێنێـت بـۆیە لەپێناویـدا سـووتاندویەتی و کوشتویەتی ناوی جاك جارۆدە.

هەرکە ئەمەی بیسـت جـاك جـارۆد خەریکبـوو دڵـی لەجەسـتەی دەربچێـت بەهەزارحـاڵ خـۆی گرتبـوو تائاشـکرانەبێت وتـی: بەڵام وەکـو ئەوەی بیسـتبێتم ئەوپیـاوە بەشـەرەفەوە مـردووە، لەکـاتی ئـاگرەکە

ویستویەتی پارەکانی باوکت لەئاگرەکە بپارێزێت و ڕزگاریان بکات.

_ فێڵە قوربان، بێگومان خۆی هەڵداوەتە ناوئاگرەکەوە و دواتر بۆ ئەوەی کەس بیبینێت بۆی دەرچووە.

_ هیچ شتێکت لەبەردەستە تاوابڵێیت.

_ نا، بەداخەوە.

_ کەوایە ئەمە هەمووی بۆچونە و وەهمە و هیچ بنەڕەتێکی نییە، مادام حوکم دەرچووە دیارە ڕاستیەکەیە.

_ نا، گەورەم دڵنیام ڕاستییەکە هێشتا ئاشکرانەبووە، ڕەزیلی ناکەم لەهەوڵەکانم تاوەکو تۆمەتبارەکە پاکنەکەمەوە لەوتاوانە.

تویێڵی جاك ئاڕەقەی دەردایەوە و وتی: ئێستا چ سوودێکی هەیە ماوەیەکی زۆری بەسەرا ڕۆشتووە و ناتوانرێت بکوژە ڕاستەقینەکە ئاشکرابکرێت.

_ تۆڵەی خۆمەکەمەوە، دڵنیام ئێستا ئەوپیاوە لەسایەی باوکم حەساوەتەوە و دەوڵەمەندبووە، ئەگەر بیگرم و ئاشکرای بکەم داهاتووی لەناوەچێت ئەوکاتە ئەوە گەورەترین تۆڵەی منە.

کەمێــك بێـــدەنگی ژوورەکەی داگیرکردبـــوو، جـــاك لەهەمــــان کاتـــــدا ترســــاو و شــــڵەژاو بـــوو. بەخــۆیەوت: خــوایە، دوای ئەم چەنــد ســاڵە ئەبــێ کــوڕی ئەوپیــاوەی کوشــتوومە ببیــنمەوە و گــوێم لێبێت سوورە لەسەر تۆڵەکردنەوەی باوکی.

دواتــر ڕوویکــردە کــوڕەکە و وتــی: باشــە، لەبەر ڕێــزی باوکــت ئەتــکەم بە بەڕێــوبەری کــارگەکەم، هێشـــــتا کــــارگەکە دوســـــتنکراوە، حەزەکەم لەلام ئــــیش بـــــکەی تاکـــــارگەکە دروســــــتەکرێت مووچەکەشت هەزار فرەنکی مانگانە دەبێت.

لوســیان سوپاســی کــرد و وتــی: ئێســتا ئەڕۆم نــانی نیــــوەڕۆ بخـــۆم، دواتـــر یەکســـەر ئەگەڕێـــمەوە تاوەکو وێنەکانت بۆ ڕوونبکەمەوە.

_ بــا نــانی نیــوەڕۆ پــێکەوە بخــۆین، تکــایە بــڕۆ لە هــۆڵی پێشــوازی مــاری ئاگــاداربکەرەوە تــاوەکو کورســـییەکی دیـــکە بـــۆ ســـەرمێزی خـــواردن زیادبکات.

کـــاتێ جـــاکی جێهێشـــت جـــاك بە خـــۆیەوت: ئەی هـــاوار، ئەگەر ئاشـــکرابم تەنهـــا مـــن لەناونابـــات بەڵکــو کچەخۆشەویستەکەشــم ئەکــوژێ! مەحـــاڵە ڕێـــگە بـــدەم شـــتی وابکـــات، لەلای خـــۆم نشـــینی بـــکەم ئاســـانتر ئەتـــوانم چـــاودێری جوڵەکـــانی بـــکەم، ئەگەر بـــزانم شـــتێکی گومانـــاویی دەکـــات یەکســـەر

چۆن بـاوكيم كوشـت ئاواخۆشـى ئەكـوژم. مەحـاڵە بهێڵم ئاشكرام بكات كچەكەم ئەمرێت بزانێت.

لوسـيان ڕۆشـت بـۆ هـۆڵى پێشـوازى و بەمـارى وت: خـانمەكەم ئەبێـت سوپاسـت بـكەم باوكـت وەكو بەڕێوبەرى كارگە دايمەزراندم.

كاتێـك گوێيەكـانى مـارى ئەو وشـانەى بيست مـارى تێكچـوو و خـۆى بەكورسـييەكەوە گـرت، لوسـيان هەسـتى بەتێكچـوونەكەى كـرد و وتـى: چيـتە خانمەكەم؟

_ هيچ، خۆشييەكە زۆر كارى لێكردم.

لوسـيان دووبـارە سوپاسـگوزارى خـۆى دەربـڕى و دەسـتەكانى مـاچكرد و وتـى: مەحـاڵە ئەم چاكەيەتم بيربچێت خانمەكەم.

بەهـۆى مـاچەكەوە سـەرتاپاى گيـانى كەوتە لەرزە و لەدڵـى خۆيـدا وتـى: خـوايە....... زۆر زۆرم خۆشەوێيت.

لوسـيان ئاگـادارى كـردەوە كەوا بـۆ نـانى نيـوەڕۆ دەمێنێـتەوە تـاوەكو كورسـييەكى ديـكە بـۆ مێـزى نانخوارنەكە زيادبكات.

مـارى ڕۆشـت بـۆلاى بـاوكى تاسوپاسـى بكـات كەوا تكـاكەى بەهەنـد وەرگرتـووە، چـاك چاوەكـانى مـارى بينـى دەدرەوشـايەوە؛ لەدڵـى

خۆیدا وتی: تۆبڵێی کچەکەم لوسیانی خۆشویستبێت!؟ خوایە!! ئەگەر وابێت کەلێنێکی گەورەیە کچی بکوژ کوڕی کوژراوی خۆشەوێت.

خوایە! ئەکرێت......؟ خوایە بەزەیت بڕژێنە بەسەرماندا.

جان فۆرتێیە لەتاو ئەو هەستە دایکانەی بۆ لوسی هەیبوو هیواداربوو زیاتر وزیاتر بیبینێت.

قوماشێکی هەڵگرت و داوای لێکرد بۆیبدورێ.

کاتێ دانیشتبوون پرسیاری لەڕابردووی کرد و وتی: ماوەیەکی زۆرە کاری بەرگدووری دەکەی؟

_ حەوت ساڵە.

_ لەکوێ فێربوویت.

_ لەو خانەی بێسەرپەرشتانە کە تیایدابووم.

جان بیری کردوە کەوا کچەکەی ئەویش لەوێ گەورەبووە و هەمان ناوی کچەکەی ئەمیشی هەیە. پێی وت: کەوایە لەوێ گەورەبویت؟

_ بەڵێ، دایکم و باوکم نەناسیوە.

_ کەی بووە؟

_ پێش بیست ویەك ساڵ.

_ ئەی ئەوكات تەمەنت چەندبوو؟

_ ساڵێك و چەند مانگێك.

_ كێ تۆی بردبوو بۆ ئەوێ؟ خێزانەكەت؟

_ نازانم.

_ ئەی ئەو ناوەی كەهەڵت گرتووە.. كێ لێی ناوی؟

_ ئەوەش نازانم، كارگێڕی خانەكە بەوریاییەوە نهێنیەكە دەپارێزن.

لەوساتەدا لەدەرگا دراو لوسی وتی: ئەوە دەزگیرانەكەمە لوسیان گەڕایەوە. ئەمڕۆ ڕۆشت بۆ چاوپێكەوتنی یەكێك لە گەورە پیاوانی بواری كار بەڵێنی پێدابوو كارێكی گونجاوی بۆ بدۆزێتەوە.ئەگەر وابڕوات ئەتوانین تاساڵێكی دیكە هاوسەرگیری بكەین.

لوسیان بۆیگێڕایەوە كەچی بوو.

_ بەڕاستی مانگانە هەزار فرەنك وەرەگریت؟ سەروەتێكە بۆخۆی.

لوسیان پێکەنی و وتی: یان بەلایەنی کەمەوە سەرەتای سەروەتێك، نیەتمە کارگەکەی باوکم لەئاڵفۆرتفێڵ نوێ بکەمەوە.

جان وشك بوو کاتێك گوێی لەم وشانەبوو وتی: باوکت کارگەی هەبوو لە ئاڵفۆرتفێڵ؟

بەئەرێنی سەری لەقاند.

_ ناوی چیبوو؟

_ جۆڵ لابرۆ، پێش بیست و یەك ساڵ ئاگریان لەکارگەی بەردابوو و هەرلەوێشدا کوژرا.

جان لەپڕ هەستی کرد جڵەوی خۆی لەدەستداوە و وابەرەبێتەوە سەرزەوییەکە، ئێستا هەڵهاتووی زیندانە، و لەپڕ خۆی لەبەردەم کوڕی کوژراوێکدا دەبینێتەوە کە تۆمەتبارکراوە لەسەری .

کاتێ لوسیان بینی جان بەگرنگییەوە لەبابەتەکەی باوکی دەڕوانێ وتی: خانمەکەم تۆئەم ڕووداوەت بیستووە، ئەوکات هەواڵی گەرمی ڕۆژنامەکان بووە. دەرگاوانی کارگەکەی تۆمەتبارکرابوو.

بەڵام من پێم وایە ئەو بێتاوانە و بکوژەکە ئەو پیاوەیە کە وتویەتی باوکم لەئاکامی ئاگرەکەوە مردووە.

هەرچی لەپوری بیستبوو ئەوەی پوری بڕوای پێیبوو باسی کرد و وتیشی کەوا جاك بکوژەکەیە و چیرۆکی مردنەکەشی هیچ نییە جگە لەهەڵخەڵەتاندنێك.

ئەم قسان زۆر کاریان لەجان کرد، دڵخۆشبوو کەوا کوڕی بکوژ وابیرەکاتەوە، ناخی دەلەرزی، دەیویست بڵێ: گەورەم ئەوەتا ئەمە تاوانبارە بێتاوانەکەیە.

پرسی: بەڵام ئەتەوێ چی لەبکوژەکە بکەی کاتێ دەیگری؟

_ جانی بێچارە ڕزگاردەکەم، یەکێك لەهاوڕێکانم لەگەورە پارێزەرانە بەڵێنی پێدام لێکۆڵینەوەی لەسەربکات.

بۆدووەم جار دەیویست خۆی ئاشکرابکات.

بەڵام خۆی کپ کرد و وتی: بیستم دوومندالی هەیە ئاخۆ چییان لێ بەسەرهاتبێت؟

_ نازانم.

ڕەنگی زەردبوو: خوایە، ئەبێت ئاوابێت لەهەرکەس ئەپرسم ئەڵێت نازانم..... نازانم.

لوسیان ڕووی لەدەزگیرانەکەی کرد و وتی: ئەم کارە نوێیەم لەبینینت مەحرەمم ئەکات ئەزیزەکەم جگە لەڕۆژانی یەکشەمە.

_ بۆچی؟

_ لەبەرئەوەی بەڕێز پۆڵ کوچێکی لەکۆشکەکەی خۆیدا بۆکردومەتەوە تاوەکو بەئاسانی هەرکات ویستی پەیوەندیم پێوەبکات.

_ کێشەنیە مادام کارەکەت وائەخوازێت.

_ بەخاوەن ماڵەکە ئەڵێم لە سبەینێوە چۆڵی کەم.

جان خۆی هەڵدایە قسەکانی و وتی: کرێکەی چەندە گەورەم؟

_ سەت وپەنجا فرەنکی مانگانە.

_ کەواتە من دێم شوێنەکەی تۆ بەکری دەگرم.

لوسی: زۆر دڵخۆشەبم بەوەی دووری لوسیانم لەبیردەبەیتەوە.

ڕۆژی دواتر جان لەو ژوورەی کەچەند هەنگاوێك لەژووری کچەکەی دوورە نشین بوو بەبێ ئەوەی بزانێت کچەکەیەتی کەوا کون و کەلەبەری پاریس بەدوایدا دەگەڕێ.

## _٢٠_

هەمــان ڕۆژ لوســیان لەمــاڵەکەی جــاك جێگیربــوو و خەریکــی کاروبــاری خۆیبــوو. مــاریش ناوبەنــاو دەهات و پرسیاری لێدەکرد.

لەم چەنـــد ڕۆژەی دوایـــدا مـــاری بەشـــێوەیەکی بەرچــاو تەندروســتی بــاش ببــوو جــاکیش بــۆ ئاگــا نەبــــوو لەهۆکــــاری چاکبونەوەکەی.دڵنیــــابوو کـــچەکەی لوســـیانی خۆشـــەوێت، چـــارەنووس بەمەترسییەوە کــاری خۆیــدەکات دڵــی کچــی بکــوژ و کوڕی کوژراو بەیەکەوە گرێدەدات.

لوســــیانیش ووردە ووردە دەیزانــــی کە مــــاری خۆشــیەوێت بەهــۆیەوە خەمبــاربوو. بەشــێوەیەکی شــێتانە لوســـی خۆشەویســـت لەهەمـــان کاتـــدا هەســتێکی بەســۆزانەی هەبــوو لەهەمــبەر مــاری، دانپێــدانانێکی جــوان کەوا شــایەنی ئەوەنیــیە دڵــی بشکێندرێت.

تەنهـــا نەفەســـێکی مـــاوە تـــاوەکو بگـــات بە خەونەکەی، بە هەزار حـــاڵ هەلێکـــی وای بـــۆ ڕەخســا تــاوەکو مــاری ببینێــت و ببێــتە مــایەی ڕزگاربوونی لەسەر شەقامەکان.

لوسیان ڕۆژانە دەڕۆشت بۆ کارگە و ماریش هەرجارەو بەهۆیەکی جیاواز دەڕۆشت بۆلای و بەدەگمەن دەڕۆشتەوە بۆ ماڵ باوکی.

ڕۆژێك لەلایەن جۆرج داریێیەوە نامەیەکی بانگهێشتی بۆ نانی نیوەڕۆ پێگەشت.

کاتێك یەکیان بینی جۆرج وتی: بانگم کردی تاهەواڵی جان فۆرتێیەی بکوژی باوکت ئاگادارت بکەمەوە.

_ چی بەسەرهاتووە.... مردووە؟

_ نا، بەڵام هەڵهاتووە لەگرتووخانە.

_ هەڵهاتووە.!؟

جۆرج لەسەرەتاوە هەمووی بۆگێڕایەوە هەر لەدەرچوونی حوکمەکەی و چۆن کاتێ ئاگری خەستەخانەکەی بینیوە و چاکبۆتەوە و چۆنیەتی هەڵهاتنی پاش بیست و یەك ساڵ هەمووی بۆگێڕایەوە.

لوسیان وتی: نەیانگرتووە؟

_ نا، بەڵام وەسفەیەکەیم بەهەموو پیاوانی پۆلیس بڵاوکردۆتەوە.

_ بێچارە ئافرەت، پێش چەند ڕۆژێك بیستم لەخانمە بەڕێزەکان بووە.

_لەکێ بیستت؟

_ لەنـــان فرۆشـــێك کەســـەردانی لوســـی دەکـــات، ناوی لیزا بیرینە، وتیشی کچ وکوڕێکی هەیە.

دوای ئەوەی تەواوبـــوون لوســـیان بەڕێـــکەوت تـــا لوســـی دەزگیرانـــی ببینێـــت، کـــاتێ وەژوورکەوت نـــان فرۆشـــەکەش لەوێ بـــوو هەســـتا بـــڕوات،بەڵام لوســـیان هەســـتی بەســـۆز کـــرد بەرامـــبەری و داینیشـــاند وتـــی: بەڵکـــو لەگەڵمـــان بمێـــنەرەوە بە ئـــاواتەوەم دوای هاوسەرگیریشـــمان لەمـــاڵەکەی خۆماندا ژوورێکت بۆدابین بکەم.

لوســـی: لەنـــاخی دڵەوە هیـــوای ئەوەدەخـــوازم، تـــاقەرەبووی ئەو دایکـــمە بـــکەمەوە کەباوەشـــیم لەدەستدا.

لوســـیان: جـــان فـــۆرتێیەی بێتاوانـــت بیـــرە پـــێش چەند ڕۆژێك لەسەری دوای؟

هەرچـــی جـــۆرج بۆیگێڕابـــویەوە بـــۆ ئەمانیشـــی گێـــــڕایەوە شـــــێتێکەی و چـــــاکبونەوەکەی و هەڵاتنەکەشی.

_ بەڵام نـــاتوانێ جـــارێ لەپـــۆلیس هەڵبـــێ، هەمـــوو کەلەبەرێکـــی پـــاریس بەدوایـــدا دەگەڕێـــین گومـــانی تیـــانیە بەدوای منداڵەکانیـــدا دەگەڕێـــت هەنـــدێك پیـــاو دانراوە بۆی.

جـــان ڕەنگـــی پەڕی وهەوڵێـــدەدا ڕووخســـارە پەڕیوەکەی بشارێتەوە.

سـەحەری هەمـان ڕۆژ مـاری لەسـەر جـێگەی بیـر ئـــاڵۆز و خەماوییـــدا ڕاکشـــابوو. لەبەر خـــۆیەوە دەیـــوت: مـــن زۆر دەوڵەمەنـــدم، بـــاوکم لەگەورە دەوڵەمەنـــدەکانە لەگەڵ ئەوەشـــدا لوســـیان هـــیچ ڕای لەمـــن نیـیە و هـــیچ گرنگـــی بەخۆشەویســـتی من نادات نهێنی چیبێت خوایە؟

لووت بەرزی و خەم دڵی تەنیبوو.

بەخـــۆیەوت: ببیـــنە، تـــۆبڵێی بەهـــۆی پـــلەی کۆمەڵایەتیمـــانەوە بێـــت و بـــوێری ئەوەی نەبێـــت بیڵێـــت تەنهـــا لەبەرئەوەی ئەو هەژارە و مـــن زەنگینم.

نا......نـــا......بێ هـــیچ پێچـــوو پەنـــایەك منـــی خۆشـــەوێت بەڵام بەهـــۆی پـــلەکەیەوە هەســـتی خۆیم لەگەڵا ناگۆڕێتەوە.

ئەوەنـدەی پێنەچـوو بەخـۆی وت: نـا...... خۆشـی نـــاوێم..... ئەی هـــاوار ئەگەر منـــی خۆشـــنەوێت کۆتاییەکەم مردنە.

لەم بیرکـردنەوانەدا بـوو بـاوکی خـۆی وەژوورکـرد و وتـــــی: چیـــــتە ئەمـــــڕۆ هەر لەژوورەکەت بوویت.... نەخۆشی کچم؟

پێکەنی و وتی: نا باوکە.... بەڵام بیرەکەمەوە.

_ لەچی؟

کەمێک بێدەنگ بوو دواتر وتی: باوکە، باپرسیارێکت لێبکەم.

_ بڵێ کچم.

ئەمڕۆ بووم بە نۆزدە ساڵ، هیچ بیرت لەوەکردۆتەوە هاوسەگیری بکەم؟

ماچێکی باوکانەی توێڵی کرد و وتی: حەزناکەی چیتر لەپەنام دابیت کچم؟ نازانی بوونی تۆ بوێرم دەکا لەهەمبەر کارەکانمدا و وام لێدەکا بووەستم؟

_ بوونم لای تۆ و هاوسەرگیری مەحاڵە کۆببێتەوە؟ ئەگەر یەکێک گوێی لێبێت ئەڵێ ڕقت لەوەیە لەجلی بوکێنی بمبینی.

پێکەنی و وتی: لێت ناشارمەوە کچم چەندین جار بەبیرمداهاتووە. و هەموو جارێکیش هەستم کردووە بێچارەترین کەسم.

_ وەمن باوکە، نابینی کەچەند چارەڕەشم؟ لەوەیە پێت وابێت پارە بنەڕەتی خۆشبەختییە؟ بەڵام من ئەمەوێ بە خۆشەویستی خۆشبەخت بم باوکە.

_ جــاچ بەڕێزێــك تۆنەبینێــت و نەكەوێــتە داوی خۆشەویستی تۆوە؟

_ بـــاوكە لەخۆشەویســـتیدا پێویســـت ناكـــات خۆشەویســـــت كەســــێكی ڕێزداربێـــــت ئەگەر كرێكــارێكی بچوكیشــم خۆشــبوێت بەخــتەوەر ئەبــم باوكە.

دڵــی بــاوكی داخورپــا دركــی پێكــرد قســەی كــچەكەی بەرەو كوێ ئەڕوات.

چیتر ترسی نەما زانی لوسیان لابرۆیە.

بێدەنگییەكی درێژ لەنێوانیاندا دروست بوو.

دواتـــر بـــاوكەكە وتـــی: ئەمـــڕۆ ئەڕۆم بـــۆ نوسنیگەكەی جۆرج دارییە دەمێكە نەمبینیوە.

ڕووخســاری مــاری دەدرەوشــایەوە وتــی: منــیش لەگەڵت دێم باوكە.

ســەیرنییە دەیزانـــی قســـەی نێـــوان دووپیـــاو بەدڵنیــاییەوە لەســەر لوســیان ئەبێــت، زۆر پێــی خۆشــبوو خەڵكــی قســەیان لەســەربكردایە، دوای نیــو كــاتژمێر جــاك جــارۆد و كــچەكەی لەمیــوانی جــۆرج بــوون هەروەك مــاری پێشــبینی كــرد بەهاوبەشـــی ئـــاتیین كاســـتڵ لەســـەر لوســـیان دەدوان.

**ماری: لوسیان خێزانی هەیە؟**

**_ نـــا، تاوانێـــك ڕوویـــداوە و بـــاوكی بـــووە بەقوربانی.**

**_ تـاوان! هیچـی پێـنەوتم لەسـەری. تكـایە بـۆم بگێڕنەوە.**

**سـەركەوتنەكانی باوكیـان بـۆگێڕایەوە و هەروەهـا بۆشـــیان گێـــڕایەوە كە مردنێكـــی سروشـــتی نەمردووە و لەكاتی ئاگركەوتنەوەكە كوژراوە.**

**وە چـۆن جـان كوشـتویەتی.لەگەڵ ئەوەشـدا چـۆن لوسیان بڕوای بە بێتاوانی ئەم ژنە هەیە.**

**_ بەڵام چـــۆن خۆجـــان فـــۆرتێیە لەســـەری سەپێنراوە؟**

**_ پێـــی وایە دادوەر هەڵەی كـــردووە، پێـــداگربوو لەســـەر ئەوەی لەزینـــدان چـــاوی پێـــی بـــكەوێ تاڕاســـتی مەســـەلەكەی بـــۆ باســـبكات. بەڵام مەحاڵە.**

**_ بۆمەحاڵە؟ مردووە؟**

**_ نا، هەڵهاتووە.**

**جـــاك ڕەنگـــی پەڕی و بەشـــپرزەییەوە وتـــی: هەڵهاتووە؟**

_ بەڵـــێ، بەڵام زوو فۆڵبەســـت ئەکرێـــت پیـــاوانی پۆلیس کون و کەلەبەری بەدوادا دەگەڕێن.

مــــــاری: بەڵام لووســــــیان بــــــۆچی بەدوای بکــــــوژەکەوەیە مــــــاوەیەکی زۆر تێپەڕیــــــوە و ئەستەمە؟

_ بەوتەی خــۆی ئەیەوێــت ئاشــکرای بکــات و ئــابڕووی ببــات لە نێودۆســـت و هاوڕێکــانی، بێگومـان بەهـۆی بـاوکی لوسـیانەوە ئێسـتا یەکـێکە لەهەرە دەوڵەمەندەکان.

_ لەڕاسـتیدا تـۆڵەیەکی خـراپە بکـوژەکەش ڕوونە ئێســتا خێزانێکــی هەیە کەخۆشــی دەوێــت، بەڵام تۆڵەیەکی دادپەروەرانەشە.

هیوادرم لوسیان بکوژی باوکی ببینێتەوە.

جـــاك بەم قســـانە هەســـتی دەکـــرد نـــووکی خەنجەرێکیان لەقوڕگی ناوە.

لەگەڵ هەروشـــەیەکی زبـــر وڕەق کە لەقـــوڕگی کـــچەکەی دەردەچـــوو دڵـــی بـــاوکی دەیـــان جـــار ڕادەچەڵەکی.

دوای بێـدەنگییەکی کـورت جـۆرج وتـی: لوسـیان بەم داهـــاتەی ئێســـتای هەوڵەدات کـــارگەکەی باوکی لەئاڵفۆرتفێڵ نوێ بکاتەوە.

ماری: هیوایەکی گرانە، دیارە ماوەیەکی زۆرە چاوەڕێی کردووە، بێجگە لەوەی باوکم بیەوێت چاوەڕێکەی زیاتر نەکێشێت.

باوکی ڕووی وەرگێڕا بەرەو لای کچەکەی و وتی: چۆن لەسەر من،وەستاوە؟

_ چەند ڕۆژێك پێشتر ئاگادارکرامەوە دەتەوێت کارگەیەکی نوێ بکەیتەوە، ئاخۆ لوسیان ئەتوانێت بەڕێوەی ببات؟

_ بێگومان ڕایدەسپێرم.

ماری بەساردییەوە وتی: کەوایە بیکە بەهاوبەشی خۆت.

ئەم قسانە جۆرج و ئاتیینی سەرسامکردبوو، باوکی ویستی ڕەتی بکاتەوە بەڵام نەیهێشت و وتی: بۆچی ناڕازیی باوکە؟

تۆپارەکەی دەدەیت و لوسیانیش کار و بەڕێوبردنی خۆیت پێشکەش دەکات. دوای ئەوەش تۆ پێویستت بەپشووە.

لوسیانیش وەکو ئەوەی لەتۆوە بیستبێتم جێگەی متمانەیە.

_ زۆریش جێگەی متمانەیە کچم، بەڵام پرۆژەیەکی مەترسیدارە و مرۆڤ بۆ

بیرکردنەوەیەکـــی چـــاك هەروا نایبەخشـــێ ســـەرەتا ئەبێ ڕازیبم لەسەر ئەوەی واوتت.

کـاتێ بـاوك و کـچ هەسـتان و ویسـتیان بـڕۆن مـاری بەئـــاتیینی وت: گەورەم دڵخۆشـــەبم بەبینیـــت و دڵخۆشـــەبم کۆشـــکەکەی بـــاوکم بەتـــابلۆ نەمرەکـــانتەوە بـــڕازێنیتەوە ئەتـــوانی هەنـــدێکی خـــۆت و تـــابلۆی کەســـانی دیـــکەش کەخـــۆت هەڵیبژێری بۆم بنێریت؟

_ بەدڵنیـاییەوە خـانمەکەم، سوپاسـگوزارم بـۆئەو شەرەف و متمانە.

کــاتێ چۆڵیــان کــرد، ئــاتیین و پــارێزەرەکە ڕوویــان لەیەك کـرد و جـۆرج وتـی: چیـت بـۆ دەرکەوت لەم سەردانە؟

_ خۆشەویستی ماری بۆ لوسیان.

_ پێکـــات، گومانیشـــم نیـــیە هاوســـەرگیری لەگەڵا بکات.

_ هـــاوڕانیم لەگەڵـــت، ئاگـــات لێنەبـــوو بـــاوکی ئەم قسانەی پێ خۆشنەبوو؟

_بەڵام خۆشی ئەوێت و داوای ڕەتناکاتەوە.

_ ئەکـــرێ، لەگەڵ ئەوەشـــدا هەر پـــێم وایـــە ڕازی نابێت لەسەر ئەوبیرۆکەیە، ئەیبینین.

لەم ساتەدا گالیسەکەکەی جاك و کچەکەی ڕێگاکانیان دەبڕی و هەرەیەکەیان لەخەیاڵ و بیرکردنەوەیەکابوون بەبێ ئەوەی یەك وشەش بدرکێنن.

ماری بیری لەوبیرکردنەوە بوێرانە دەکردەوە کەوا پێشنیازی کردبوو بۆ باوکی، وەچۆن داوای لەباوکی کردووە کە لوسیان بکات بەهاوبەشی خۆی بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی ئاتیین و جۆرج چۆن بیرەکەنەوە لەسەری.

جاکیش بیری لەوەدەکردەوە کەوا چۆن جان هەڵهاتووە و هاتووە بۆپاریس تاوەکو بەدوای منداڵەکانیدا بگەڕێت.

بەخۆیەوت: هیوادارم تا تاڵێك پرچ بەسەرمەوە مابێت جان دەستی پێم نەگات، بەڵام نا، پۆلیس ئەبێ دەستی پێبگات پێش ئەوەی دەستی بەمن بگات وکچەکەم بکوژێت.

نامەکەی ئۆڤیدیشی هاتەوە یاد کە هەواڵی پێداوە دێت بۆ پاریس. خوایە! ئەم هەموو کەلەبەرانە چین یەك لەدوای یەك بەرەوڕووم دێن ئەبێ دووکەس هەبن لەپاریس نهێنیەکەم بزانن؟ بەڵام لەئۆڤید ناترسم ئەتوانم دەمی داخەم بەپارە .... بەڵام جان!

توێڵی ئارەقەی دەکردەوە.

# بەشی دووەم

# پاکبونەوە

## _ ۱ _

سەحەرەکەی ئۆڤید گەشتە پاریس، ڕاستەوخۆ بەبێ یەك و دوو بەرەو کۆشکەکەی کوڕە خاڵە ئازیزەکەی بەڕێکەوت پێیان وت: ڕۆشتووە بۆ کارگەکەی، هەرلەوێشەوە ڕاستەوخۆ بەرەو کارگە بەڕێکەوت.

ئۆڤید لەدەرگای نوسینگەکەی داو وەژوورکەوت، جاك چاوی بڕیبووە ناوچاوانی و ڕەنگ بەڕوییەوە نەمابوو. بەپەشۆکاوییەوە وتی: ئەمەتۆی؟

_ بەڵێ، بەڵام بۆچی بەوسەردییەوە وەڵامم دەدەیتەوە؟ هاتنم بێزاری کردووی کوڕە خاڵە ئازیزەکەم؟

جاك خۆی کۆکردەوە و تەوقەی لەگەڵ ئۆڤید کرد و فەرمووی دانیشتنی لێکرد دواتر لێی پرسی: بۆهاتی بۆسەردانم؟

_ تاکارێکم بۆ بدۆزیتەوە لەکارگەکەت؟

توڕەبــــوو هــــاواری کـــــرد: نەفرەتــــت لێبێــــت، ئەوکـــارگە چـــاکەی لەنیویـــۆرك دەســـت بەرداری بوم بۆت ئاوا بەڕێوەی ئەبەی؟

_ قومـارە.... قومـار.... ژیـانی وێرانکـردم، کـاری بەڕێوبردنیشـــی وێرانکـــردم. ئەو مێـــزە ســـەوزە جـــگە لەچەنـــد دۆلارێـــك هەرچـــی پـــارەم هەبـــوو هەڵـی لووشـی، لێتەپـاڕێمەوە بمـکە بەبەڕێـوبەری کارگەکەت.

_ ئەوەیان مەحاڵە.....

_ بۆ....؟

_ بەڕێـوبەری ئێسـتای کـارگە کـوڕی ئەو پیـاوەیە کەکوشـتوومە، کـوڕی جـۆڵ لابـرۆ، ئەگەر کۆتـان بــــکەمەوە بەیەکەوە لەوێ لەوانەیە شـــــتێك لەو زمــــانە نەفـــــرەتییەت دەربچێـــت و قـــوڕبکەیتە سەرمان.

_ وریائەبم.

_ هەرچیــیەك بێــت نـــاتوانم کارێکــت لەکـــارگە بۆبــــدۆزمەوە، کــــــارگەیەکی گەورە و پەنجــــا هەزاردۆلاریشـــم بـــۆ بەجێهێشـــتی لەبەر ڕەفتـــارە نابەجێیەکانـــت و بـــێ ئەقڵـــی خـــۆت هەموویـــت تاوانـــدەوە ئیتـــر نـــاکرێ مـــن بـــکەی بەبەرپرســـی قەرەبووکردنەوەی.

بەدەنگێکی لەسەرخۆ و ئارام ئۆڤید وتی: مانای وایە بەجێم دەهێڵی؟

_ بێگومان! تۆ بەسەرخۆتت هێنا.

_ وەتۆش بەسەرخۆتی ئەهێنی.

جاك وەکو دڕندەیەکی لێهات و وتی: وائەزانی گرنگی بەهەڕەشەکانت ئەدەم؟ ئەزانم بیر لەچی دەکەیتەوە، بەخۆتەڵێی: ئەگەر بەڵێنی پارەکەی لێوەرگرم لەهەمبەر ئەوەی ئاشکرای نەکەم ئەوکات ناچارە دەمم بە پارە دابخات.... نا برادەر بەهەڵەدا چوویت ئەگەر ئاشکرام بکەی یەك فرەنکیش چییە بەچاو نابینی.

_ چۆن؟

_ ئەگەر بۆم دەرکەوتایە تۆ زۆر سووری لەسەر ئەوەی ئاشکرام بکەی گولەیەکم ئەنابەخۆمەوە و ئەوکات هەرچی سەروەتم هەیە بۆکچەکەم ئەبوو و تۆش یەك ڤروشت بەرنەکەوت، باشترە بۆت کەنهێنییەکە بپارێزی، لەبەرئەوەی ئەوەی لەکاتی زیندوێتیمدا بەدەستی دێنی دوای مردنم بە چاونابینی.

بێدەنگی...

ئۆڤید زانی کەوا جاك مەبەستییەتی لەوەی دەیڵێ و خەفەت وایلێکا خۆی بکوژێ و هیچ سوودێك

لەمردنەکەی نابینیٚ، وتی: چۆن دڵت دێت بەجێم بهێڵی؟

_ وازت لێناهێنم، لەهەمبەر ئەوەی چاوم بەچاوت نەکەویٚ پارەت دەدەمیٚ هەموو مانگێك هەزار فرەنکت بۆدەنێرم.

_ هەزار فرەنك؟ خۆکەمە.

_ ئەگەر واز لەقومار بێنی بەسیشتە. دواتریش ناتوانم لەوەزیاترت پێبدەم ئێستا یەکەم مووچەت لەگەڵ پێنج هەزار فرەنك دەدەمیٚ تاخۆت بگری.

لەم قسانەدابوون خزمەتکارەکە وەژووکەوت تاهەواڵی پێبدا لوسیان لابرۆ هاتوە بۆدیدەنی.

ئۆڤید هەستا تاوەکو بڕوات کاتیٚ ڕۆشت بەتێر و تەسەلییەوە لە لوسیانی ڕووانی و بەخۆی وت: کەواتە بکوژ و کوڕی بکوژ یەکیان بینی؟ چەند سەیرە چارەنووس.

جاکیش لەولاوە بەخۆیەوت: لەوبەختە! ئاخۆ چارەنووس پشتی تێکردووم؟ ڕەشەبا هەڵیکردووە؟ جان فۆرتێیە لە گرتووخانە هەڵهاتووە و ئۆڤید بەوشێوەیەیە و لوسیان بەدوامەوەیە تائاشکرام بکات!

خوایە چ شەرمەزارییەکە، ڕزگارم نابیٚ تاهەرسێکەیان نەکوژم.... بەڵام چۆن؟

جاك بیری لەوەدەكردەوە چۆن ڕێگایەك بدۆزێتەوە تەختیان بكات... لەپڕ بەبێ ویست شانەكانی هەڵتەكاند و وتی: جاترسی بۆچییە؟ چ ئاژاوەیەك ڕوودەدات هەتا ئەوكاتەی دەمی ئۆڤید بەپارە داخەم. لوسیانیش نوقمی دەكەم لە هاوكاری جانیش بەبێ هیچ ئەملا و لایەك چارەنووسی هەر كوچی زیندانە، نا نا هیچ شتێك نییە تاوەكو لێی بترسم لەسەریان.

لەودەمەدا ماری ڕۆژ بەڕۆژ تادەهات خراپتردەبوو یەكەم شنەبای خۆشەویستی لێیدەدا، ڕەتكردنەوە و وەلانانی لوسیانیش زیاتر بەرەو لەناوبردنی دەبرد.

باوكی بەتەواوی دركی پێكردبوو خۆزگەی ئەخواست دەرمانی لای پزیشكەكان بێت بەڵام چ چارەیەك؟ چ دەوایەك شیفایەتی؟

وەكو ڕۆژانی دیكە ماری لەشوێنەكەی خۆی بەدینەكرد، جاك ڕۆشت تاوەكو چاوی بەكچەكەی بكەوێت بەڵام چی بینی ڕەنگێكی زەردهەڵگەڕاو و پەڕیو، وتی: چیتە كچەكەم؟ نەخۆشی؟

ماری كۆكەیەكی پیسی لێهاتبوو، باوكی پێیوت: ئازارت هەیە ماری؟

_ پڕ لەئازار باوكە.

**چاوی باوکی پڕببوو لەدڵۆپی فرمێسك و حەسرەت، وتی: کوێت ئازاری هەیە کچەکەم؟**

**_ ئێرە باوکە.....ئێرە.....دڵم.**

**جاك ئازاری دەچەشت و خەم پارچە پارچەی دەکرد: دڵت؟ هەتا ئەمڕۆ شتێکی وام لێنەبیستویت.**

**_ چونکە ماوەیەکە.**

**_ لوسیان لابرۆت خۆشەوێت؟**

**بەئەرێنی سەری لەقاند و وتی: خۆشەویستییەکەی لەخوێنمدایە باوکە، مەحاڵە لەبیری بکەم.**

**تورەبوو و بەرپەرچی دایەوە و وتی: بەڵام خۆشەویستیەکی شیتانەیە.**

**ماری پڕ قورگی ببوو لەگریان و خۆی نەگرت فرمێسك بەڕیز لەچاوانی دەهاتنەخوار، پچڕ پچڕ وتی: هیچ هێزێك نییە ئەم خۆشەویستییە لەدڵم دەربێنێ. بۆڕقت لەوەیە لەگەڵ لوسیان هاوسەرگیری بکەم؟ ئەگەر مەبەستت هەژارییە ئێمەش سەردەمانێك هەژاربووین چ پێویستی بەپارەیە ئەوەندەی بەسبێت ئێمە هەمانە؟ جاریێ چیبووە داهاتوویەکی پڕشنگداری لەپێشە.**

دوای ئەوەش بــــاوکە خۆشەویســـتی کـــاڵا نیـــیە بخــــــرێتەڕوو. بـــــیکە بەهاوبەشـــــی خــــــۆت و باهاوســـەرگیری بکەیــن پــیکەوە بەخۆشــی پــێکەوە من وتۆ و لوسیان پیکەوە دەژین.

جاك بێدەنگ بوو.

مـــاری: بــاوکە ئەزانــم تــۆ منــت خۆشـــەوێت بەڵام ئەگەر نـــاتەوێ مەرگـــم ببینـــی باهاوســـــەرگیری لەگەڵ لوسیان بکەم.

_ بمری؟

_ بەڵـــێ، نـــابینی نەخۆشـــی تەواوی جەســــتەمی گرتـــووە؟ خۆشەویســتییەکەی زیــاتر و زیــاتر ئەبــێ چاکنابم تاهاوسەرگیری لەگەڵ نەکەم.

جــــاك بەدەنگێکــــــی سەرســــامییەوە وتــــــی: هەرچییەکـــــت ئەوێ کــــچەکەم داوای بــــکە بەڵام داوای ئەوەم لێمەکە مەحاڵە ببێتە مێردت.

بەپێــداگرییەوە وتــی: بەڵام کەســی دیــکە جــێگەی ناگرێتەوە.

لەپــڕ ڕەنگــی زەردهەڵــگەڕا و وتــی: دڵــم........ هەستەکەم دەخنکێم..

ســــەری لەکورســــییەکەی گیرکـــــرد و بەقـــــوڵی دەکــۆکی بــاوکی هەســتایە ســەرپێ وایزانــی تەواو

مـردووه تەواو كۆتـايى كچەكەيەتـى. دەسـتى گـرت و وتـــى: مـــارى خۆشەويســـتەكەم مـــارى..... قســـەيەك بـــكە..... هەرچييەكـــت ئەوێ ڕازيـــم و ڕێـــگەت پێـــدەدەم لەگەڵ لوســـيان هاوســـەرگيرى بـــكەى ســـوێندت بـــۆ دەخـــۆم ...... بەڵام قســـەيەك بكە ئازيزەكەم..

بەڵام نەقسەى دەكرد نە وەڵام هيچ...

لەزەنگـــــــۆڵەكەى دەدا و هـــــــاوارى تەواوى كۆشـــكەكەى تەنيبـــوو: خـــوايە كوشـــتم هـــاوار خوايە....

يەكێـك لەخزمەتكارەكـان بەتەنـگ زەنـگەكە هـاتوو زانـــى خـــانمەكەى لەهـــۆش خـــۆى چـــووە دەمووچـــاوى بەبـــۆن تەڕكـــرد مـــارى جـــوڵا .... ڕوومەتەكانى دەستيان بەجووڵە كرد.

_ كەوايە لەهۆش خۆى چووبوو.

هەڵيگرت و لەسەر جێگەكەى نا.

بـــاوكى چـــاوى كەوتەســـەر لێوەكـــانى و دڵۆپێـــك خـــوێنى لەســـەر لێوەكـــانى بينـــى، كـــچە تاقـــانەكەى خـــوێن هەڵـــدێنێتەوە ئەم دڕنـــدەيە هيچـــى بـــۆ نەمايەوە و هيچى بۆنەدەكرا جگە لەگريان.

چـــاوى پڕببـــوو لەفرمێســـك وەكـــو منـــداڵ دەگريـــا بەژوورەكەدا دەهات و دەچوو.

لەسەرخۆ ماری چاوەکانی کردەوە و چاوی دەگێڕا بەژوورەکەدا و بەهەزار حاڵ پیاو گوێی لەوشەیەکی دەبوو، بەدەنگێکی کزەوە دەیوت: لوسیان...... لوسیان....

باوکی بەدەنگێکی خنکاوەوە وتی: دڵنیایە کچم ئەژی تاخۆشت بوێت، و ئامادەئەبی تابچیت بۆلای.

ژیان بەبەر ماری هاتەوە و وتی: ڕازی ئەبی هاوسەرگیری لەگەڵ بکەم؟

_ بەڵێ،کچەکەم.... سوێندت بۆ دەخۆم لەسەری، بەڵام لەبەر من و ئەویش بژی.

پێکەنی و بەئاگاییەوە وتی: ئەژیم و بەختەوەرئەبم.

جاك کچەکەی زۆر خۆشەویست بێ یەك و دوو مردنی کچەکەی ئەویشی لەناوئەبرد، هیچ گومانێکی نەبوو لەوەی ئەبوایە هاوسەرگیری ماری و لوسیان ئەنجام بدرێت.

بەخۆیەوت: کێ ناڵێ هاوسەرگیرییەکە نابێتە قەڵغانێك بۆم لەهەمبەر تۆڵەی لوسیان ماقول نییە پیاو خەزووری ئاشکرابکات.

بانگی لووسیان ی کرد و پێی وت: کوڕەکەم ئەمەوێت لەسەر بابەتێکی مەترسیدار قسەت لەگەڵ بکەم.

شڵەژابوو نەیەزانی چۆن قسەبکات. کەمێك بێدەنگ بوو دواتر وتی: جۆرج دارییە پێی وتم کەوا ئەتەوێ کارگەکەی باوکت لە ئاڵفۆرتفێڵ نۆژەن بکەیتەوە.

_ ڕاستە گەورەم، چەندین ساڵە لەمێشکمە.

_ کەواتە ئەوە بزانە ئومێدەکەت خەریکە دێتەدی، ئەبمە پاڵپشتت لەبەدیهێنانی.

_ بەڕاستیتە گەورەم؟

_ بەڵێ، ئەمەوێ کارگەیەکی نوێ بکەمەوە، دروستکردنیشی شاری ئاڵفۆرتفێڵم هەڵبژاردووە، لەهەمان زەوییەکەی باوکیشت دەیکەم.

_ بمبوورە گەورەم... من نامەوێ ئەو زەوییە بفرۆشم.

_ وتم بیفرۆشە؟

لوسیان سەری سوڕمابوو وتی: مەبەستتت چییە گەورەم؟

_ مەبەستم ئەوەیە کەوا ئەتکەم بە هاوبەشی خۆم، من پارەت دەدەمێ و تۆش بەڕێوبردنی بگرە ئەستۆ زۆر پێویستیم بەدەستێکی پاکە وەکو تۆ ساڵەکان منیان بردووە و پێویستیم بەپشووە.

بێدەنگی..

لوسیان بڕوای بە گوێیەکانی خۆینەدەکرد، ئەمە چۆن....؟

پۆڵ هرمان وەك هاوبەشی خۆی وەریدەگرێت؟ بۆچی؟

لوسیان: گەورەم من هێشتا شتێکی وام نەکردووە تاشایەنی ئەو پاداشتەبم.

جاك لەسەرخۆ وتی: بەڕێز لابرۆ ئەزانی چۆن دەرگای سەروەت و سامانم بۆکرایەوە، وە چۆن نایۆمی مۆرتیمۆر هاوبەشی پێکردم لەکاتێکدا کرێکارێکی سادەبووم.

_ بێگومان بەهەوڵ و تێکۆشانی خۆت.

_ شتێکی سروشتییە، بەڵام هەنگاوە گەورەکە ئەو کاتەبوو کاتێك مۆرتیمۆر منی کرد بەزاوای خۆی و کردمی بەهاوبەش.

بۆچی مۆرتیمۆر وەکو قدوەیەك وەرنەگرم؟ ئەتکەم بەهاوبەشی خۆم و کاتێك هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکەم دەکەی نیوەی سەروەتەکەشم بۆ کچەکەم بەجێدەهێڵم.

لوسیان تورك بوو، وتی: مەبەستت ئەوەیە هاوسەرگیری لەگەڵ ماری بکەم؟

_ بەڵێ، چ کەسێك ڕەتی دەکاتەوە؟ کچەکەم تۆی خۆشەوێت و تۆی هەڵبژاردووە.

بێدەنگی...

_ گەورەم، ئەم چاکەیەی بەرامبەرم دەینوێنی بەجۆرێکە ناتوانم سوپاست بکەم. بەڵام داوای لێبووردن ئەکەم ئەبێ ئەم پێشنیازەت ڕەتبکەمەوە.

جاك سەری سوورما بوو وتی: چییەڵێ؟ ڕەتیەکەیتەوە هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکەم بکەی؟ هۆکار چییە؟

_ لەبەرئەوەی گەورەم من پیاوێکی خاوەن کەرامەتم و ناتوانم لەژێر پێیەکانمدا داییبنێم.

جاك بەپەلە وەڵامی دایەوە و وتی: ئەمەتۆچییەڵێ؟ دیارە بەهەڵە لەمن تێگەشتی.... وائەزانی بەپارە چاوت کوێرەکەم؟ مەگەر من پێم

نەوتـــی مـــاری تـــۆی خۆشـــەوێت و تـــۆی هەڵبژاردووە؟

_ تێگەشـــتم لەوە گەورەم، بەڵام هێشـــتا ســـوورم لەسەر وەڵامەکەی خۆم.

_ ئاخر بۆچی؟

_ کچـــێکم خۆشـــەوێت و ســـوێندم خـــواردووە هاوســـەرگیری لەگەڵا بـــکەم، مەحاڵیشـــە بەهـــیچ شێوەیەك پاشگەزببمەوە.

_ ئەوکچەی واخۆشتەوێ... پارەدارە؟

_ پارەی نییە.

_ پێـــت وایە خۆشەویســـتی هەتـــا هەتـــایە؟ هاوســـەرگیری لەگەڵ کـــچەکەم بـــکە هەرکـــات خۆشەویستی نەمێنێت پارە دەمێنێت.

_ خۆشەویستیم هەڵناوەرێ گەورەم.

_ وە مـــاری، نـــازانی ڕەتکـــردنەوەی تـــۆ ئەیکوژێت؟

_ ئەتوانێ لەبیرم بکات.

_ ئەی ئەوســـەروەتەی بـــۆتم هەڵڕژانـــدووە، هەروا بەئاسانی شەق لەداهاتووت دەدەی.

_ بمبوورە گەورەم دڵم کاڵانییە بیفرۆشم.

**دواتر لەبەردەم جاك نەوییەوە و ڕۆشت.**

**جاك بەتەنیا مابوویەوە لەژوورەکەی و وەکو شێت هاواری دەکرد: کچەکەمی خۆشناوێت! کچێکی هەژار کاری لێکردووە.**

**ئەمە نابێ، ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵا بکات ماری نامێنێت مەحاڵە ڕێگە بەهیچ کەسێك بدەم کچەکەم بکوژێت.... مەحاڵە.**

**_ ٢ _**

**هەمان ڕۆژ دوانیوەڕۆ ماری ڕۆشت بۆلای بەرگدوورەکەی؛ خاتوو ئۆگستین، لوسیش لەوێ بوو پێی وت: تۆ لەکوێی لوسی؟ لەدوای جلی سەماکردنەکەوە نەماویت حەزم بەهاوڕێیەتی وانییە.**

**لوسی سوپاسی بەخشندەییەکەی کرد...... ماری: لەنیەتمە سەردانت بکەم، لەشەقامی بۆربۆرنی ژمارە نۆ وایە؟**

**_ خۆیەتی خانمەکەم، سەردانکردنت شانازییە بۆم خانمەکەم.**

مـــــاری دووکـــــــاتژمێر زیـــــاتر مــــــایەوە لەگەڵ بەرگـــــــدوورەکەی و پۆشـــــاکێکی زۆریشـــــــی پێشنیازکرد تاوەکو بۆی ئامادەبکەن.

دواتـــر گەڕایەوە تـــاوەکو بزانێـــت بـــاوکی هەواڵـــی چی پێیە بۆی.

ئێـــوارە کـــاتێ گەڕایەوە مـــاچی کـــرد و باوەشـــی پێداکرد: لەبەیانی باشتر دێیتە بەرچاوم کچەکەم.

_ خەوتـــن زۆر ســـوودی بـــوو بـــۆم، بەڵام پـــێم بڵـــێ هیچ هەواڵێکت پێیە؟ قسەت لەگەڵ لوسیان کرد؟

_ کـــردم کچـــم، ئەتـــوانم بڵـــێم ژیـــان هەمیشـــە بـــۆت ڕانەخـــــراوە وەك ئەوەی هەمیشـــــە خەیـــــاڵی بۆدەکەی.

_ بێگومـــــان پێـــــت نەوت کەوا مـــــن ئەوم خۆشەوێت!

_ کـــچەکەم تـــۆ داب و نەریتـــت بیرچـــووە؟ وتـــم ئەگەر هاوســـەرگیریت لەگەڵا بکـــات دوودڵ نـــابم لەوەی ڕازی بم .

_ وەڵامی چی بوو؟

_ بـــڕوای نەدەکـــرد، وتـــی ئەو ســـەروەت و ســـامانە و پـــایە کـــۆمەڵایەتییەی لەنێوانمانـــدایە کـــارەکە مەحاڵ دەکات.

_ قسەکانتان لەکوێ تەواو بوو؟

_ لەکۆتایدا مەرجێکی بوو.

_ چ مەرجێك؟

_ پیاوێکی بەڕێزە و ڕەتی دەکاتەوە دەستی هاوکاری بۆدرێژبکەم بۆیە داوای کرد کاتی پێبدەم تاخۆی کۆکاتەوە.

_ ئەم کارە بەڕێزانەی واملێکات بەرزی بنرخێنم، بەڵام تۆبڵێی وەك چۆن من ئەوم خۆشەوێت ئەویش ئاوا منی خۆشبوێت؟

_ جا کێ هەیە تۆی خۆشنەوێت؟

ماری لەباوکی ڕوانی و وتی: باوکە! گاڵتەم پێدەکەی؟ تەنانەت وەڵامی پرسیارەکەشم نەبوو.

باوکی بەجۆرێك لەجۆرەکان تێك چوو، وتی: بەڕاستی وەڵامی نەدامەوە، بەڵام خۆشەویستیم لەچاوەکانیدا بینی.

دڵی ماری داخورپا و وتی: ئەندێشە ناکەی؟

_ مەحاڵە! چاوی مرۆڤ خۆشەویستییە.

ماری کەمێك بێدەنگ بوو دواتر وتی: زۆرە کێشێ؟

_ نازانم، بەزۆری چەند مانگێك.

_ لەم مـــاوەیەدا.... ئەكرێــت ئەوەی لەنێــوان مــن و لوســـــیان ڕوودەدات وەكـــــو دوو دەزگیـــــران لەقەڵەم بدرێت؟

_ لێت تێكچووە نازانی ئەو زۆر بەئابڕووە؟

_ ئەی ئەكـــریَ ببێـــتە ڕێگـــر لەخۆشەویســـتیم بۆئەو؟

_ بەهەرحاڵ سەردانی ماڵ ئەكات.

مـــاری تـــۆنی دەنگـــی لەخۆشـــیدا نووســـت: بـــاوكە تكایە ئەتوانی دەزگیرانداریمان ڕابگەیەنی؟

_ واكەم كچەكەم.

دانیشتن و نانی ئێوارەیان پێكەوە خوارد.

مـــاری بەدرێژایـــی شـــەو ڕووخســـاری لەخۆشـــی و خۆشەویســـتیدا دەدرەوشـــایەوە، باوكیشـــی هەرجـــار لێـــی ئەڕوانـــی بەخـــۆیەوت: بەهەر ڕێگـــایەك بێـــت ئەبێـــت هاوســـــەرگیری لەگەڵ لوســـــیاندا بكـــــات، ئەگەر وانەبێ لەخەفەتا ئەمرێت.

بەیـــانی ڕۆژی دواتـــــر جـــاك بـــــانگی لوســــیانی بەڕێـــوبەری كـــارگەكەی كـــرد و پێـــی وت كەوا ڕێكەوتنێكـــی گرنـــگ لەشـــاری بلگـــارد دەكرێـــت و ئەبـــێ یەكێكیـــان بـــڕۆن: هۆكـــارم هەیە وام لێـــدەكات نەڕۆم ئەتوانی لەبری من بڕۆی؟

_ بەوپەڕی ئاسوودەییەوە گەورەم، ئەتەوێ کەی گەشت بکەم؟

_ سبەی، پێنج هەزار فرەنکیشت بۆ تێچووی گەشتەکە پێدەدەم. لەوێش تکایە هەموو ڕۆژێك نامەم بۆبنێرە سەبارەت بەگرێبەستەکە تا ئاگاداربم.

کاتێ جاك تەنیا بوویەوە بەخۆی دەوت: بەلایەنی کەمەوە گەشتەکە دووهەفتەیە، لەم ماوەیەدا چارەی خۆشەویستەکەی لوسیان دەکەم.

ئەگەر لەماری دووریبخاتەوە دوودڵ نابم لەکوشتنی.

قابیلی فەرامۆشکردن نییە یان ژیانی کچەکەم یان ئەوکچە چ باوکێك ڕازی ئەبێ ژیانی کچەکەی بکاتە قوربانی؟!

ئۆڤید ئەبێتە ئەنجامدەری ئەم تاوانە خۆ ئەو لەپێناو پارە هەموو شتێك ئەکات.

دوای ئەوەش لەکوشتنی ئەو کچەوە وەك چۆن من کەوتومەتە چنگی ئاواش ئەو دەکەوێتە چنگی من.

بەدڵخۆشییەوە دەستەکانی لەیەك ناو وەك چۆن خۆی گەرمبکاتەوە دەستەکانی دەجوڵاند.

هەرکە ئێوارە داهات جاك ناردی بەشوێن ئۆڤید و پێی وت کەوا بەنیازی چییە.

لەبارەی خۆشەویستی کچەکەی بۆ لوسیان لابرۆ قسەی بۆدەکرد، وە ڕەتکردنەوەی لوسیان لەپێناو کچە هەژارێك و چۆن لەپێناو دەسبەرداربوونی لەوکچە نیوەی سەروەتەکەی بۆ ڕاخستووە.

وتی: پیاوێکم لەم دنیا بێجگە لەکچەکەم هیچی ترم خۆشناوێت، لەپێناویشیدا هەمووشتێك ئەکەمە قوربانی ناتوانم دەستەوەستان بوەستم و ببینم چۆن هەڵدەوەرێ.

_ ئەبێ چیبکەین؟

_ ئەمەوێ کچەکەم هاوسەرگیری لەگەڵ لوسیاندا بکات.

_ بەڵام کچێکی دیکەی خۆشەوێت.

جارۆد بەشێوەیەکی دڕندانە وتی: کەواتە ئەبێ بیکوژین و لەناوی بەرین.

_ ئەتەوێ من کارەکە بکەم؟

_ بێگومان... پارەت دەدەمێ.

_ کچەکە ناوی چییە؟ ناونیشانەکەشی؟

_ ئەمەیـــان نـــازانم، ئەبـــێ خـــۆت چـــارەی بـــکەی لوســـیانم نـــاردووە بـــۆ بلگـــارد بـــۆ جێبەجێکردنـــی ڕێکەوتنێـــــك بەلایەنـــــی کەمەوە دووهەفـــــتەی پێــــدەچێت. ســــبەی یــــان دووســــبەی دەڕوات و دیاریشــــە کەوا ئەمشــــەو یــــان ســــبەی دەڕوات بۆدیـــدەنی دەزگیـــرانەکەی تامالْئـــاوایی لێبکـــات. ئەگەر هەنگاوەکانیـــت هەبـــێ ئەتـــوانی کـــچەکەش بدۆزیتەوە.

ناونیشانەکەی لوسیانی پێدا.

ئۆڤید بەپێکەنیـنەوە وتـی: ئەتـوانی لەلەنـاوبردنی پشـتم پـێ ببەسـتی. لەبیـری نەکەی کرێیەکـی زۆرم دەوێت.

_ خەمت نەبێ.

ئۆڤید ڕۆشت.

مــــاری هرمــــان لەبەختەوەرتــــین کچەکــــانی ســــەرزەمین بــــوو تەواوی شــــەوەکە بیــــری لەهاوســــەرگیری خــــۆی و لوســــیان دەکــــردەوە ســــەڕەڕای نەخۆشــــییەکەی کەبەرۆکــــی گرتــــووە ژیان بەڕووخسارییەوە دەرەکەوت.

بەڵام هەرکە زانـــی لوســـیان بۆبلگـــارد گەشـــتەکات و بـــۆدوو ســـێ هەفـــتە نـــایەتەوە ڕەنگـــی گـــۆڕا و زەدی لێنیشت.

بەڵام بـــاوکی بـــارودۆخەکەی قۆســـتەوە بەوتنـــی: بۆیەنـــاردوومە بـــۆ بلگـــارد تاهاوبەشـــی مـــن بێـــت. ئەبێ بەتەنها بەرپرسیارێتی هەڵبگرێت.

لەودەمەی نێـــوان گفتوگـــۆی کـــچ وبـــاوك ئۆڤیـــد لەهەمـــــان کـــــات و لەشـــــوێنێکی دیـــــکە بەجلـــوبەرگێکی تەواو جیـــاواز کەناســـینەوەی ئەســـتەم بـــوو لەبەردەم دەرگـــای مـــاڵی لوســـیان وەستابوو.

دوای کاتژمێرێـــــــك لوســـــــیان وەدەرکەوت و ئۆڤیـــــدیش وەدوی کەوت و لەبەردەم خـــــۆیەوە دەیـــوت: تـــۆبڵێی ئەم کـــچە کێبێـــت کەلوســـیان خۆشیەوێت؟

لوسـیان بەرەو ئەوخـانەی لوسـی نشـین بـوو لێـی وەرێـکەوت و سـەرکەوت بەسـەرەوە و ئۆڤیـدیش لەنزیکەوە چاودێری دەکردن.

لوســی بەوپــڕی دڵخۆشــییەوە پێشــوازی لێکــرد و وتــی: درەنــگ کەوتــی لوســیان خەریکبــوو بمــرم لەبرسا.

_ ســـەرەتا ئەبـــێ هەواڵێکـــی گرنگـــت پێبـــدەم هەرچەنە ئەزانم خەمباریش دەبی.

نیگەرانبوو وتی: چ هەواڵێك؟

_ ئەڕۆم بۆبلگارد.

پێکەنـــی و وتـــی: لەهەمـــان کاتـــدا خۆشیشـــە و ناخۆشیشـــە، ناخۆشـــە کەلـــێم دوورەکەویـــتەوە و خۆشیشـە کەبویـت بەجـێگەی متمـانەی بەڕێـز پـۆڵ هرمـــان. لەبەرئەوە ئەم مـــاوەیە ئـــارامم ئەبـــێ و هیچ گلەییەم نابێ.

پێکەنی، وتی: بەڵام من گلەییم هەیە.

_ لەمن؟

_ بەڵکـــــو لەکـــــارەکەم و لەنیـــــتمە زۆر زوو لەخزمەتی بەڕێز پۆڵ هرمان نەمێنم.

لوسی سەرسام بوو وتی: بەڵام بۆ؟

_ هۆکارێکی مەترسیدارە دواتر پێتدەڵێم.

_ ئەی ئێستا بۆنا؟

_ لەبەرئەوەی ئەمەوێ لەبـــارەی شـــتی دیـــکەوە قسەت لەگەڵ بکەم.

دواتـــر بەخێرایـــی ڕێچـــکەی قســـەکانی گـــۆڕی و وتی: هیواداربووم خاتوو لیزا لێرەبوایە.

_ زۆر بەداخەوە، خـــــــاوەن نانەواخـــــــانەکە لەســــــــەرجێگەیە و ئەویـــــــش ناچـــــــارە بەدیارییەوەبێت.

دوو عاشـــقەکە لەم قســـانەدابوون لەدەرگـــادراو دەرگـــاوانی خـــانەکە وەژوورکەوت و لوســـی ئاگـــادارکردەوە کەوا خاتوونێـــك لەبەردەم دەرگـــا چاوەڕوانیەتی.

لوسی بەخێرایی ڕۆشتە خوارەوە و ئەوخاتونەی هاتبوو بۆسەردانی ماری هرمان بوو.

ســڵاویان لەیەکــدی کــرد و مــاری وتــی: لوســی ئەڕۆم لەدارســـتانی بۆلۆنیـــا پیاســـەیەك دەکەم هاوەڵیم دەکەی؟ بەتەنهام.

_ ڕەتــم نەدەکــردەوە بەڵام میــوانێکم هەیە نــاتوانم بەجێی بهێڵم.

_ ئەوەندە ئازیزەلات؟

لوســـی پێکەنـــی وتـــی: نهێنیـــیە، ئەگەر ئەتەوێ بزانـــــی وەرە ســـــەرەوە لەگەڵـــــم دڵنیـــــام سەرسامەبیت.

ئەم وشانە مارییان فزوڵی کرد.

لەگالیســـــــەکەکەی دابەزی و بەپلیکانەکانـــــــدا ســـەرکەوت، ژوورەکەی لوســـی لە نهـــۆمی نـــۆیەم بـــوو پلیکانەکـــانیش زۆر بەرز ســـــەرکەوتن بەســـەریاندا مانـــدووی کـــرد بەڵام ئـــارام بـــوو و بەرگەی گـــــرت لەکۆتایـــدا گەشـــتە ژوورەکەی لوسی.

**لوسی پاڵی بەدەرگاکەوە ناو وتی: فەرموو خانمەکەم وەرە ژوورەوە.**

**ماری چاوی کەوتە سەرلوسیان.... چۆن لوسیان ئەوی دەبینی ئەویش ئەوی دەبینی.... هەردووکیان بەسەرسامییەوە هاواریان لێ بەرزبوویەوە، ماری دەستی لەسەر دڵی ناو سەرسامی دای گرتبوو.**

**لوسی: بێگومان تۆدەیناسی خانمەکەم؟**

**ماری وەڵامی نەدایەوە، وەکو کەڕو لاڵ وابوو ئاوڕی دایەوە بەرەو ڕووی لوسیان و وتی: گەورەم پێشبینیم نەدەکرد لێرە بتبینم!**

**لوسیان وشك و بێدەنگ ببوو وەڵامی نەدەدایەوە، لوسی: ئێمە هاوڕێین خانمەکەم، ڕاهاتبوو هەموو یەکشەمەیەك سەردانم بکات.**

**_ دەمێکە دەیناسی؟**

**_ دوو ساڵە، لەم ماڵەدا نیشتەجێ بوو هاوڕێیەتیەکەمان گۆڕا بۆخۆشەویستی و ئێستا دەزگیرانمە بەمزووانەش هاوسەرگیری دەکەین.**

**لوسیان هەروەستا بوو، دەیزانی هەر وشەیەك کەلەدەمی لوسی دەردەچێت وەکو خنجەرێك وایە بۆ دڵی ماری. بەڵام چی لەدەست دێت. ئەتوانێ چیبکات تاباروردۆخەکە بگۆڕێت؟**

لوسی خۆشەویت نەك ماری... ناشتوانێ فێڵ لەکچێك بکات یان وەکو کاڵایەك دڵی خۆی پێبدات.

لوسی سەرسامبوو کاتێك تێکچوون و زەردی بەڕووخساری مارییەوە بینی، بەوپەڕی سۆزەوە وتی: چیتە خانمەکەم؟ سەرکەوتن بەسەر پلیکانەکاندا ماندووی کردی؟ فەرموو دانیشە.

_ هیچم نییە، مادام ناتوانی هاوەڵیم بکەی دەڕۆم.

دواتر ڕووی وەرگێڕا بەرەو لوسیان و وتی: لوسی پێی وتم لەگەڵیدا سەرکەوم و وتی شتێکی سەرسامکەر دەبینم، بڕوام کرد گەورەم، بەڵام دڵنیام باوکم زیاتر سەرسامتر ئەبێت.

پشتی لێکرد و بەرەو ڕووی دەرگاکە بەڕێکەوت.

لوسی سەرسامبوو بەوەی بینی، لەبارەی تێکچوونی ماری لەخۆیەپرسی و بەنائاسایی دەیبینی.

لوسیان خەمبار و بێتاقەت بوو دەیزانی بەم بارودۆخە کچەکەی ڕەوانەی گۆڕ کردووە.

لوسی: ماری چی بەسەهات والەناکاو گۆڕا؟

_ لەوەیە پلیکانەکان ماندوویان کردبێت.

_ بێچارە، سیل والەناوی ئەبات.

لوسیان بەنهێنی وتی: وا خۆشەویستی لەناوی ئەبات.

## _ ٣ _

ئۆڤیدیش لەلایەکی دیکەوە چاودێری دەکرد تابزانێت کێ دەڕوات و کێ دێت. ماری بینی کەبەسەر پلیکانەکاندا سەرکەوت و دواتر بەڕووخسارێکی جیاواز بەوپەڕی وێرانیەوە گەڕایەوە.

پێی سەیربوو لەخۆیە پرسی ئاخۆ هۆی ئەم سەردانە چیبێت؟ چ پەیوەندییەك لەنێوان ماری هرمان و دەزگیرانی لوسیاندا هەبێت؟

بەرەو دەرگاوانەکە ڕۆشت و لێی پرسی: ئەو خاتوونەی بانگی خاوەن گالیسکەکەی کرد بۆژوورەوە کێبوو؟

_ بەرگدوورە ناوی لوسیە، کچێکی بەڕێزە. ئەگەر هەر نیەتێکت هەیە بگەڕێوە دواوە دەزگیرانی هەیە ناوی لوسیان لابرۆیە.

ئۆڤید هەندێك پرسیاری دیکەی لێکردوو ڕۆشت، بەدەم ڕۆشتنەوە دەیوت: ئەبێت هەواڵی سەردانی ماری بۆلوسی بەجاك بڵێم.

ماری بەخێرایی گەڕایەوە ماڵەوە و ڕۆشت بۆلای باوکی.

سەری هەڵبڕی بەڵام چی بینی ڕەنگی زەرد و پەڕیوی کچەکەی، دەرپەڕی و وتی: کچەکەم.... کچەکە ....کچەکەم! چیتە ئازیزەکەم؟

کەوتە سەریەکێك لەکورسییەکان و بەدەنگێکی لاوازەوە وتی: فێڵی لێکردم، درۆی لەگەڵ کردم... لوسیان منی خۆشناوێت کچێکی دیکەی خۆشەوێت و هاوسەرگیری لەگەڵا دەکات.

_ چۆن زانیت؟ کێ ئەم نهێنیەی پێ وتی؟ بۆیە لێتم شاردەوە ویستم ڕەگی خۆشەویستییەکەی لەدڵ دەربێنم و هاوسەرگیری لەگەڵ تۆبکات، بەڵام کێ ئەم نهێنیەی ئاشکرا کردووە؟

_ ئەو کچەیە، دڵخۆش وگەشاوەیە بەخۆشەویستی لوسیان.

_ کەواتە بینیت کێیە؟

_ بەرگدوورێکە بەناوی لوسی، بینیم لەپەنای لوسیان خەریکبوو لەخەفەتا بمرم بەڵام نازانم چۆن نەمردم.

_ ئەوکـــچەی خۆشـــناوێت هاوســـەرگیری لەگەڵا ناکات.

_ بـۆ درۆت لەگەڵ کــردم بــاوکە؟ بۆڕاســتییەکەت لێ شاردمەوە.

بــاوکی بەدڵێکــی هەزار پــارچەییەوە وتــی: مــاری .... کـچە ئــازیزەکەم..... ئەوەبـزانە کەوا مـن تـۆم خۆشــەوێت، بـێجگە لەوەی نەمەویســت فرمێســك و ئــازار و نــاڵەت نەبینــیم هــیچ شــتێکی دیــکە لەپشت شاردنەوەی نەبووە.

_ مانــــای وایە ئەتزانــــی یەکیکــــی دیــــکەی خۆشەوێ؟

_ خــۆی پێــی وتــم، تکــام لێکــرد بیربکــاتەوە و هاوســــەرگیری لەنێــــوان هەژار و زەنگینێــــك بەراوردبکــــات. درۆم لەگەڵ کـــــردی چـــــونکە دڵنیــــابووم لەبــــردنەوە. بەهەر ڕێگــــایەك بێــــت ناچــارییەکەم لەژیــانی لوســیان بــڕواتە دەرەوە، بەدەســت بەســتراوی دانانیشــم تــاوەکو لەخەفەتــا بتبیــنم، بەمــزووانە کــچەکەم ئەبینــی کەچــۆن ئەچەمێـــتەوە و داوای خۆشەویســـتت لێکـــات. ئەوکات ئەبیت بە بەختەوەرترین ئافرەت.

وتــی: ئەبـمە بەختەوەرتـرین ئــافرەت! خۆشـبەختی خەونێك بوو نەما.

جـاك هەسـتايە سـەرپێو وتـی: بەیـادی دایكـت سوێندت بۆدەخۆم هاوسەرگیری لەگەڵا دەكەی.

_ بـاوكە ئەوەدەكەی تـالەمردن ڕزگـارم بـكەی، ئەوی خۆشـیەوێت و بەسـەر مـنەوە دایناوە كچێكـی هەتیـوی بـێ دایـك و بـاوكە ئەمە لەهەمووی زیاتر داخم پێدەدا؟

_ دڵنیـابە، ئەوی خۆشـناوێت لەوەیە دۆسـتی بێـت و كـاتێ هاوسـەرگیری لەگەڵ تـۆدا دەكـات واز لەوبێنێت.

مـاری گەشـایەوە و وتـی: هـاوار بـۆئەم كـچە! خۆشی لێبردم.

بـاوكی بەپـاڕانەوە وتـی: بەیـادی دایكـت سـوێندم خـواردووە ئەبیـتە ژنـی لوسـیان مەحاڵیشـە سوێندەكەم نەبەمەسەر.

_ ئەی كچەكە؟

_ وازی لێ ئەهێنێ.

_ ئەی ئەگەر واینەكرد؟

_ بەڕێگـایەك دووریەخەمەوە. دەی ئیتـر كـچەكەم بـڕۆرەوە بـۆژوورەكەت تـۆ هەمـووی بۆخـۆم دابنێ.

ماری هێشتا ژوورەکەی جێنەهێشتبوو ئۆڤید وەژوورکەوت.

ئۆڤید هەرچی بینیبوو بۆی گێڕایەوە: هاتووم لەنهێنی ئەوسەردانە سەیرەت لێ بپرسم.

_ کچەکەم هەمووشتێکی پێ وتم. بەرگدوورە، پێشی وتم کەوا بێ دایك و باوکە. چییەکەی ئێستا؟

_ نازانم، بەڵام بەوردی چاودێری لوسی کەم چاودێرییەکی وورد و دواتر پیلانی خۆم دادەنێم، ئەمەش دیارە زۆری تێدەچێ.

_ گوێی مەدەرێ، هەرچەنێك خەرجەدەکەی بیکە، ئەوەی بەلامەوە گرنگە ئەوەیە کچەکەم لەگەڵ لوسیان هاوسەرگیری بکات تەنانەت ئەگەر نیوەی سەروەتەکەشم ببات.

بیست هەزار فرەنکی پیدا و وتی: ئەوە بۆخەرجییەکان، پاداشتەکەشت حەق وحسابێکی ترە.

بەیانییەکەی لوسی و لوسیان لەدەرەوە لەیەکێك لەباخچەکان پیاسەیان دەکرد پێکەوە.

ئێوارەکەی گەڕانەوەماڵەوە و لوسیان چاوی بەژوورە تاریکەکەی لیزا کەوت و وتی: نان فرۆشەکە هێشتا نەگەڕاوەتەوە!

کاتی نانی ئێواره لەدەرگا دراو جان فۆرتییه وەژوورکەوت.

لوسیان لەگەشتەکەی بۆبلگارد ئاگاداری کردەوه و وتی: ئاخۆ خاوەن نانەواخانەکە باشبووه تائاگای لە لووسی بێت کاتێك لێرە نییە؟

جان بەداخەوه وتی: پێم خۆشنییە وادەڵێم، بەڵام ناتوانم بەجێی بهێڵم هەرکات دەرفەتم هەبوو دڵنیابە سەردانی دەکەم.

لوسیان سووپاسی کرد.....

بەیانی ڕۆژی دواتر لەسەر ڕێگابوو بۆبلگارد.

_٤_

ئۆڤید سۆلیفەر پیاوێکی بێ دڵ بوو، لەپێناو بەدەست هێنانی پارە قسووری نەدەکرد لەهیچ بەڵێنی بەجاك دابوو لوسی بکوژێت، سوێندی خواردبوو بەزەیی بەگەنجی و جوانییەکەیدا نەیەتەوه و بیکوژێت.

بەڵام بەبێ چاودێریکردنی و بەبێ ئەوەی بزانێت کەی وەدەرکەوێت لەماڵدا و کەی دەڕوات بۆسەرکار نەیدەتوانی بیکات.

جلـــی کرێکـــاری لەبەرکـــردوو ڕۆشـــت بۆشـــوێنی کـــارەکەی لوســـی و داوای بینینـــی کـــرد، پێیـــان وت هەرگیـــز نـــایتە کـــارگە هەرلەمـــاڵ کارەکـــانی دەکـــات مەگەر پۆشـــاکە دووراوەکـــان تەواوبکـــات ئەوجـــا دێت، وتی: ماڵەکەی لەکوێیە؟

_ لەشـــەقامی بۆربـــۆرن، ئەبیـــنم نامەیەکـــت پێـــیە بۆی؟

_ نـــا، بەڵام خانەدانێـــک ڕایســـپاردووم تـــاوەکو شتێکی پێ بڵێم.

ئەوژنەی ئۆڤیـــد قســـەی لەگەڵ دەکـــرد پێکەنـــی و وتـــی: کەواتە بـــڕۆ بۆمـــاڵەکەی، وامزانـــی کچێکـــی پـــاکیزەیە، کەچـــی لەپشـــتەوە پەیوەنـــدی لەگەڵ خانەدانەکانـــدا هەیە. تکـــایە پێـــی بڵـــێ جـــوان نیـــیە بـــۆی ئیتـــر هەڵمـــان خەڵەتێنـــێ خـــۆی بەکچێکـــی بـــاش پیشان بدات.

کاتێـــک ئۆڤیـــد ڕۆشـــت نـــاوی ژنەکەی لەدەرگـــاوانی کارگە پرسی.

دەرگـــاوانەکە لێـــی ڕوانـــی ..... پـــارچەیەک ئـــاڵتونی پێـــدا وکەوتە قســـە: نـــاوی ئامانـــدایە، نەیخەیـــتە سەرخۆت تێچووی زۆرە.

_ نا بۆحسابی یەکێک لەخانەدانەکانە.

_ ئەبێ خۆی بۆئامادەبکات هەرچی بوێت دەیبات.

_ زۆر دەوڵەمەندە گوێ بەخەرجی نادات.

ئێوارەکەی کاتێك ئاماندا بەنیازبوو کارگە بەجێبهێڵێت دەرگاوانەکە هەمووی بۆگێڕایەوە: کەوایە چاوەڕێی هاوڕێیەکی نوێ بین.

ئاماندا پێکەنی و وتی: وەسفی منت کرد لای.

_ هەموو وەسفێك.

_ باشە، بزانە چییەوێت، گیرفانت پڕدەکەم لەپارە.

ئاماندا هێشتا دوورنەکەوتبووە لەکارگە هەستی کرد یەکێك وەدووی کەوتووە.

گومانی ئەوەی نەدەکرد وەدووکەوتووەکە هەمان پیاوەخانەدانەکەیە کەلەگەڵ دەرگاوانەکە قسەیان لەسەر کردووە.

ئاماندا بەردەوام بوو لەڕۆشتن هەتا پیاوەکە پێی گەشت.

پیاوێکی پەنجا ساڵەی لێ تاین بوو، بەڵام ڕووکار و جلێکی خانەدانانەی لەبەربوو، ڕوویەکی دەوڵەمەندانە لەسەر ڕووخساری دەرەکەوت.

ئەم پیاوەش بێجگە لەئۆڤیدی خۆگۆڕیو کەسی ترنەبوو.

سڵاویان لەیەکدی کرد و دواتر وتی: بەڵام پێشتر شەرەفی ناسینتم نەبووە؟

بەڕێزەوەوە وەڵامی دایەوە و دواتر وتی: لەبەرئەوەی سەرسامبووەکانت زۆرن و ئەستەمە هەموویان بناسیتەوە.

وەڵامەکەی زەردەخەنەی لەسەر ڕووخساری دروستکرد، وتی: هەر ئەم زەردەخەنەیە هەرخۆی کارتێکە و پێت بەخشیم. ئێستاکە بووین بەهاوڕێ ڕێگەم پێی ئەدەی بانگهێشتی خوانێکت بکەم؟

دوای چارەکە کاتژمێرێك لەچێشتخانەیەکی ڕاقی دانیشتبوون نانی ئێوارەیان دەخوارد.

کاتێك تەواوبوون گالیسکەیەکیان بەکرێ گرتوو ئۆڤید فەرمانی بەشۆفێرەکە کرد بڕۆن بۆ ماڵەکەی ئاماندا.

لەبەردەم دەرگا بەدەم ماڵئاواییەوە وتی: سبەی یەکتر ئەبینین.

_ لەکوێ؟

_ نیــوەڕۆ، لەوچێشــتخانەی هەمیشــە نــانی لــێ دەخۆی.

_ کەواتە ئەزانی؟

_ هەموو شتێکت دەزانم.

نیــوەڕۆی ڕۆژی دواتــر چاویــان بەیەکــدی کەوت و ئامانــدا وتــی: ئەبــی زوو نــانەکەم بخــۆم، دەڕۆم بــۆلای یەکێــك لەکرێکارەکــان تــاجلێکی ســەمای لەگەڵ ئامادەبکەم.

_ دوورە ماڵەکەی؟

_ لەشەقامی بۆربۆرنە.

دەیزانی دەچێت بۆلای لووسی.

لەڕێگایــــان بەرەو شــــەقامی بۆربــــۆرن بــــۆی دەرکەوت کە ئەوجـلانە بـۆ کـارین دی لـومبی ژنــی پارێزگــــارە کەبــــانگکراوە بۆئــــاهەنگی ســــاڵانە کەژنی بەڕێوبەری ناوچەی سین ڕێکی دەخا.

ئۆڤیــد: ئەی خــــاتوو ئۆگســــتین بــــۆچی نایبــــات بۆیەکێکی تر؟

_ لەبەرئەوەی لوســـی بەخێرایــــی تەواویــــدەکات، وێنــــای دەکــــات ســــبەی تەواویبکــــات و بینێرێــــت بۆکارین دی لومب بۆتاقیکردنەوە.

_ بەڵام شوێنێکی دوورە؟

_ پیاسەیەکی نـاوازەیە بەشـەمەندەفەر، کـاتێ لەشـەمەندەفەر دائەبەزی دارسـتانەکە دەبـڕی، بەس ئاوانارۆم، بەڕۆژ لەناوازەترین پیاسەکانە.

ئەم خـاتوونە کەشـخەیە جارێکیـان تاکـاتژمێر دە من و لوسی هێشتەوە.

ئۆڤید پێکەنـی و وتـی: بێگومـان تـرس داگیـری کردوون.

_ ئەگەر لەشـوێنی ئـیمە بویتـایە لەترسا ئەمـردی، ڕێگاکەی زۆر تاریکە.

گالیسـکەکە لەبەردەم مـاڵی لوسـی گیرسـایەوە و ئامانـدا ڕۆشـتە سـەرەوە بـۆلای لوسـی ئۆڤیـدیش لەگالیسەکەکە چاوەڕوانی گەڕانەوەی بوو.

دوای نیـو کـاتژمێر ئامانـدا گەڕایەوە بۆسـەر کـارەکەی دوای ئەوەی ئۆڤیـد بەڵێنـی لێـوەرگرت بۆنانی ئێوارە یەکدی ببینن.

لوسیان لەڕێگایـدا بۆبلگـارد هەتـا جارێـك بیـری لەدەزگیـرانەکەی دەکـردەوە دەجـار وێـنەی مـاری هرمـانی بەسـتەم لێکـراوی و خـوێن هەڵهێناوییەوە هاتە پێش چاو.

ڕۆژەکانی لەسەر زەوی دیاریکراون، هیوادارە ئەگەر ڕۆژێکیشی مابێت لەژیان تەنها بۆجارێکیش بێت خۆشەویستی بەختەوەری بکات.

هەرکات بیری لێدەکردەوە دڵ تەنگ دەبوو چاوی پڕ ئاودەبوو.

بەخۆی دەوت: ئەم کچە لەگوێی گۆڕە، بۆچی لەو ماوە کورتەی ماویەتی سۆز و خۆشەویستی بۆدەرنەبڕم، هەرکات گەڕامەوە پاریس بە لوسی ئەڵێم.

کاتێك یەکەم نامەی نارد بۆپۆڵ هرمان دوو دێڕ دەربارەی ماری دوا (( باشترین هیوامی پێ بگەیەنە، ئەوەی لەنێوانیاندا ڕوویداوە هەرگیز لەبیری ناکات و مەحاڵە ئەوە لەبیربکات کەبەهۆی ئەوەوە ئەم پۆستەی وەچنگ کەوتووە)).

هەرکە جاك نامەکەی خوێندەوە لەخۆشیدا خۆی بەزەویەوە نەدەگرت و بێ یەك و دوو ڕۆشت بۆلای ماری پێی وت: بینیت؟ ئەوەتا خۆشیەوێیت.

ماری بەداخەوە وتی: پێت وایە باوکە؟ لەنامەکە بێجگە لەبارەی فەزڵەوە لەبارەی هیچی ترەو

نەدواوە، وشـــەی جیـــاوازم ئەوێـــت، لەبـــارەی خۆشەویستییەوە نەك چاكە.

مـــاری بەردەوام بـــوو: خـــۆت هەڵمەخەڵەتێـــنە باوكە.

جـاك بەخـۆی دەوت: لەوەیە ڕاسـت بكـات، چـاكە وایلێكـــــردووە ئەم وشـــــانە دەرببڕێـــــت نەك خۆشەویستی.

بەڵام ئەبـــێ هەر كۆیـــان بـــكەمەوە لەیەك، هەرئەبێ لوسی لابەم لەسەر ڕێگایان.

لەكتێبخـــانەكەی دانیشـــت و نـــامەی بۆلوســـیان دەنووســـــی: (( مـــــاری زۆر نەخۆشــــــە، خۆشەویســـتی تـــاكە چارەســـەرییەتی، وەكـــو ئەوەشـــی ئاگـاداری بەدەسـتی تـۆیە. ڕێـگەئەدەی بمرێ؟

بەیـانی ڕۆژی دواتـر ئۆڤیـد گەشـتی كـرد بۆكـارین دی لومـــب لەوێســـتگەكەوە بۆمـــاڵی پارێزگـــا بەڕێكەوت.

دەووروپشـتی مـاڵەكەی كـرد هەروەك ئامانـدا پـێ وت دارســـتانەكە بەڕۆژا كەم كەس نەبـــن ئەگینـــا كەس پیایـــا تـــێ نـــاپەڕێ چ بگـــاتە شـــەو. لەبەرخـــۆیەوە دەیـــوت: دوای ئەوەی لوســـی

لەماڵی پارێزگا دەگەڕێتەوە لەدارستانەکە خۆم مەڵاس دەدەم و ئەبمە قوربانی.

هەرئەوەنەی لەکارین دی لومب گەڕایەوە بەهەڵپە هەڵپ بۆلای جاك ڕۆشت و وتی: کاتیەتی.

جاك دەیزانی ئەم وشەیە ئاماژە بەچی دەکات، وتی: بەڕاستی کاتی زەبرلێدان هاتووە؟

_ بێگومان.

لێکۆڵینەوە و گەڕانەکانی و چۆن یەکێك لەهاوکارەکانی لوسی ناسیوە و خۆی بەناوی بارۆن ئارنۆڵد دی لوویس ناساندووە و لەوەوە زانیاری گرنگی بۆ کارەکەی وەچنگ خستووە گێڕایەوە.

_ سبەینێ ئەبێ تانیوە شەو لەکارگە بمێنیتەوە، ڕۆژەکەی دێم بۆسەردانت و تانیوە شەو لەکتێبخانەکەت دەمێنینەوە بەڵام ئێوارەکەی بەدزییەوە بۆی دەردەچم و کارەکە جێبەجێدەکەم بەبێ ئەوەی کەس هەست بکات و بەم شێوەیە بەئاسانی پەردەپۆش دەکرێت.

_ زۆریش پەردەپۆش.

_ باشە، ئامادەکارییەکانم بۆئەوەیە گومان لەسەر خۆم لابەم، ئەگەر خوانەکردە گومانم

لێکــرا ئەیســـەلمێنم کەوا لەگەڵ تۆبـــووم مەحـــاڵە گومـــان لەگەواهـــی پیـــاوە بازرگـــانی گەورە پـــۆڵ هرمان بکەن.

جـــارۆد پێکەنـــی و وتـــی: کەوایە ســـبەی لوســـی دەمرێت؟

_ دواتـــر لوســـیان هیچـــی بۆنـــامێنێتەوە جـــگە لەوەی روو لەکچەکەی تۆبکات.

کـــاتژمێر پێنجـــی ئێـــوارەی ڕۆژی دواتـــر ئۆڤیـــد لەشـــەقامی بەرامـــبەر کـــارگەکەی ئامانـــدا چـــاوەڕێی دەرچوونی دەکرد.

ئامانـــدا: بـــارۆن ئارنۆڵـــد دەڕۆم بـــۆ دیـــدەنی لوســـی لەبۆربۆرن.

_ کەواتە منیش لەگەڵت دێم.

بانگی ئەوگالیسکەیەی کرد کەبەکرێی گرتبوو.

ئێستاش هەنگاوێ بۆدواوەوە.

کاتێـــك لوســـی لەمـــاڵی پارێزگـــاوە گەڕایەوە بـــۆ وێســـتگەی کـــارین دی کولومـــب چـــاوی بەجـــان کەوت.

هەردوکیان سەرسامبوون بەم ڕێکەوتە.

جـــان لێـــی پرســـی کەوا چـــی ئەوی هێنـــاوە بـــۆئەم شـــوێنە دوورە، لوســـی بـــۆیگێڕایەوە و وتـــی: ئەی تۆ؟ چی تۆی هێناوە بۆکارین دی کولومب؟

_ هاتم تاوەکو بانگی دایکی نانەواخانەکە بکەم.

_ چییەتی؟ لەسەرە مەرگدایە؟

_ بەڵـــێ، هەســـتی کـــرد لەســـەرە مەرگـــدایە ویســـتی دایکـــی ببینـــت بـــۆ کۆتاجـــار، ســـاڵێکە بەهـــۆی زاواکەیەوە کـــــچەکەی نەبینیـــــوە و ســـــوێندی خـــواردووە ســـەردانیان نەکـــات بەڵام لێیەپـــاڕێمەوە بەشـــکوم ئەم ڕق وکیـــنەیە لابـــات بـــۆ کۆتاجـــار ماڵئاوایی لەکچەکەی بکات.

_ حەزمـــــدەکرد لەگەڵتـــبم خـــاتوو بیـــرین، بەڵام ناچـــارم بـــــڕۆمەوە مـــــاڵەوە و ئەم پۆشـــــاکانە چـــاکبکەمەوە، جـــارێکی دیـــکە کـــاتژمێر نـــۆ بیگەڕێـــنمەوە بـــۆ خـــاوەنەکەی، تەوقەیـــان کـــردوو هەریەکەیان ڕێگای خۆیان بڕی.

کـــاتێ جـــان فـــۆرتییە ڕۆشـــت بۆمـــاڵی دایکـــی خـــاوەن نانەواخـــانەکە بینـــی کـــارەکەی هـــیچ ئاســـان نیـــیە وەك بیری لێدەکردەوە.

داوای لەدایکـــی کـــچەکە کـــرد بچێـــت بـــۆبیننی کـــچەکەی کەلەســـەرە مەرگـــدایە. بەتـــووڕەییەوە وەڵامـــی دایەوە و وتـــی: پیـــاوەکەی ئیهـــانەم دەکـــات

و لەماڵەکەی دەرمەدەکات، بگەڕێمەوە بۆ ئەوماڵە بۆ ئەوەی داوای لێبوردنم لێبکات، پێم باشترە کچەکەم بمرێت بەبێ ئەوەی ببینم وەك لەوەی بەبێ نامەی داوای لێبوردنی پیاوەکەی بڕۆم بۆماڵەکەی.

جان هەرچەند لێی پاڕایەوە هیچ سوودی نەبوو لەم گوێی دەڕۆشت و لەوگوێی دەردەچوو.

گەڕایەوە بۆلای خاوەن کارەکەی و بۆیگێڕایەوە، ژنە بێچارە دەستی کرد بەگریان و بەناڵە ناڵەوە دەیوت: خوایە! یانی بەبێ ئەوەی دایکم ببینم بۆکۆتاجار ئەبی ئەم دوونیایە بەجێبهێڵم؟

هەمان ڕۆژ کاتژمێر شەش ئۆڤید بەڕێکەوت بۆ کارگەکەی جاك. دانیشتن لە کتێبخانەکەی و جاك بانگی خزمەتکارەکەی کرد و وتی:ئەمشەو سەرقاڵم، تانیوەشەو لێرە ئەمێنەوە و لەگەڵ ئەم بەڕێزی ئەندازیارە کارمان هەیە، ئەگەر هەرکات کاتی ڕۆشتنت هات گوێ مەدەبەمن بۆخۆت بڕۆ.

دەرگای کتێبخانەکەی گرت و ئۆڤید چەقۆیەکی دەرکرد، پێکەنی و وتی: کاتێ چاوەڕێی ئاماندام دەکرد ئەمەم لە دووکانی نهۆمی خوارەوەی ژوورەکەی لوسی کڕی.

**جاك تۆقا و وتی: چەقۆیەكی ترسناكە.**

**_ ژیـانی كـچەكەت بەمەوە بەنـدە، لەهەمـان كاتـدا چەقۆی ژیان و مردنە.**

**_ جا ئەمشەو لوسی دەڕوات بۆماڵی پارێزگا؟**

**_ بەڵێ كاتژمێر نۆ دڵنیابە.**

**كاتێـك مێـردی نانەواخـانەكە ئێـوارەكەی گەڕایەوە مـاڵەوە زانـی چـی لەنێـوان جـان و خەسـوویدا ڕوویـداوە توڕەبـوو: بەنەفـرەت بێـت! كـچەكەی لەسەرەمەرگە و نایەوێ بێت بۆ ماڵئاوایكردنی.**

**جـان كەوتە دەسـت و پێـی و لێـی پـاڕایەوە تـاوەكو نـامەیەكی لێبـووردن بۆخەسـووی بنوسـێت وتـی: تـۆئەم كـارە لەپێنـاو ئەوژنە دەكەی كەخۆشـت دەوێ، نەك لەبەر خەسـوت. ئەتەوێ ژنەكەت لەكۆتـا سـاتەكانی تەمەنیـدا لەبەزەیتـرین ژنەكـان بێت؟**

**پیـاوەكە یەك سـاتیش دوودڵ نەبـوو، خـامە و كـاغەزی هەڵگـرت و نـامەیەكی لێبـووردنی بۆخەسووی نووسی تاسەردانی كچەكەی بكات.**

**جـان فـۆرتییە بەپەلە پەل و ڕاكە ڕاك هەتـا كـارین دی كولومـب نەوەسـتا و كـانژمێر دەی ئێـوارە گەشت.**

خەسووەکە کەنامەکەی بینی وتی: چاوەڕێکە تاجلەکانم لەبەردەکەم دێم لەگەڵتا.

لەودەمەشدا لوسیش لەکارین دی کولومب بوو مژوڵی جلەکانی ژنی پارێزگاربوو، هەرکە کارەکەی تەواوکرد بەوڕێگا تاریکە گەڕایەوە بۆ وێستگەی کارین دی کولومب.

لەوێش لەدارستانە تاریکەکە ئۆڤید و چەقۆ تیژەکەی لەچاوەڕوانی لوسیدا بوون.

چەقۆیەکی چەقاندە سکی لوسی و قیژەی لەناو دارسانەکە بەرزبوویەوە.....

بەڵام ئەم ئۆڤیدە بێ بەزەییە هیچ بەزەیی بەم بێچارە و داماوە نەهاتەوە و چەقۆیەکەی دەرکرد و جارێکی تر چەقاندییە سەر سنگیدا.

چەقۆکە شکا، و گومانی نەبوو لەوەی یەکەم لێدان لەناوی بردووە.

کاتژمێر و ملوانکەکەی دزی و بەخۆی دەوت: بادزی لێبکەم تاوابزانن ڕێگر ودز وایلێکردووە و دزی لەپشت کوشتنی بووە.

کاتژمێرەکەی لەباخەڵی نەنابوو هێشتا گوێی لەدەنگی خشەخشی پێبوو بەپەلە خۆی خزاندە ناو تاریکیەکە.

خشەخشی پێی دووژن بوون، دەنگی قیژەکەیان گوێ لێبووە و خێرا هاتوون بەتەنگ دەنگەکەوە.

یەکێك لەژنەکان هاواری کرد: ئەوەتا سەیرکە سەیری ئەوپیاوە ڕاکات.

ئەودیکەیان وتی: تۆبڵێی چیکردبێت.

سەیری ئەملا وئەولایان کرد و لوسی یان بینی لەسەر زەوییەکە کەوتووە و خوێنێکی زۆری لەبەر دەڕوات.

دوو ژنەکە چەمینەوە سەر بریندارەکە دواتر یەکێکیان هاواری کرد وتی: ئەی هاوار خۆ ئەوە لوسیە!

ئەم دووژنە بێجگە لەجان و دایکی خاوەن نانەواخانەکە کەسی ترنەبوون.

جان فۆرتییە کەوتە سەر لوسی و وتی: خوایە! ئەو هیچ وپووچە کوشتویەتی، هێشتا دڵی لێدەدا ڕاکە بابڕۆین بۆبنکەی پۆلیس و دکتۆر بێنە لێرە ئەمێنمەوە.

_ تۆ دەیناسی کەواتە؟

_ بەڵێ دراوسێمە.

دوای نیــو کـــاتژمێر پیـــاوانی پــۆلیس ڕژانە ســـەر لوســـی وگواســـتیانەوە بــۆبنکە و پۆلیســـی لێکـــۆڵەر دەستیان کرد بەپشکنین.

ئەو دکتـــۆرەی کەهێنابوویـــان وتـــی: بـــرینەکە زۆر قـــوڵ ومەترســـیدارە، هیـــوادارم بکوژنەبێـــت. باشـــە چەقۆکە نەگەشتۆتە سییەکانی.

جەنـــابی لێکـــۆڵەر: ئەم برینـــدارە بگـــوازینەوە بۆکوێ لەم لادێیە خەستەخانەی لێ نییە؟

دکتـــۆرەکە: ئەتـــوانم لەشـــوێنەکەی خـــۆم ژوورێکـــی بـــۆدابین بـــکەم و چـــاودێری بـــکەم ئەم ئـــافرەتەش ( دەســـتی بۆجـــان ڕاکێشـــا)، لێرەبێـــت، وەکـــو ئەبیـــنم دیارە هاوڕێیەتی.

جـــان: شـــەو وڕۆژ خزمەتـــی دەکەم گەورەم دکتـــۆر، لێتەپاڕێمەوە ڕزگاری بکە.

_ هیـــــوادارم گەنجێتـــــیەکەی ببێـــــتە هـــــۆیەك کە لەمردن دووریبخاتەوە.

لێکـــۆڵەرەکە ڕاپـــۆرتێکی لەســـــەر ڕووداوەکە داو ڕای خـــۆی لەســـــەر ئەوەدا کە تـــاوانەکە پـــاڵنەری دزی بووە.

لە ڕووداوانەدا ســـۆلیفەر بەدزیـــیەوە لەدەرگـــای پشـــتەوە بەبـــێ ئەوەی کەس بیبینێـــت دزەی کـــردە

ناوکارگەکە و ڕۆشت بۆئەو نوسینگەیەی کەجاك چاوەڕێی دەکرد.

ئۆڤید: تەواوبوو.

جاك وەکو سوپاسگوزارییەك چاوی بڕییە ئاسمان.

ئۆڤید بەخێرایی جلە لادێیەکانی داکەند و ئەوجلانەی کەلای جاك دانابوو لەبەری کرد و وتی: ئێستاش پێکەوە وەك بلێی شەومان بەگفتوگۆوە بەسەربردێت دەڕۆینە دەرەوە.

دوای چەند ساتێك لەکارگە ڕۆشتن و دەرگاکەیان داخست و بانگی یەکێك لەگالیسکەکانی کرد.

سەحەری ڕۆژی دواتر پیاوانی پۆلیس پشکنینی دارستانەکەیان گرتە ئەستۆ بەڵام هیچی وایان وەچنگ نەکەوت.

نیوەڕۆکەی لوسی هاتەوە هۆش خۆی وکاتێك جان ی بینی بەسەر سەرییەوە وەستاوە چاوی شوکرانەی بەرزکردەوە.

لێکۆڵەرەکە هەلەکەی قۆستەوە و دەستی کرد بەپرسیارکردن لێی بەڵام هیچی نوێیان دەسنەکەوت، بەڵێ ڕاستیان دەکرد تاوانەکە بەهۆی دزییەوە بوو کیسێك پارەی سی فرانکی

و کــــــاتژمێرێکی ئـــــاڵتوونی و ملوانکەکەیـــــان لێدزیبوو.

ڕووخســـاری بکـــوژەکەی نەبینیـــوە وگومـــانی لەهیچ کەس نییە و دووژمنیشی نییە.

ژمـــارەی کـــاتژمێر؟ نـــا..... ژمـــارەی بیـــرنییە، لوسیانی دەزگیرانی بەهەدییە پێیداوە.

جـــارێکی دیـــکە دکتـــۆر هـــات بـــۆ پرســـیارکردن: بـــــرینەکەت زۆر مەترســـــیدار نیـــــیە کــــچەکەم، ئەمشـــەو جـــارێکی دیـــکە بـــۆتی دەرمـــان دەکەم و دواتـــر هەرکـــات ویســـتت دەتـــوانی بگەڕێیـــتەوە ماڵەوە.

لوســـی: لیـــزا بیـــرین... لەگەڵـــم دەمێنیـــتەوە.... وایە؟

_ بـۆدڵم ڕێـگەم پێـدەدات بەجێـت بهـێڵم ئـازیزەکەم؟ بەڵام کاتژمێرێـــك لێـــرە نـــابم دەڕۆم تـــاله خـــاوەن نانەواخانەکە دڵێنابېمەوە و دەگەڕێمەوە بۆلات.

جـــان بەڕێـــکەوت بـــۆلای نانەواخـــانەکە وچـــاوی بەمێـــردی خـــاوەن نانەواخـــانەکە کەوت، بەقـــووڵی دەگریا دەیزانی کارەسات قەوماوە.

لەلایەکـــــی دیکەشـــــەوە خـــــاتوو ئۆگســـــتین لەنیگەرانیـدا نقـووم ببـوو، لوسـی بەپۆشـاکی ژنـی پارێزگاوە ڕۆشتووە و نەگەڕاوەتەوە.

بەئامانـــدای وت تـــالێی بکـــۆڵێتەوە، گەشـــتە کـــارگە و لەودەمەی وەدەرکەوت ئۆڤێـــــد واتە ئاڕنۆڵـــــد دی لـــویس ی لەبەردەمـــدا دەرکەوت و هـــاوەڵی کـــرد تامالّەکەی لوسی.

دەرگـــاوانەکە بەمانـــدای وت لوســـی لەوکـــاتەوەی دەرچـــووە نەگەڕاوەتەوە ئامانـــدایش بەهەڵـــپە هەڵـــــــپ بەهەوالّەوە گەڕایەوە بـــــــۆلای ســـــەرۆکەکەی. ئۆڤێـــــد دڵنیـــــای کـــــردەو کەواڕێگرەکـــان لەناویـــان بـــردووە ئەگەر وانەبـــوایە ئێســـتا پـــۆلیس هـــاتبوون بۆنشـــینەکەی مـــادام دەریـــــش نەکەوتـــون دیـــــارە ناســـــنەمەکەیان نەزانیوە.

_ ٥_

دکتـــۆر مـــۆڵەتی پێـــدان ئێـــوارەکەی دەتـــوانن لوســـی بـــبەنەوە مـــالّەوە، بەڵام کـــاتێ دووبـــارە گەڕایەوە تـــــایەکی زۆری چـــــاوەڕواننەکراوی لێهـــــاتبوو نەیەویست تاتاکەی مابێ بیگوازنەوە.

جـــان فـــۆرتییە لەپـــاریس گەڕابـــوویەوە و ڕۆژی لای لوسی کردەوە.

لوســـی بەدەنگێکـــی لەرزۆکەوە وتـــی: چـــاوەڕێی نـــامەم لەلوســـیانەوە تکـــایە هەرنـــامەیەك بەنـــاوی

منەوە هاتووە بۆماڵەکەم بۆم بێنە... پەیوەندیش بکە بەخاتوو ئۆگستین و ئاگاداری بکەرەوە لەڕووداوەکە.

جەنابی لێکۆڵەر: بەپێویستی دەزانم بابەتەکەی لێ بشاریتەوە پێی مەڵی چەقۆی لیدراوە هەر ڕووداوێك دەتەوێ پێی بڵێ.

جان بەڕێکەوت بۆپاریس و بەدەرگاوانەکەی وت کەوا لەسەر ڕێگا تووشی تەشەنوجاتی قاچ بووە و ئێستا لەماڵی هاوڕێیەکیەتی و دوای چەند ڕۆژێك دەگەڕێتەوە.

هەمان هۆکاریشی بەخاتوو ئۆگستین وت.

بەیانی ڕۆژی دواتر بەدوونامەوە کەنێردرابوو بۆلوسی گەڕایەوە بۆکارین دی کولومب. هەردوونامەکە لەلایەن لوسیانەوەبوو لەبەرئەوەی وەڵامی یەکەم نامەی نەدابوویەوە نامەی دووەمی بۆناردبوو.

لوسی: ئەبی نامەیەکی بۆبنووسم، ئەگەر بەخەتی یەکێکی دیکە ببینی نامەم بۆناردووە بێزارئەبێت.

زۆری لەخۆیکرد و لەسەرپشت بەڕاکشاوی نامەی بۆنووسی پێشی وت کەواچی بەسەرهاتووە وتی: (( بەڵگەش بۆئەوەی

کەبـــرینەکەم ســـووکە ئەوەیە خـــۆم ئەم نـــامەم بۆنووسیویت)).

لەهەمـان ئەوکـاتەی کەلوسـی لەخۆشـی کەیفـدابوو بەهـــۆی نـــامەی لووســـیانی دەزگیرانـــی ئامانـــدا نـــامەیەکی لەئۆڤیـــدەوە پێگەشـــت بـــوو تیایـــدا ئاشـکرای کردبـوو کەوا گەشـتێکی بۆهـاتۆتە پـێش و درێـــــژەش دەکێشـــــێ. بەهەزار فـــــرەنکەوە ماڵئاوایی لەئاماندا کرد.

ئامانـــداش لەئەزمـــوونی پێشـــووترییەوە زانـــی ئەم گەشتە هیچ نییە جگە لەبیانویەك.

بەداخ بـوو ئەیویســـت پـارەیەکی زیـاتر لەبـارۆن بکێشێ.

ئۆڤیـد چیتـر پێویسـتی بەئامانـدانەبوو، بـۆئەوەی زانیـاری کۆبکـاتەوە لەسـەر لوسـی بـۆیە خـۆی لـێ نزیـك کردبـۆوە، کوشـتنی لوسـی ئیتـر هۆکـارێکی ترنـەمـــاوە تاپەیوەنـــدییەکەی لەگەڵـــی بەردەوام بێت.

کـاتێ لوسـیان نـامەکەی لوسـی پێگەشـت شـێت بـوو ئەیویســـــت گەشـــــتەکەی کۆتـــایی پێبینــــت و بگەڕێتەوە بۆپاریس.

بەڵام نەیـــدەتوانی بـــابەتەکە تەنهـــا تـــایبەت نیـــیە بەوەوە بـــێ ئەقڵیـــیە ئەم ڕێکەوتـــن و ســـازانە

بەنیوە چڵی بەجێبهێڵێت و خیانەت لەئامانتی جاك بكات و بگەڕێتەوە تەنها لەبەرئەوەی دەزگیرانەكەی نەخۆشە.

ماریش، گومان لەوەدانەبوو بەهۆی جودایی لوسیانەوە دەیناڵاند ڕەنگی زیاتر زەردهەڵگەڕاوەتر ببوو.

ئەگەر لوسی بمرێت لوسیان هیچی لەبەردەم نامێنێتەوە جگە لەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ ماری بكات.

ڕۆژێكیان جاك دانیشتبوو لەگەڵ ماری مژووڵی قسەكردن بوو خزمەتكارەكە خۆی كرد بەژوورا و وتی لوسی بەرگدوور بەپۆشاكی نوێوە وەستاوە ڕووخسەتی هاتنەژوورەوەی ئەوێت.

جاك دەرپەڕی و وەستا وتی: لوسی! لوسی لێرەیە؟

ماری دركی بەڕاستی نهێنی كاردانەوەكەی باوكی نەدەكرد، وایدەزانی لەبەرئەوەیە كەدەزگیرانی لوسییە. وتی: ئارام بەرەوە باوكە، بەخێرهاتنی ناكەم.

جاك هاتەوە سەرخۆی و وتی: ئەمە چۆن؟ ئۆڤید فێڵی لێنەكردبێتم و پارەكەی بردبێتم؟ ئەی نەیوت كچەكەی كوشتووە؟

ڕووی لەکچەکەی کردو وتی: بەبێ ویست تووڕەیی کاردانەوەکانی زیاتر کردم، بەڵام پێویست ناکات دەرگاکەت بەڕوویدا دابخەی تاوانی نییە، و جوان نییە خۆمان بخەینە ئاستی.

_ پێکات گەورەم.

فەرمانی بەخزمەتکارەکەی کرد وەژووری بکات.

لوسی بەهەنگاوی خاو و لەسەرخۆ وەژوورکەوت... ڕەنگ زەرد. وتی: خانمەکەم ببورە چەند ڕۆژێکیش دواکەوت دزێکم لێ تاین بوو و چەقۆی لێدام هەرکە چاکبوومەوە پۆشاکەکانم بۆهێنای.

ماری: بۆچی بەچەقۆ لێیدای؟

_ لەپێناو دزیکردن.

بۆیگێڕایەوە کەوا چیبووە و جاك بەوردی گوێی بوڕاگرتبوو و لێی پرسی: کەواتە دزبووە؟ ناسیت؟

_ نا، گەورەم.

لەپڕ چاوی جاك لەسەر لوسی جێگیربوو!

چەند سەیرە ئەم ڕووخسارەی بیرە.... ئەم ڕووکارە تەنانەت دەنگیشی.

لەژنێك دەچێت لەكۆند ناسیوێتی.

وێنـــای لەبەرچـــاوبوو. بەخـــۆیەوت: اەەەە، لەجـــان فۆرتییە دەچێت.

لەوســـاتەدا بیـــری كەوتـــووە خـــۆئەم كـــچە لەیەكێـــك لە خانەكـــانی بێسەرپەرشـــتان گەورەبـــووە: خـــوایە! تۆبڵێی كچی جان بێت؟!

كاتێـــك لوســـی كـــاری نەمـــا، مـــاری وتـــی: باشـــە، پۆشـــەكەكان لێـــرە دابنـــێ ئێســـت تـــاقی نـــاكەمەوە. ئەگەر هەرشتێكیشـــت ویســـت یاخـــاتوو ئۆگســـتین یان ئاماندا ئاگاداربكەرەوە تابێن بۆلام.

لوســـی بەدەم پرســـیاركردن لەخـــۆی كەئـــاخۆ ئەم تـــووڕەییەی مـــاری و ســـاردییەی لەچیبێـــت وخـــۆ تائێســـــتا هـــــیچ خـــــراپەی بۆنەبـــــووە ژوورەكەی چۆڵكرد.

ئێـــوارەی هەمـــان ڕۆژ جـــاك بـــانگی ئۆڤیـــدی كـــرد و هەركەهـــات بـــێ یەك و دوو وتـــی: ئەمـــڕۆ لوســـیم بینی؟

ئۆڤیـــد هەســـتایە ســـەرپێی وهـــاواری لـــێ هەســـتا: چییەڵێ؟! لوسی!

_ بەڵێ! زیندووە..... لێدانی بكوژانەنەبوو.

بۆیگێڕایەوە چیبووە.

ئۆڤید: چ بەختێکی ڕەشە، باشە بەسنییە ڕووخسارمی نەبینی و پۆلیس وائەزانێ لەبەردزی بووە.

دوای بێدەنگییەکی کورت ئۆڤید وتی: کەواتە ئەبێ جارێکی تر هەوڵ بەمەوە.

_ ئەگەر وابکەین زیاتر مەترسیدارتر ئەبێت گومانمان زیاتر ئەبێت خۆنابێ کچێك لەدەڕۆژدا دووجار تووشی قۆڵبڕببێت.

_ کەواتە ئەکشێیتەوە؟

_ چۆن وابکەم لەکاتێکدا ژیانی کچەکەم بەهاوسەرگیری لوسیانەوە بەندە؟

_ ئەی فەرمان بەچییەکەی؟

_ لوسی هەتیووە، ساڵی ١٨٦١ بۆ١٨٦٢ نێردراوە بۆخانەی بێسەرپەرشتان بەژمارە نۆ تۆمارکراوە ئەمەوێ هەموو داتا و تۆمارێکی ئەوبزانم تەنانەت ئەگەر پێویست بەدزینیشی بکات.

_ سوودی چییە؟

_ ئەمڕۆ بۆیەکەم جار لوسیم بینی ئەزانی زۆر لەجان فۆرتییە دەچێت، ئۆڤید شپرزەبوو وتی: مەبەستتت لەو.....

_ بەڵێ، بەئەگەری زۆرەوە کچی ئەوە، هەمان تەمەن و هەمان لەیەك چوون، وەکو کچی جان لەوێ دانرابوو ئەگەر ئەوەبسەلمێنێن مەحاڵە لوسیان هاوسەرگیری لەگەڵ کچی بکوژی باوکیدا بکات.

_ بەڵام وەکو ئەوەی بیزانم پێی وایە جان بێتاوانە.

_ بەڵام ئەم بۆچوونە نەحوکمی دادگا نەخەڵك ناگۆڕێت، ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ کچی جان بکات بەیەك خولەك ئابڕووی نامێنێت.

ئەگەر نەتوانین بەوڕێگایە لوسی بکوژین بەڕێگایەکی دیکە دەیکوژین.

شانەکانی هەڵتەکاند و بەجۆشێکەوە وتی: ئەبێ کچەکەم لەگەڵ لوسیان هاوسەرگیری بکات. ئەمە ئامانجی منە لە ژیانەدا بەهەر ڕێگایەك بێت ئەبێت بەدی بێنم.

دوای ئەوەی لوسی ڕۆشت ماری هەستی بەخەمێکی زۆردەکرد، فەرمانی کرد بەئامادەکردنی گالیسکەکەی و ڕۆشت بۆسەردانی ئاتیین کاستڵی وێنەگری هاوڕێی تاوەکو ئەم خەمەی لەدڵیدایە لەتابلۆیەکدا وێنای بکات.

ئــاتیین کاســتڵ پەردەی لەســەر تــابلۆیەکی گەورە لابرد و وتی: ئەمەت بەدڵە؟

_ نــاوازەیە، ســەیرە، ئەڵێــی پێشــتر ئەوئــافرەتەم بینیــوە ئەوەی وا پیــاوانی پــۆلیس گەمارۆیــان داوە یان کچێکی هاوشێوەی ئەو.

_ ئەوکچە کێیە خانمەکەم؟

_ بەرگـــدوورە لای خـــاتوو ئۆگســـتین نـــاوی لوسییە... دەیناسی؟

_ ناخانمەکەم، لەکوێیە ئەوخانمە؟

_ ژمارە نۆلەشەقامی بۆربۆرن.

_ ئەوە زۆر ڕوودەدات.

دواتــر ڕێچــکەی قســەکانی گــۆڕی بەرەو لایەکــی دیکە.....

داوای لێکـــرد وێـــنەیەك بەقەبـــارەی ئاســـایی بۆبکێشــێت تابەدیــاری بیــدات بەبــاوکی لەڕۆژی لەدایك بوونیدا.

ئــاتیین بەڵێنــی پێــدا تادوومانــگ بــۆی تەواوبکــات. بــاس هــات وبــاس ڕۆشــت کەوتــنە قســەکردن لەســـەر کـــارگە وداهێنـــان، ئـــاتیین وتـــی: مۆرتیمــۆری بــاپیرت لەگەورە داهێــنەرانە وەکــو ئەوەی بیزانم.

_ ڕاستە، باوکیشم لەگەورەترین داهێنانەکانی ئامێری درووومانی بێدەنگ لەگەڵ ئامێری سافکردنە.

ئاتیین شێوەی گۆڕا وتی: ئامێری سافکردن؟!

_ بەڵێ، تەنانەت تەختە چاڵەکان نایەکسانەکانیش سافدەکات.

_ باوکت زۆر لەئەمریکا بووە؟

_ نزیکەی بیست و دووساڵ؛ ١٨٦١ تیایدا گیرساوەتەوە.

کاتێك ماری ڕۆشت ئاتیین بەهیواوە لەتابلۆکەی دەڕوانی وبەخۆی دەوت: سەیرە، کەواتە لوسی لەجان دەچێت زۆریش نەك کەم ولووسی لەبێسەرپەرشتان گەورەبووە، تۆبلێی کچی جان بێت!؟

_ ٦ _

ڕۆژێك بەسەر قسەکانی جاك و ئۆڤید تێنەپەڕیبوو ئۆڤید گەشتبووە لادێی (( جوانی)) تاوەکو بەهەواڵەوە بگەڕێتەوە لای خاوەنەکەی.

ئۆڤید کاتژمێرێك دەبوو گەشتبووە هۆتێلەکە بەخاوەن هۆتێلەکەی وت ڕێنوێنی بکات بەرەو

ژنێکی پیری لادێیەکە بابەتێکی کۆن هەیە پێویستە پرسیاری دەربارەوە بکات.

ئۆڤید ڕۆشت بۆسەردانی و وتی: تۆناوی هەموو ئەوسستەرانە دەزانی کەلەم لادێیە بوون پێش بیست و یەك ساڵ وایە؟ یەکێك لەم سستەرانە کچێکی لابووە بەناوی لوسی و دایکیشی ناوی جان فۆرتییە بووە ناوی ئەوسستەرە دەزانی؟

_ پرسیارێکی قوورسە.

_ بابیرت بخەمەوە، دایکەکە پێش بیست ساڵ بەدزین و کوشتن و سووتاندنی کارگەی بەڕێز لابرۆ تومەتبارکراوە.

_ اهههههه هاتەوە یادم... ئەو زەمانە باسی لادێ بوو، بەڵێ ئەو نەگبەتە منداڵێکی لای خاتوو فیفی دانابوو.

_ ئەی لەکوێیە ئێستا ئەمەوێ قسەی لەگەڵدا بکەم؟

_ مردووە.

_ کچەکەی جان ئەوچی؟ چی بەسەرهات؟

_ بەلایەنـــــــی زۆرەوە بــــــۆ شــــــارەوانی ، ئەو منداڵانەی باوانیـان وازیـان لێـدێنن یـان کـرێ نـادەن یـــان پەیوەنـــدییان پێیـــانەوە دەپچـــڕێنن ڕەوانەی شــارەوانی دەکەن دواتــر بــۆ بێسەرپەرشــتان، بــڕۆ بۆ شارەوانی لەوێ وەڵامت دەستدەکەوێ.

ئۆڤید بـۆ خـانەی سـەرۆکی شـارەوانی بەڕێـکەوت و لەبەرخـۆەوە دەیـوت: ئێسـتا چـی بـکەم؟ ئەگەر داوای ئەم داتـــانە بـــکەم گومـــان زیـــاترەکەم و وادەزانـــن لای جـــانی هەڵهـــاتووە هـــاتووم بەم شێوەیە تووشی شەرمەزاری ئەبم و لەناودەچم.

هیچـــی بـــۆ نـــامێنێتەوە جـــگە لەوەی ڕوونـــی بکاتەوە.

هەرچۆنێـــک بـــوو ڕۆشـــت، بەڵام ڕاســـــتەوخۆ نەڕۆشـــت بـــۆ بەشـــی تۆمارەکـــانەوە. هەرچـــووە ژوورەوە کارمەنـــدێکی گەنجـــی بینـــی بەتەنهـــا دانیشـــتبوو و ســـڵاوێ لێکـــرد و وتـــی: گەورەم ڕێگەم پێدەی پرسیارێکت لێبکەم؟

_ بەدڵنیاییەوە.

_ نـــاوی ســـەرۆکی شـــارەوانییت بیـــرە کەســـاڵی ١٨٦١ ئەم لادێیەی بەدەست بووە؟

_ بەدڵنیایەوە گەورەم ناوی دشمانە مامەمە.

_ لەجوانی یە.

_ نا، لەدیجۆن نیشتەجێیە.

_ پرسیارێکی دیکەم هەیە لەسەرساڵی ١٨٦١ ڕووداوێکی تیدا ڕوویداوە.

_ لەوەیە بتوانم بەبێ داتاکان ڕێنوێنیت بکەم.

لەوساتەدا پیاوێکی لادێی خۆی کرد بەژووردا هەرکە گەنجەکە چاوی بەپیاوەکە کەوت ڕەنگی مردووی لێنیشت وتی: گەورەم م م م م .....

سەردانیکەرەکە بەشێوەیەکی دڕندانە قسەکانی بڕی و وتی: واز لەم گاڵتە جاڕییە بێنە و پارەکەم بدەرەوە.

_ تکایە، کەمێك لەسەرم بوەستە.

_ لەسەرت بوەستم...؟ شەش مانگە تۆپێمەڵێی لەسەرت بوەستم سبەی کۆتا کاتتە ئەگەرهەزار فرەنك نەخەیتە چنگم لەگەڵ ئەو سەنەدەی ئیمزا ساختەکەی مامتی پێوەیە لای پۆلیسم.... کۆتا ئاگادارکردنەوەمە.

ئۆڤید هەلەکەی قۆستەوە و وتی: ببورن خۆمی تێهەڵەقورتێنم، بەڵام چیبووە؟

کــــوڕەکە وەڵامـــــی دایەوە و وتــــی: ئەم بەڕێـــزە هاوبەشـــی مـــامـە لەبازرگـــانی شـــەراب؛ ســـەرم لەقوڕنــــا و ئیمـــزای مـــامم لەســـەر دووســـەند ساختەکردوو هەزارفــرەنکم لەم پیــاوەبرد، پــێش ئەوەی ســـەنەدەکان بـــدات بەمـــامم ئەبـــێ هەزار فـــرەنکەکەی بـــۆبگەڕێنمەوە، ئێســـتا هەڕەشـــەم لێکـــا ئەگەر نەیـــدەمەوە ئاشـــکرام ئەکـــات و لەگرتووخانەم دەنێت.

بازرگـــانەکە وتـــی: کۆتـــا ئاگـــادارکردنەوەیە یەك ڕۆژ مۆڵەتت هەیە.

یەکسەر بۆی دەرچوو و ڕۆشت .

ئۆڤیـــد: چـــی وای لێکـــردی ئەم بەدڕەوشـــتییە بکەی؟

_ خۆشەویسـتی ئـافرەت شـایەنی هـیچ نیـیە جـگە لەوەی بەقــامچی لێتبــدەن، کــاتێ پــارەم نەمــا و بــێ پــوڵ بــووم تووڕەبــوو و پــولێکی پێوەنــام، ئێســتا ئەبێ یان گرتووخانە یان خۆکوشتن هەڵبژێرم.

ئۆڤیــد کەمێــك بێــدەنگ بــوو دواتــر وتــی: کــاتی ڕۆشتنت هاتووە؟

_ بەڵێ.

_ کەواتە دەی باپڕۆین بۆلای بازرگانەکە.

_ سوودی چییە هەزار فرەنکم نییە، نامەوێ جارێکی دیکە ئیهانە بکرێم.

_ هەزار فرەنکت پێ نییە، من پێمە.

_ ئەوە چییەڵێی گەورەم؟

_ قەرزەکەت بۆدەدەمەوە.

_ بەڵام.....

_ نارەزایی دەرمەبڕە، لەبەرامبەردا داوای چاکەیەکی بچوکت لێدەکەم.

دوای نیو کاتژمێر ئۆڤید لەجێگەی دووسەنەدەکە هەزارفرەنکی کاغەزی دانا.

لەسەر یەکێك لەمێزەکانی چێشخانەیەك دانشتبوون ئۆڤید وتی: ئێ کەواتە خانمەکەت جێی هێشتووی دوای ئەوەی غەرق بووی لەقەرزدا؟

_ بەڵێ، گەورەم، هێشتا هەزارفرەنکم لەسەرە.

_ ئەوەشت لەسەر لائەبەم.

_ پێویست ناکات گەورەم، قەرزارەکان بەڵێنیان پێداوم ئیهمالم بکەن.

_ ئەی ئەگەر کــاتی دانەوەی هــات چییــەکەی؟ نــا نـــابێ هەمـــوو قەرزەکانـــت لەپـــای ئەم خـــزمەتە دەدەمەوە.

_ چاوەڕێی قسەی تۆم گەورەم.

_ بیســت و دووســاڵ پــێش ئێســتا دۆســتێم هەبــوو منـــداڵێکم لێـــی بـــوو، کاتێـــك زانـــی مێـــردەکەی لەوەدایە بگەڕێـــــتەوە منـــــداڵەکەی لای یەکێـــــك لەدایەنەکـــانی جـــوانی دانـــا، ئەوکـــات فەرەنســـام جێهێشــــتبوو دوای گەشــــتێکی درێــــژ گەڕامەوە بەڵام هـــیچ ئاســــەوارێکم لێیـــان نەدۆزیـــیەوە و شـــوێنی نـــازانم، دایەنەکە نـــاوی فـــریمییە تکـــات لێدەکەم یارمەتیم بدە لەدۆزینەوەی کچەکەم.

_ گەورەم ئەوداتایـــــانە لەتۆمـــــاری ســـــەرۆکی شارەوانیدا نوسراوە.

_ ئەتوانی کۆپییەکم بۆبێنی.

_ داوای شـــتێکی مەترســـیدارم لێـــدەکەی گەورەم، بەڵام یەك و دووی لێنـــــاکەم بـــــۆت چـــــاکەیەکی گەورەت لەگەڵ کردوم.

_ بەڵام نەکەی جـارێکی تـر بگەڕێیـتەوە سـەر بـێ ئەقڵیــــــیەکەت و لەبەردەم ئەو ژنە بـــــــکەوی..... جوانبوو؟

_ گەورەم لەئامانـــــدا جـــــوانتر و کەشـــــخەتر و ناوازەترم نەبینیوە.

_ ئاماندا! سەیرە!

_ دەیناسی گەورەم؟

_ یەکەم جار بۆم وەسف بکە.

کاتێـك وەسـفی کـرد بـۆی، ئۆڤیـد وتـی: خـۆیەتی، بەڵام ئێستا لەجوانی نییە.

_ ڕۆشت بۆپاریس دوای کردنی چەند تاوانێك.

_ چ تاوانێك.

ئۆڤیـد لەکـوڕەکەوە زانـی کەوا ئامانـدا لەیەکێـك لەدووکانەکانـدا کـاری کـردووە و دزیکـردووە و خـاوەنەکەی پێـی زانیـوە، ئەگەر ئامانـدا بەگریـانەوە لێـی نەپـاڕایەتەوە بـی ئەمـلاولا لای پۆلیسـی لێـدەگرت سـاڵێکی پێـداوە تـانرخی دزینەکـانی بـداتەوە، دووسـەنەدەکەی ساختەکردووە وهەزار فـرەنکەکەی پێـداوە تابیـدات بەخـاون دووکـانەکە بەڵام بردوویەتـی ودواتر جێیهێشتووە وڕۆشتووە بۆپاریس.

_ ناونیشانی دووکانەکە لەکوێیە؟

_ ژماره ٧٤ شەقامە گەورەکە.

دوای کاتژمێرێـک ئۆڤیـد لەدووکـانی ژمـاره٧٤ بـوو لەشـــەقامە گەورەکە بـــوو. بەخـــاوەنەکەی وت: شـاگردێکت لابـوو بەنـاوی ئەمانـدا، هەنـدێك شـتی لـێ دزیبوویـت منـی ڕاسـپاردووە تـاوەکو پـارەکەت بدەمەوە.

لێـــرەدا ئەوەی ڕوویـــدا ئەو دووســـەندەی دشـــمان کەســـاختەکردابوو هەزارفرەنکـــی دانـــا و لەجـــێگەی دانپێـــدانانی ئامانـــداش هەزارفرەنکـــی دانا.

ئێـــوارەی ڕۆژی دواتـــر ئۆڤیـــد چـــاوی کەوت بەدشـــمانی گەنـــج ، دشـــمان کاغەزەکـــانی پێـــدا و وتـــــی: لەبەرم نەگـــــرتەوە بـــــۆت بەڵکـــــو هەرکـــاغەزەکەم دڕی و بـــۆتم هێنـــا کـــاری زۆرم هەبوو کاتم نەبوو بۆتی لەبەربگرمەوە.

ئۆڤیـد بەپەلە لەداتاکـانی ڕوانـی و هەمـوو تۆمـاره داواکراوەکـــانی بینـــی گومـــانی نەمـــابوو لەوەی لووسی کچی جانە.....

ئۆڤیـد تۆمـارەکەی لەیەك نـاو بەگەرمـی سوپاسـی کـوڕەکەی کـرد، وتـی: تکـایە پـێش ئەوەی بـڕۆی سەنەدەکانم پێدەدەی؟

_ دووسەنەدە ساختەکە! دڕیم دڵنیابە.

بەڵام درۆیەکـــرد چــۆن دانپێــدانانەکەی ئامانـــدای هەڵگرتبــوو ئەویشــی هەڵگرتبــوو: چــوزانم کێنــاڵێ ڕۆژێـك پێویسـتم بەم کاغـازانە نــابێ وەکـو چەکێـك هەڵیــــدەگرم و دشــــمان و ئامانــــدا ناچـــاردەکەم تالەژێر دەسم کاربکەن.

_ ٧ _

پیـــاوانی پـــۆلیس لەودارســـتانەی کەهێرشـــەکە کرابـــووە ســـەر لوســـی ئەوپـــارچە چەقۆیەیـــان دۆزیبـــــــــویەوە کە لەلوســـــــــی درابـــــــــوو. هەردووپارچەکەیــان لەیەك نــاو ڕێکــی یەك بــوون، ناونیشــانی فرۆشــیارەکەی لەســەر نووســرابوو: (( روشـــــــار.... چەك فـــــــرۆش_ ٩ شــــــەقامی بۆربۆرن)).

لێکــۆڵەرەکە سەرســامبوو کاتێــك ناونیشــانکەی بینـــی: ئەوە ناونیشـــانەکەی لوســـییە، هەمـــان شـــوێنی نیشـــتەجێیە، لێکـــۆڵەرەکە ڕای خـــۆی گـــۆڕی و وتـــی: لەپـــای دزی نەبـــووە بەڵـــگەش بـــۆئەوە ئەوەیە چەقـــۆکە لەهەمـــان مـــاڵ کـــڕدراوە کەلوسی لێبووە.

دادوەری لێکۆڵەر: کەواتە دەستدرێژی کارەکە لوسی دەناسێت، ئەگەر بەڕێکەوتیش بێت سەیرە.

لێکۆڵینەوەکە بۆ دووکانی چەك فرۆشەکە گوازرایەوە.

خاوەن دووکانە: پیاوێکی پەنجا و پێنج ساڵەی کەشخەیە و جلی گەنجانەی لەبەربوو... سیمای تاوانباری پێوە دیارنەبوو.

دادوەرەکە ڕۆشتە نهۆمی سەرەوە بۆلای لوسی و پێی وت چیبووە وتی: بەڵام دڵنیام جلی پیس و شڕی لەبەربوو.

_ ئەگەری هەیە خۆی گۆڕیبێت.

_ ئەکرێت.

دوای ئەوەی دادوەری لێکۆڵینەوە لوسیان بەجێهێشت، لوسی بەوپۆشاکە تازانەی کەتەواویکردبوو بەڕێکەوت بۆلای خاتوو ئۆگستین.

بەرگردوورەکە وتی: پیاوانی پۆلیس هێشتا دەستیان نەگەشتۆتە دەستدرێژی کارەکە؟

_ نا، بەڵام هیوایەك هەیە بۆدەستگیرکردنی.

بــــۆیگێڕایەوە پیــــاوانی پــــۆلیس گەشـــــتۆتە چ سـەرەنجامێك و چەقـۆکەش هەرلەمــاڵەکەی لوســی کــڕدراوە. لەلایەکــی دیــکەوە ئامانــدا گــوێی بــۆ قسەکانیان ڕاگرتبوو.

_ بەڵام خـــــراپەم بــــۆکەس نەبــــووە کینەشــــم بەرامبەر کەس نییە.

ئامانـــدا ئەوحەمـــاڵەی هـــاتەوە یـــاد کەهـــاتبوو بۆپرســـیاری لوســـی و ناونیشـــانی لوســـی، وتـــی: تـــۆبڵێی خۆشەویســـتی پێشـــترت دوای جێهێشـــتنی هاتبێ تۆڵەبکاتەوە.

_ پێشتر هیچ کەسێك عاشقم نەبووە.

خــــاتوو ئۆگســــتین: بەڕاســـــتی ئەم ڕووداوە زۆر شـــــاراوەیە، هیواخــــــوازم ئەم ســــــتەمە زوو تەواوببێ.

_ ٨ _

ئۆڤیـد وایـدەزانی لوســی لەنــاوبردووە لەگەڵیشــیدا پەیوەنـدی بەئامانـداوە نەمــا، بەڵام کەزانــی لوســی مـــاوە بڕیـــاڕی دا دزیـــیەکەی ئامانـــدا بکـــات

بەچەکێـــك و دووبـــارە پەیوەنـــدی پێوەبکـــاتەوە. ئێوارەکەی لەسەر وادەبوون.

ئاماندا: زانیت لوسی چی بەسەرهاتووە؟

_ لوسی کێیە؟

_ ئەوبەرگـــــدوورەی لەشـــــەقامی بۆربـــــۆرنە جارێکیش لەگەڵمدا هاتی بۆ ماڵەکەی.

_ چی بەسەرهاتووە؟

_ چەقۆی لێدراوە خەریکبوو بمرێت.

ووردەکارییەکـــانی ڕووداوەکەی بـــۆگێڕایەوە، و هەمـوو بەرەوپـێش چـونێکی دۆسـییەکەش، وتـی: چەقۆکەشـیان دۆزیـوەتەوە وەسـفی کڕیارەکەشـیان لەفرۆشیارەکەوە وەرگرتووە.

ئۆڤیـد ڕەنـگ و ڕووی گـۆڕا وشـڵەژانێکی یەجگـار زۆر بەڕوویـــیەوە دیـــاربوو . ئامانـــدا وتـــی: ئەم شڵەژانییە چییە؟ تۆ نەخۆشی؟

خـۆی کـۆکردەوە و وتـی: نـا، بەڵام زۆرناحۆشـبوو لام کـــاری لێکـــردم. بەڵام ئـــاخر چـــی بـــوو تـــا والەلوسی بکرێت؟

_ هەرئەوەیە لێکـــۆڵەرەکە ئاشـــکرای دەکـــات، بەڵام شـــتێکی ســـەیرە هەمـــان ئەوکـــاتەی کەتـــۆ لەگالیســـکەکە لەبەردەم مـــاڵی لوســـی چـــاوەڕوانم بوویـــت دەســـتدرێژی کـــارەکەش چەقـــۆکەی کڕیـــوە ئەبێ بینیبێتت.

ئۆڤید لەســـەرخۆ وتـــی: ئەبـــوایە بـــم بینیـــایە، بەڵام هیچ گرنگیم بەدەرگای دووکانەکە نەدابوو.

کـــاتێ وایـــدەوت ئامانـــدا زۆر بەوردی چـــاودێری دەکـــرد، بەڵام چاوەکـــانی ترســـەکەی نەشـــاردبووە وە.

_ پۆلیس ئەو حەرام زادەیە دەگرن؟

_ بێگومـــــان، لێکـــــۆڵینەوەش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەبەرەوپـــێش چوونـــدایە، بـــۆچی ئەوەنـــدە گـــرنگە بەلاتەوە؟ چیـــــیە کەســـــێك دەناســـــی هەمـــــان وەسفەکانی لەسەر جێگیرببێت؟

ئەبـــوایە ڕوونـــــی بکـــــردایەتەوە، ئۆڤیـــــد زانـــــی هەســـتی بەشـــتێك کـــردووە، و هەســـتی کـــردووە کەوا ئەم لەکاتی چاوەڕوانیدا چەقۆکەی کڕیووە.

ئۆڤید: بـائەم بـابەتە بخەیـنە لاوە، لـێم بپرسـە چـی سەیرم لەکاتی گەشتەکەمدا بینیوە؟

_ چیت بینی؟

_ هەندێك شتی كەسانی بەناوبانگم كۆكردەوە.

_ بەڕاست؟ لەكوێ؟

_ لەفەرەنسا.... لەجوانی بەدیاریكراوی.

ئۆڤید بەشێوەیكی دڕندانە لێی دەڕوانی و بینی والەترسا دەلەرزێ.

ئاماندا بەڕوویەكی گوێ پێنەدانەوە لێی پرسی: شارێكی جوانە؟

_بەڵێ، لەوێ خاوەن دووكانێكی جلوبەرگم ناسی نوسراوێكی پێدام نرخەكەی هەزار فرەنك بوو، زۆر كەیفم لە خۆشنوسییە.

ئاماندا زەرد هەڵگەڕا، ئۆڤیدیش وەك بڵێی چیرۆكێكی بەچێژی بۆبگێڕێتەوە وتی: ئەم كاغەزەش ئیمزای كچێكی لەسەربوو بەناوی ئاماندا ریجامی، ئەوە ناوی تۆنییە؟

هیچ دەرفەتێكی نكۆڵی نەمابوو ئاماندا بەلەرزەوە وتی: مادام هەموو شتێك دەزانی بۆچی ئەپرسی؟

_ بــــۆچی لەمە دەترســــــی؟ بەڕێــــکەوت زانــــیم، هـــاوڕێیەکی زۆر باشـــبووم بـــۆت قەرزەکەم بـــۆ پاککردویتەوە.

_ سـوپاس، لەکـاتی شـێتیدا پەنـام بۆئەوکـارە بـرد، کاغەزەکان لەکوێیە؟

_لەدۆڵابەکەم پاراستوومە.

_ ناتەوێ بۆمی بگەڕێنیتەوە؟

_ نـــا، وەکــو پـــێم وتـــی حەزم لەپاراســـتنی خەت و ختوتات و خۆشنوسیە.

توڕەبـــوو وتـــــی: ئەم هەڵ و پەلیتـــانە بـــخەلاوە بـارۆن، شـــتێك لەپشـــت پاراســـتنی ئەوکـــاغەزانەوە هەیە، ئەهـــــا، ئەتەوێ گەواهـــیم لەســـــەربدەی و فڕێم بدەیتە گرتووخانە دەوابڵێ؟

بەپێکەننـــیەوە دەیـــوت: مـــن تـــۆم خۆشــــەوێت، ئەستەمە بەبیرم دابێت خراپەت لەگەڵدا بکەم.

_ کەواتە؟

_ هەمـــــــوو ئەوەی لەمەســـــــــلەکەدایە ئەوەیە ئەزمـوون وایلێکـردووم بەرامـبەر ئـافرەت وریـابم، بـۆیە ئەیپـارێزم تـاوەکو لەکـاتی پێویسـت بەکـاری بێنم.

_ کەواتە کەوتمە ژێردەستی تۆ.

_ زەرەرتە؟

دوای کەمێك ئاماندا لێی پرسی: چۆن زانیت؟

_ بەڕێکەوت و ڕێکەوتن.

_ کەواتە کڕینـــی چەقـــۆکە لەدووکـــانی مـــاڵەکەی لوســـی لەلایەن دەســـتدرێژی کـــارەکەوە ڕێـــکەوت و ڕێکەوتن بوو.

لەوســاتەدا ئۆڤیــد گومــانی نەمــا کەوا ئامانــدا پێشــتر هەمــوو شــتێکی زانیــووە. وتــی: هەرچیــیەك بێــت دەســـــتدرێژیکارەکەی ســـــەر لوســـــی پێـــــی ناخـــــاتە گرتووخــانە چەکێکــی باشــی پێــیە تــاوەکو خــۆی لــێ قوتاربکات.

کـــاتێ ڕۆشـــت ئامانـــدا وتـــی: ناونیشـــانەکەت چیـــیە لەوەیە پێویست بکات نامەت بۆبنوسم.

_ بەوریایەوە بینوسە ژن ومنداڵم هەیە.

کـــاتێ لەپەنـــای ئامانـــدا نەمـــا و چـــۆڵیکرد ئامانـــدا بەخـــۆی وت: بـــارۆن تەواو دڵنیـــابە کەوا مـــنەزانم، بەڵام چـــۆن چـــۆنی ئاشـــکرای بـــکەم لەکاتێکـــدا چەکێکـــی وای پێـــیە و لەهەر ســـاتێکدا بیەوێـــت ئەتـــوانێ بەکاریبێێـــت!؟ بەڵام نهێنـــیەکەی چیـــیە؟

بۆچی ویستی لوسی بکوژێت؟ لەئێستا بەدواوە ئەبێ پێ بەپێ بەدوایدا بچم تاوەکو نهێنیەکەی دەزانم.

ئۆڤید ڕۆشت بۆلای جاك و تۆمارەکەی پێدا، وتی: بێ هیچ گومانێك لوسی کچی جانە.

_ لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ زۆر وریابین پێش ئەوەی هەرکارێك بکەین.

_ کەواتە دەڕۆم بۆ خانەی بێسەرپەرشتانەکە و پرسیار لەومندالەکەم کە ٦- نیسانی ساڵی ١٨٦٢ لەوێ جێهێڵدراوە وچارەنووسی چی بەسەرهاتووە. لوسیان کەی دەگەڕێتەوە؟

_ چوار پێنج ڕۆژی تر؟

کاتژمێر پێنجی ئێوارە ئۆڤید گەڕایەوە بۆلای جاك، وتی: ڕۆشتم ولەتۆمار گەڕام.

_ چیت زانی؟

_ زانیم لوسی بەرگدوور کچی جان فۆرتییەیە.

جاك دڵخۆشبوو وتی: ئێستا ئەتوانین دەستی خۆمان بوەشێنین، بابزانین ئێستا لوسیان ئەفەندی ڕازی ئەبێ بەکچی بکوژی باوکی؟

_ ٩ _

دوای چـــوار ڕۆژ لەپـــاریس دووکـــچ چـــاوەڕێی گەڕانەوەی یەك پیـــــاوبوون، هەریەکێکیشـــــیان پێیـــان وابـــوو ئەوی خۆشـــەوێت و بـــێجگە لەوهاوسەرگیری لەگەڵ کەس ناکات.

ئەو دووکـچەش لوسـی و مـاری بـوون، پیـاوەکەش لوسیان بوو لەگەشتەکەی بلگارد گەڕابوویەوە.

لوســی بەچـــاوی پـــڕ فرمێســـکەوە بەخێرهـــاتنی کـــردەوە، کاتێـــك لەئـــامێزی لوســـیاندابوو، لوســـیان وتـــی: خـــوایە! ئەگەر ڕۆژێـــك بروســـکەی مەرگـــتم پێبگات هەر لەخەفەتا دەسبەجێ خۆشم دەمرم.

پێکەنـــی وتـــی: بـــاواز لەم قســـانە بێنـــین ئەوەتـــا بەتەندورستییەکی باشەوە دەمبینی.

_ بەڵام چۆن؟ چۆن ڕوویدا؟

هەمـــوو ووردەکـــاری و ڕووداوەکـــانی بـــۆگێڕایەوە، بەیـــانی ڕۆژی دواتـــر لوســـیان بەرەو کـــارگەکەی جـــاك بەڕێـــکەوت و جـــاك بەخێرهـــاتنی کـــردوو وتـــی: زۆر دڵخۆشـــم کەئەم کـــارەم پـــێ ســـپاردی، نـــامەی

زۆرم لەهـــاوڕێ کارەکـــانم پـــێ گەشـــتووە بـــێجگە لەوەسفی تۆ هیچ شتێکی تریان نەوتووە.

دوای ئەوەی لوســـــیان ئەنجامەکـــانی گەشـــــتەکەی بـــۆگێڕایەوە وتـــی: گەورەم پـــێم بڵـــێ.... خـــاتوو ماری چۆنە؟

_بێچارە، زۆر نەخۆشە.

__هیوادارم مەترسیدارنەبێت.

_ ئەمشــەو دەیبینــی بۆخــوانی ئێــوارە لامــان ئەبــی، ئەو بێچـــارەش تـــامەزۆری بینیـــتە بـــێجگە لەتـــۆ باسی هیچ ناکات.

ئێــوارەکەی لوســیان بەرەو مــاڵی جــاك بەڕێــکەوت. مـــاری لەناوەڕاســـتی هـــۆڵەکە دانیشـــتبوو هەرکە لوســـــیانی بینـــــی هەســـــتایە ســـــەرپێ بەڵام خۆشـــییەکەی تاســـەرنەبوو خـــۆی پـــێ نەگیـــرا و لەســـــەر کورســـییەکە بەڕوویەکـــی مـــردووانەوە دانیشت.

بـــاوکی بەخێرایـــی بەرەو ڕووی ڕایکـــردوو مـــاری وتـــی: هەســـــتم بەمانـــــدوویەتی کردبـــــاوکە، بەڵام ئێســـــتا هەڵـــــوەری بینینـــــی لوســـــیان هەمـــــوو

ماندوویەکەمی ڕواندمەوە، خۆشەویستییەکەی ڕووپۆشی ئازارەکانمە.

لوسیان: منیش خۆشحاڵم خانمەکەم.

_ بەڕاستیتە؟

_ بەدڵنیاییەوە.

ڕووی گەشبوو وتی: بۆ هەموو ڕۆژێك سەردانمان ناکەی؟ دڵخۆشەبم بانگهێشتی خوانی ئێوارەت بکەم و هەموو شەوێك لەگەڵمان نان بخۆی.

لوسیان: خانمەکەم چاکەکانت تاگەردنم هاتووە. کاری زۆرم هەیە خانمەکەم تکایە بمبور......

قسەکانی بڕی و وتی: لەپشووی یەکشەمانە دێیت، تکایە ئەوکاتەش سەردانمان بکە.

بەنیگایەکی پڕ ماناوە لێی ڕوانی زانی ئاماژەیە بۆسەردانەکانی لوسی، لوسیان وتی: بەڵام دۆست وهاوڕێم هەیە خانمەکەم کاتم نییە تەنها دەتوانم یەکشەمانە سەردانیان بکەم.

خەم دایگرت، ئاگری کینە تاقوڕگی هاتبوو وتی: کەواتە نائومێدم دەکەی.

باوکی خۆی تێهەڵقورتاند و وتی: شتێکی زۆر ئاساییە کچەکەم یەکێك لەڕۆژەکانی هەفتەی پێبدەین و ئازادبێت و هەرچییەکی ویست بیکات.

_ پێکات باوکە، ئێستا زانیم زیادەڕۆیم کرد لەداواکانم، نەئەبوایە هیوای بەدیهێنانی ئەو خەونانە بەخۆم بدەم.

بێدەنگی باڵێ کێشابوو، کۆڵێك خەم بەڕووخسارییەوە دەرکەوتبوو. لوسیان هەستی بەداخ دەکرد بۆی.

دوای خوانی ئێوارە کۆشکەکەی جاکی چۆڵکرد، واهەستیدەکرد بارێکی ئێجگار قورس لەسەر شانی نەماوە بەخۆی وت: چ کچێکی بێچارەیە، زۆر ناژی، زۆر دڵڕەقانەیە وازی لێبێنم بەونالەوە بمرێت! بەڵام چۆن فریوی بدەم و بڵێم خۆشم دەوێت لەکاتێکدا یەکێکی دیکەم خۆشەوێت؟! ماری ڕووی وەرگێڕا بەرەو لای باوکی و دوای ڕۆشتنی لوسیان دووبارە و دووبارە دەیوت: باوکە بینیت منی خۆشناوێت.

_ چۆن کچەکەم؟ مەگەر ڕازی نەبوو بەوەی هەموو ئێوارەیەك لای ئێمە بکاتەوە؟

_ بەڵام بەزۆر قبوڵی کرد.

بەردەوام بـــوو وتـــی: بـــاوکە، لێبـــوومەوە لەچـاوەڕوانی، لێبـوومەوە لەناڵانــدن، ئەبـێ شـتێك بکەم ئەبێ شتێك بکەم.

جـــاك ئەبـــڵەق بـــوو کاتێـــك گـــوێی لەم وشـــە نەوتراوانەبـــوو کەلەدەمـــی کـــچە چکـــۆڵەکەی دەرەچێـت، وتـی: کـچەکەم، ئـارام بەرەوە، لوسـیان هەرتـۆ لەگەڵ تـۆ هاوسـەرگیری دەکـات، متمـانە بەقسەکانم بکە.

بەڵام فریوی نەخوارد و ژوورەکەی چۆڵکرد.

جـاکیش نەیـدەتوانی بخەوێـت، وای دانـابوو بیـری خۆکـــوژی لەمێشـــکیدا چەســـپاوە، هەرئەوەیە مەبەستی کاتێ وتی ئەبێ شتێك بکەم.

بەیـــانی ڕۆژی دواتـــر جـــاك جـــارۆد لوســـیانی بەڕێـــوبەری بانگهێشـــتی نوســـینگەکەی کـــردوو وتـــی: ئەبـــێ سوپاســـت بـــکەم بـــۆئەو ســـۆزەی لەهەمـــبەر مـــاری نوانـــدت.... بەڵام پـــێم بڵـــێ ڕات چییە لەسەر تەندروستی ماری؟

_ پێم وایە پێویستی بەچاودێرییەکی ووردە.

بـــاوکی بێچـــارەی بەتەوســـەوە ســـەری لەقانـــد و وتـــی: دکتۆرەکـــان یەك بیـــرن کەوا کـــچەکەم لەمەترسـیدایە لوسـیان، ئەو لەسـەر هێڵـی مەرگە

و خۆشەویستی تۆش لاوازتری ئەکات، بێجگە لەهاوسەرگیری تۆهیچی تر ڕزگاری ناکات.

_ هاوسەرگیری لەگەڵ من!

_ بەڵێ، ژیانی بەندە لەسەر ئەو وشەیەی کەلەزاری تۆوە دەردەچێ، هەموو سەروەتەکەمت پێدەدەم لەپێناو ڕزگارکردنی کچەکەم.

_ گەورەم من بەوکارانەت دەزانم، بەڵام تکایە تێ بگە منیش لەوکاتەوەی زانیومە ماری خۆشی دەوێم ئەنالێنم، بەڵام چۆن واز لەخۆشەویستی لوسی بێنم؟ ئەگەر لەجێگەی من بویتایە ڕازی ئەبویت؟

_ لەڕای من مەپرسە لوسیان، بێجگە لەقسەی پیاوێك كە كچەكەی لەسەرە مەرگە هیچی ترنییە و گرنگ نییە بەلایەوە چییەڵێت و چییەكا لەپێناو ڕزگاركردنی، هەموو ڕۆژێك لەبەرچاومدا وەكو گوڵ دەوەرێت بێچارە كچی ئازیزم؟ لوسیان من وەكو پیاوێك قسەت لەگەڵ دەكەم كەئەگەر كچەكەی بمرێت یاعنی خۆشی دەمرێت.

لوسـيان بێـدەنگ بـوو، جـاك وتـی: کەواتە تۆسـووری لەسـەر هاوسـەرگیریکردنت لەگەڵ لوسی؟

_ پاشگەزبوونەوەی نییە گەورەم.

_ کەواتە باشـتێکت پـێ بڵـێم کەنـاتوانی بەرگەی بگـری، بەڵام ئەم هەلـومەرجە ناچـاری کـردم بیڵـێم، هاوسـەرگیریکردنت لەگەڵ لوسـی بـێجگە لەئـابڕووبردن و نـاوپیس کـردن هیچـی تـرت بۆناهێنێت.

_ مەبەسـتت چیـیە گەورەم؟ وادیـارە ئیهـانەی ئەوکچەدەکەی کەخۆشمەوێت.

_ بەڵکـو ئەوکەسـەیە کەتـۆ پێیـدەڵێی خۆشمەوێیت.

_ گەورەم!!!!!!

_ ئەزانـی ئەوکـچەی کەتۆدەتەوێـت نـاوی خـۆتی پێبدەی کێیە؟

_ کچێکی پاکیزە و بەشەرەفە.

_ هەڵەت کرد لوسیان.

کـــــوڕە لەتووەڕییــــــدا هەســــــتا و ڕوخســــــاری سـوورببووە وە و هـــاواری کــرد بەســـەر جاکــدا و وتــــی: گەورەم تکـــــایە لەوەزیـــــاتر ســـــوکایەتی بەژنەکەم مەکە.

_ کـــــچە فڕەدراوێکـــــی بێسەرپەرشـــــتانە کەکەس نازانێ کێ دایکێتی و کێ باوکێتی.

_ شـــتێکی نـــوی نیـــیە بـــۆم گەورەم، دوای ئەوەش شەرمەزاری بۆ باوانیەتی نەك خۆی.

_ ئەم قســــــەیە تەنیــــــا شــــــاعیران و خــــــاوەن ئەندێشەکان ئەیکەن، ئەزانی کچی کێیە؟

_ کێیە؟

_ کچــــی ئەو ژنەیە کەبــــاوکتی کوشــــت، جــــان فۆرتییە.

لوســــیان ئەبــــڵەق ببــــوو لەجــــاکی دەڕوانــــی، هــاوارێکی پــڕ لەئــازاری کــرد و خــۆی بــۆنەگیرا کەوتە سەرزەوی.

لەم قســانەی جــاك و لوســیاندا مــاری و لوســیش لەلایەکی دیکەوە مژووڵی قسەکردن بوون.

وتــی: بــێجگە لەدوورینــی پۆشــاك هیچــی تــرهەیە بژێوی خۆتی پێ دابین بکەی؟

_ نا.

_ ئەتەوێ ئەوەندە پارەت پێبدەم دەوڵەمەندبیت؟

لوسی سەرسامبوو وتی: مەبەستت چییە خانمەکەم؟

_ ئەتەوێ ڕاست و ڕەوان قسەبکەم؟

_ بێگومان.

_ چارەکێك ملیۆنی فرەنکت پێدەدەم، بەڵکو زیاتریش ئەگەر بتەوێت.

لوسی بەخۆی وتی: ئەمە چییە؟ شێت بووە.

دواتر دەنگی هەڵبڕی وتی: بەڵام ئەم دەسبڵاوییە لەپای چی؟

_ لەفەڕەنسا بڕۆیت و نەگەڕێیتەوە.

_ سەیرە، نازانم مەبەستت چییە.

_ لوسیانم خۆشەوێت، و ئەمەوێت هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەم، هەرچەنێ پارەت دەوێ بیبە و بڕۆ، ئارامیت لێ بردووم، نەخۆشی وادەمکوژێت ئەگەر بۆ لوسیان ببم ئەبمە بەختەوەرترین ئافرەت.

لوسی هەستا و وتی: لەبەرئەمەیە لێم تورەیت، ئەموت ئاخۆ لەبەرچی بوبێت وامامەڵەکات، خانمەکەم پێت وایە ڕازی ئەبم؟

_ بۆچی نا؟ زیاترت ئەوێت؟ ئامادەم.

لوسی بەفیزەوە وتی: ڕەتی دەکەمەوە خانمەکەم تەنانەت ئەگەر ملیونان فرەنکیشم پێبدەی، ئەزانی بۆ؟ بزانە من لوسیانم خۆشەوێت خۆشەویستی کاڵانییە تا بەپارە بپێورێت، خۆشمەوێت و خۆشی دەوێم، باخۆی هەڵیبژێرێت. پێم وابێ قسەکانت تەواوبوو ئەتوانی بڕۆی.

بەڵام ماری نەڕۆشت.

ئەو کچە لووتبەرزە لەوکاتەدا پایەو لوتبەری خۆی لەبیرکردبوو. کەوتە سەر ئەژنۆ لەبەردەم لوسی، دەستەکانی بەرزکردەوە و دەپاڕایەوە، بەدەنگێکی لەرزۆك و فرمێسك لەسەر گۆنا وتی: لوسی، نابینی چۆن ئەناڵێنم، نابینی دەمرم؟ خەمی خۆشەویستی وادەمکوژێت تکایە ژیانم پێ بدەرەوە، ئەگەر ڕازی نەبی دەمرم.

لوسی بەزەیی پێداهاتەوە و دەستی گرت، وتی: خانمەکەم، هەستە دڵم پارچە پارچە بووبوت،

بەڵام نـاتوانم هـیچ بـکەم، دڵ کـاڵا نیـیە بکڕدرێـت و بفرۆشرێت.

چـاوی مـاری لەڕق و تووڕەیـدا پڕبـوو، قیژانـدی: تۆڵەت لێدەکەمەوە.... تۆڵەت لێدەکەمەوە.

بەپەلە ژوورەکەی بەجێهێشت.

مـاری هێشـتا دوورنەکەوتبـووە لەژوورەکە جـان هاتبوو بۆ سەردانی لوسی.

خەم و ئـازارێکی زۆری لەچاوەکـانی بەدی دەکرد، وتی: کچم چیتە؟

لوسـی بەرگەی نەگـرت خـۆی هەڵـدایە باوەشـی جـان و وەکومنـداڵێکی خەفەتبـاری بچـووك دەگریـا و هەسـتی بە سـۆز و گەرمـی سـنگی دایکـی دەکرد. کاتێ هاتەوە سەرخۆی وتی: ئەناڵێنم.

هەرچـی لەنێـوان خـۆی ومـاری ڕوویـدا بۆیگێڕایەوە.

_ ١٠ _

لوسیان هاتەوە سەرخۆی و ڕووی بەرەو جاك وەرگێڕا و وتی: گەورەم تۆمەتێکی مەترسیدارت بۆ لوسی هەڵبەستووە، هیچ بەڵگەیەکت هەیە؟

_ بێگومان.

ئەوتۆمارەی کە دیسەلماند لوسی کچی جانە دای بەلوسیان. لوسیان چاوی بڕییە تۆمارەکە و وتی: بڕوام کرد.... کچی جانە.

_ ئەو ژنەی کەباوکتی کوشتووە.

_ بەڵام بێتاوانە دڵنیام.

_ بڕوای تۆ حوکمی خەڵك و دادوەر ئەگرێتەوە؟ حەڵکی چییەڵێن ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ کچی بکوژی باوکت بکەی؟

لوسیان بەخەمبارییەوە وتی: ڕاستەکەی، گەشتنم بە لوسی مەحاڵە.

_ کوڕەکەم بینیت ئامۆژگاریت دەکەم.

**بێچـــاره لەبـــارودۆخێکی ئەوەنـــده نالەبـــاربوو وێنـــاکردنی ئەســـــتەم بـــوو، ڕووی وەکـــــو نەخۆشێکی چەند مانگەبوو.**

**جـــاك: کـــوڕەکەم لەشـــەرمەزارییەك کەخەریکبـــوو تەواوی ژیانـــت درێژەبکێشـــێت ڕزگـــارم کردیـــت، لەهەمـــبەر ئەم چـــاکەیەش ئەمەوێـــت کـــچەکەم ڕزگاربکەی.**

**_ بەڵام ناتوانم.**

**_ ئەزانـم پیـاوێکی خـانەدانی، ڕزگـارم کـردی ئیـدی چۆن ڕزگارم ناکەی؟**

**_ گەورەم، بـــارودۆخەکە بەوشـــێوەیە ئـــارام نیـــیە کەتـــۆ وێنـــای دەکەی، تۆقـــانێکی گەورەیە بـــۆمن، چەندین ڕۆژ ئەبێ دەرمانی دڵم بکەم.**

**_ کچەکەم!؟ ئەم ڕەتکردنەوەیە دەیکوژێت.**

**_ گەورەم هۆکـــارەکەی پـــێ بڵـــێ پێـــی بڵـــێ بـــۆچی ناتوانم هاوسەرگیری لەگەڵ لوسی بکەم.**

**_ بەڵام هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکەم دەکەی؟**

**_ گەورەم بۆســتە، چەنــد ڕۆژێکــم بــدەیە تــادێمەوە سەرخۆم، نابینی لەچ ئازارێکدام؟**

_ باشه، دەوەستین.

_ ڕووخسەتی دوو ڕۆژم پێبدە؟

_ بەدڵی خۆت.

لوسیان بەدەم ڕۆشتنەوە دەیوت: بەڵێ، مەحاڵە هاوسەرگیری لەگەڵ کچی بکوژی باوکم بکەم! لوسی بێچارە! دەمرێت، بەڵام دەسەڵاتی من چییە؟ منیش دەناڵێنم زیاتر لەچاوەڕوانییەکەی ئەو ئازار ئەچێژم.

لوسیان شەقامەکانی پاریسی گرتەبەر سەرلێشواو سەر سوڕما و نەیدەزانی کەواچییەکات.

گومانی تیانەبوو لەسەر ڕاستی هاوسەرگیریەکەی لەگەڵ لوسی، بەڵام تۆقانە وەکو ئەوەی خۆیی دەیڵێ دڵی گوشراوە و پارچە پارچە بووە شێتی کردووە.

بەبێ ویستی خۆی قاچەکانی بەرەو نانەواخانەی جانیان برد، هەرکە بینی لەکونچێک دانیشتووە خێرا بەرەو لای هەڵپەی کرد و وتی: بەڕێز لوسیان، پێویستت پێمە؟

بەڵام چیتە بۆ واتلێهاتووە؟ چییە؟ ئەوە دەگریت؟ پێم بڵێ چیبووە! ئەتەوێ لەسەر لوسی قسەبکەی، خوایە، خوایە، لەسەر لەبەیانییەوە دەمزانی بەهۆی خاتوو مارییەوە شتێکمان بەسەردێت.

_ خاتوو ماری ئەمڕۆ سەردانی کردن؟

_ بەڵێ....

_ بۆچی؟

بۆیگێڕایەوە، بەئارامی وتی: لەخۆشەویستیدایە.

جان لێی ڕوانی و وتی: چی؟ هیچ ناڵێی لەسەر لوسی؟ نازانی ئەم سەردانە چەنێك ئازاری داوە؟

_ بێگومان زۆر هەستیارە.

_ هەستیارە؟ ئەم قسانە چییە؟ دیارە سۆزت بۆی نەماوە؟ چییە چیتر ئەوت خۆشناوێت؟

_ لەوانەیە.

_ چی.... چیتر لوسیت خۆشناوێت؟ وڕێنەکەی؟

_ شتێك هەیە وام لێکات وابڵێم.

_ ئەی بۆچی دوێنێ وای لێنەکردی؟

_ لەبەرئەوەی ئەمڕۆ زانیم.

جـان تووڕەبـوو وتـی: سـەرچاوەی ئەم درۆ پـڕ و پووچـانە دەزانـم، بـزانە چ درۆیەکیـان بۆهەڵبەستووە.

_ نەدرۆ نەپـڕ وپـووچ هیچـی لەوانە نیـیە خانمەکەم، ڕاستییە ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگر.

_ مەبەستت چییە، ڕوون بدوێ؟

_ مەحاڵە هاوسەرگیری لەگەڵ بکەم.

_ بەڵام بۆچی؟ بۆ؟

_ لەبەرئەوەی کچـی ئەو ژنەیە کەبـاوکمی کوشتووە.

جـان هـاواری لـێ هەسـتا و وتـی: کچـی ئەوژنەی کەباوکتی کوشتووە! کچی جان فۆرتییە!

_ بەڵێ.

_ لوسی. کچی جانی هەڵهاتووە؟

_ بەتەواوی.

خەریکبـوو لەدەمـی دەربچێـت و هاواربکـا: کەواتە لوسـی کـچەکەمە کەچەنـدین مـانگە

بەدوایەوەم، کـــچەکەم لەبەردەمـــم بـــووە! چەنـــد هەنگاوێك دوور و منیش بێ ئاگا.

بەڵام خـۆی گـرت و وشـك بـوو..... وتـی: سـەیرە، سەرسام بووم، بەڵام تاوانی دایکی هەڵدەگرێت؟

_ بـــێجگە لەوە ئەتـــوانم چیتـــر بـــکەم؟ ئەگەر خەڵکی بزانن چییەڵێن؟

_ بەڵام تۆ پێت وایە بێتاوانە.

_ ئەی لەزمـــانی خەڵـــك ڕزگـــارم دەکـــات. پـــێش ئەوەی هاوســـەرگیری لەگەڵ لوســـی بـــکەم ئەبێـــت بێتـــاوانی دایکـــی بســـەلمێنم، خـــانمەکەم، تکـــات لێـدەکەم بـڕۆ بـۆلای لوسـی، پێـی بڵـێ.... پێـی بڵـێ مەحـــاڵە بـــۆیەك ببـــین. دڵـــم شـــکاوە بـــۆ جیابوونـەوەی، بەڵام شەرەفمم ڕێگەم پێنادات.

_ گەورەم کـــارەکە بەمـــن ڕائەســـپێری، ئەتەوێ پێـــی بڵـــێم کچـــی کێـــیە لەکاتێکـــدا خەمـــی خۆشەویســــــــتی هەڵنەگرتـــــــــووە و ئەتەوێ شەرمەزارییەکەشـــی بـــخەمە ســـەر؟ نـــا گەورەم بەمنی مەکە، تکایە.

خێرا پشتی لێکرد و بەدڵێکی شکاوەوە ڕۆشت.

کەواتە لوسی کچەکەیەتی.

ئەو خۆشەویستیەی لەدڵیدا بوو بانگی دایکانە بوو بۆی.

بەڵام چ کەلێنێکە! چی بەکچەکەی کرد. لەبری ئەوەی بەسۆزەوە باوەشی بکات کەچی بێت و دایکایەتی خۆی لێ بشارێتەوە. لەبری ئەوەی پێی بڵێ: من دایکتم، ناچارە هاواربکات و بڵێ: نا..... نا...... من دایکت نیم.

چ عەزابێکە ئەو ڕۆژەی دایکێك ناچارە دایکایەتی خۆی بشارێتەوە.

_ ١١ _

ئۆڤید سۆلیفەر هەمیشە لەترسابوو بەرامبەر ئاماندای دۆستی.

دەیزانی کەوا ئەو دەزانێت و دڵنیایە ئەم دەستدرێژەی کردۆتە سەر لوسی، لەوەش دڵنیابوو کەوا ناوی ڕاستی ئەو نازانێت و وادەزانێ ناوی بارۆن ئارنۆڵد دی ڕیسە. بەڵام دەترسا وەدووی بکەوێت و نهێنیەکەی ئاشکرابکات. بەخۆی وت: ئەبێ لێی دەرکەم

بـزانم وەدووی چیـیە، و چەنـدێك بەگومـانە، بـۆچی ڕەچەتەی ڕاســـتی یـــیەکە بەکـــارنەهێنم هەروەك جــاری پێشــوو، وەکــو چــۆن نهێنــیەکەی جــاکم بــۆ ئاشکرابوو.

بـــانگی بـــکەم بـــۆ ســـین ی نزیـــك فۆنتێلـــو بۆهەفتەیەك.

بانگهێشـــتێکی بۆئامانـــدا نـــاردوو خـــۆی پـــێش ئەو کەوتبـــوو بـــۆلادێکە دوو ژووریشـــی لەهـــۆتێلی (( ڕاوچییەکـــان)) بەکـــرێ گرتبـــوو و پێـــی وانەبـــوو کەبەدوایدا بچێت.

کاتێـك لەدارسـتانی پاشـا بەتەنهـا پیاسـەی دەکـرد کـــۆمەڵەیەکی بینـــی لەســـەر گیـــاکە ڕاکشـــابوون وقسـەیان دەکـرد یەکێکیـان دەیـوت: چـارەنووس وای خواسـت پـێکەوە لەسـەر یەك بـاخیرە لەسـاڵی ١٨٦١ بۆئەمریکـا گەشـت بـکەم، لەوێ نـایۆمی مۆرتیمـــۆر و کـــچەکەی و بەڕێـــزێکیش بەنـــاوی پـــۆڵ هرمـــان کەدوای بـــوو بەزاوای بەڕێـــز مۆرتیمۆر ببینم.

یەکێـــك لەئامـــاددەبووان پێکەنـــی و وتـــی: ڕووداوێکــت بیرهێنــامەوە، دزێــك پارەکــانمی دزی بەڵام پۆڵ هرمان بۆیگەڕاندمەوە.

_ پێشتر نەمبیستووە؟

_ چونکە پۆڵ هرمان تکای لێکردم دایبپۆشم لەبەر خێزانەکەی.

پیاوە دکتۆرەکە گەڕایەوە و وتی: لەسەر ئەوباخیرەیە؟ بیرم بێت ناوی لۆردمیر بوو کەنەدی بوو لەسەر ڕەچەتەیەکی ناسراو بەناوی (( ڕەچەتەی ڕاستی)) دوا وتی هەر مرۆڤێك دڵۆپێکی لێبخوات هەرچی لەسکیدایە دەیڵێت.

_ تاقیت کردەوە؟

_ چەندین جار و سەرکەوتویش بوو.

ئۆڤید لەکاتژمێرەکەی ڕوانی و بینی کاتی شەمەندەفەرەکەیەتی، ڕۆشت بۆ وێستگە و ئاماندا پێشوازی لێکرد و بەڕێکەوتن بۆهۆتێل.

ڕۆژی دواتر ئۆڤید بەبیانوی سەرئێشەوە لەژوورەکە مایەوە و ئاماندا بەتەنها ڕۆشت بۆپیاسەکردن ڕۆشتە دەرەوە.

هەرکە لەهۆتێلەکە ڕۆشتە دەرەوە دڵۆپێك لەم ڕەچەتەی ڕاستییەی لەبوتڵێك شەڕاب ناو کاتێ ئاماندا دەگەڕایەوە بۆهۆتێلەکە بینی ئاپۆڕایەك

خەڵـــك ڕێگاكەیـــان گرتـــووە، نزیـــك بـــویەوە و گەنجێكـی لەسـەر ڕێگـاكەدا بینـی كەوتبـوو خـوێنی لـــێ بەربـــوو وتبوویـــان كەوا ســـەیارەیەك پیایـــا كێشاوە.

ئامانـــدا ســـەیری ڕووخســـاری برینـــدارەكەی كـــردو شڵەژا وتی: هەی لەوە، دشمانە.

یەكێك لەئاپۆڕاكە وتی: دەیناسی؟

_ نا، لەپیاوێك دەچێت كە دەمناسی.

بەخێرایـــــی دكتـــــۆر هـــــات و گواســـــتیانەوە بۆهـۆتێلەكە. ئۆڤیـد فەرمـانی كـرد خـواردن بـبەن بـــۆ ژوورەكەی، لەســـــەر مێـــزەكە دانیشـــــت و ئاماندش بەرامبەری.

شەرابی ڕاستی پێشكەش دەكرد.

هێشـــتا نەگەشـــتە قـــوڕگی نیشـــانەكانی لەســـەر دەركەوت و دواتـــر بەدەنگـــی بەرز پێكەنـــی. چەنـــد ساتێكی كەم و هەرچی هەبوو دركاندی.

ئۆڤیـد زانـی كەوائامانـدا دەزانـێ ئەم وایكـردووە لە لوســـی، نیەتێتـــی وەدووی بكەوێـــت و ئاشـــكرای بكات.

بەدەنگـــی بەرز قســـەیدەکرد و ئۆڤێـــد هـــاواری لێکرد: دەمت داخە، دەنگت نزم بکەرەوە.

ڤیژانـدی: تۆ.....نـا..... مەحـاڵە بێـدەنگ بـم، ئەبـێ خەڵکی بزانن کەوا دزو بکوژ کێیە.

دواتـــر دەســـتی کـــردبە پەرپەچـــدانەوە و وڕێـــنەی دەکـــرد، دواتـــر پێکەنـــی و دەنگـــی کـــپ بـــوو، وشەکان لەدەمی دەرنەدەچوون.

لەپڕ لەسەر زەوی کەوت و لەهۆش چوو.

ئۆڤێـد بەخێرایـی دەسـتی گـرت و دەسـتی وەك بەفـر ساردبوو ترسا نەکا ڕەچەتەکە کوشتبێتی.

هەرچەنێـك لەشووشـــەکەدا مـــابوو بەتـــاڵی کـــردوو دەرگـــــای ژوورەکەی کـــــــردەوە و خـــــاوەن هـۆتێلەکەی بینـی چەنـد هەنگاوێـك لێـیەوە دوربـوو لەگەڵ کەسێکی دیکە قسەی دەکرد.

ئۆڤێـــد: دکتـــۆرم دەوێـــت، هـــاوڕێکەم لەهـــۆش چووە.

پیـــاوەکەی تـــر وتـــی: مـــن دکتـــۆرم گەورەم، لێـــرەم تابریندارێك چارەسەربکەم.

_ تکایە خێراکە و بیپشکنە.

دکتۆر ئاماندای پشکنیو دەرمانەکانی لەجانتاکەی دەرهێنا، دواتر بەرەو ئۆڤید ئاوڕی دایەوە و وتی: ئەگەر چارەکێك دوابکەوتمایە دەمرد بەڵام پێم بڵێ بۆچی ڕەچەتەی ڕاستیت پێداوە؟

_ ڕەچەتەی ڕاستی؟

_ واز لەنکۆڵی بێنە، گومانی تێدانییە ئەتویست نهێنی ئەم ئافرەتە بزانیت، پیاوی باش زیادەڕۆیت کردووە خەریکبوو بیکوژی.

_ گەورەم لەبەر هۆکاری مەترسیدار وامکرد.

_ لەسەر من نییە لەهۆکارەکەی بگەڕێم، ئەگەر من نەبوومایە میوانی گرتووخانە بویت، بەمەرجێك بەڵێنم پێبدەی جارێکی تر وانەکەی بە پۆلیس ناڵێم.

_ بەڵێنەدەم گەورەم.

دکتۆرەکە دوای ئەوەی جارێکی دیکە بەڵێنی لێوەرگرت ڕۆشت.

ڕۆژی یەکشەم هات و لوسیان وەك کاری هەمیشەیی نەهات بۆدیدەنی لوسی، گومان دڵی لوسی تەنی بوو، وتی: بێگومان پارەیان پێداوە تا وازم لێبێنێت، چوزانم لەوەیە چۆن چارەکە

ملیۆنێك یان ڕژاند لەبەردەممدا ئاواش ڕژاندبێتیانە بەردەمی تا واز لەمن بێنێت؟

بەدرێژایی ڕۆژەکە هەر لەچاوەڕوانی لوسیاندا بوو، جارێك بەردەم پەنجەرە و چاو لەڕێگا جارێکیش لەسەر جێگەکەی بوو ڕاکشابوو دەگریا شەوداهات، بێچارە بەرگەی نەگرت، وتی: دەڕۆم بۆخانەکەی تابزانم چیبووە.

دەرگاوانەکە وتی: بەڕێز لوسیان دوو ڕۆژە گەشتی کردووە.

_ گەشتی کردووە؟ نازانی بۆکوێ؟

_ نا.

_ کەی دەگەڕێتەوە؟

_ نازانم.

لوسی گەڕایەوە بوشوێنەکەی خۆی و ئەم گەشتە لەناکاوەی سەری سوڕماندبوو ولەهەمان کاتیشدا ترس.

چەند هەنگاوێك دوور نەکەوتبووە چاوی کەوتە سەر پەنجەرەکەی لوسیان، ڕووناکی لێوەدەهات، کەواتە گەشتی نەکردووە.

توڕەبـــوو گەڕایەوە لای دەرگـــاوانەکە و پیـــاوەکە بەرگـــری لەخـــۆی دەکـــرد و دەیـــوت: ئەو فەرمـــانی پێکردم وابڵێم هەرکات تۆپرسیت.

_ ئەو فەرمانی پێکردی؟

_ بەڵـــێ، وەســـفی تـــۆی بۆکردبـــووم، تـــۆ خـــاتو لوسی نیت؟

لوســـی پێویســـتی بەزیـــاتر نەبـــوو، بەگریـــانەوە گەڕایەوە بـــۆژوورەکەی و تێـــر وپـــڕ گریـــا، کەوتە ســـەر ســـنگی جـــان و دەیـــوت: جێـــی هێشـــتم، وازی لێهێنام.

باســـی خـــۆی و دەرگـــاوانەکەی بـــۆگێڕایەوە، و بەدەنگێکـــی لەرزۆکەوە وتـــی: ئێســـتا نرخـــی ژیـــان چییە لەدوای ئەو؟ مردن لەلام شیرینترە لەژیان.

جـــان دڵنەوایـــی دەکـــرد، لوســـی هـــاواری دەکـــرد: دەبێ بیبینم، دەبێ بزانم بۆچی جێی هێشتووم.

_ پێویســـت ناکـــات کچـــم، ڕاســـتیەکە زیـــاتر ئـــازارت دەدات.

_ چییەڵێی؟ دیارە شتێك دەزانی؟

_ نا، کچم هیچ نازانم.

_ بەڵام بۆچی منی جێهێشت؟ لەبەرئەوەی فڕەدراوم، هەژارم، خۆ پێشتر ئەوانەی دەزانی ئەبێ بڕۆم بۆلای.... هەرئێستا دەڕۆم وناچاری دەکەم هەموو شتێك بڵێت.

جان هەوڵیدەدا ڕێگری لێبکات و دەیوت: لوسیان تۆی خۆشەوێت، و خیانەتی لێنەکردویت، بەڵام هاوسەرگیریتان ئەستەمە.

_ ئەستەم؟ بۆچی؟ شتێك دەزانی. قسەبکە، باوکم دز بووە یان بکوژ؟

_ وا بەباوکت مەڵێ کچم باوکت باشترین کەس بووە.

_ ئەی دایکم؟

جان بێدەنگ بوو، نەیدەتوانی بڵێت: بەڵێ دایکت هۆکارە، دایکە بێتاوانەکەت هۆکاری دڵ شکاندنەکەتە.

_ قسەبکە.. چیتە بۆ بێدەنگی؟ لوسیان بۆچی بەجێی هێشتم؟ خەریکە شێتەبم.

وەکو شێتی لێهاتبوو لوسی.

_ لوسیان ناتوانی هاوسەرگیریت لەگەڵا بکات لەبەرئەوەی....

قسـەی بـۆنەکرا، ناچـار بەدەنگێکـی لەرزۆکەوە وتی: دایکت تۆمەتبارە بەکوشتنی باوکی.

لوسـی پـڕ بەپێسـتی قیژانـدی و وشـك بـوو لەجێگەی خۆی.

دوای کەمێـك وتـی: کەواتە دایکـم کـارگەکەی جـۆڵ لابرۆی سووتاندوە و کوشتویەتی؟

_ دایکت بێتاوانە؟

_ بەڵام ئەویان تۆمەتبارکردووە.

_ ئەسـتەمە، بیـرت چـووە لوسـیان خۆشـی پێـی وایە بێتاوانە؟

_ ئەگەر ئەوە ڕای بێت بۆچی بەجێی هێشتم؟

_ لەبەرئەوەی حـوکمی خەڵـك و دادگـا لەڕای ئەو بەهێزترە.

_ دایکمت دەناسی خانمەکەم؟

_ لەبەڕێزترین ژنەکانە کچم.

_ بێتاوانە؟

_ بێتاوانە نەفرەتی لێمەکە.

_ نەفرەتــی لێنــاکەم، داوای بەزەیــی بــۆکەم، بەڵام چـــــۆن ئەوە لەبیـــــربکەم کە ئەوهۆکـــــاری ئەم ئازارەمە.

_ ئەی ئەوکچـــم، مەگەر ئەویـــش نەیچەشـــتووە؟ لەبراکەت کراوە.

_ برام هەبوو؟

_ بەڵــــێ، کەس چارەنووســـی نازانێـــت ئێســـتا، دایکــت لەگرتووخــانە هەڵهــاتووە نەك بــۆ ئــازادی بەڵکو بۆئەوەی بەدوای تۆ و براکەتدا بگەڕێت.

جــان بەردەوام بــوو لەقســەکانی ئــارام بــوویەوە و خەوی لێکەوت.ئەوشـــــەوە جـــــان چـــــاوی لەیەك نەنا.

بەدرێژایـــی شـــەوەکە بەجۆرێـــك دەینـاڵانـــد وەکـــو ئەوەی پێشتر هیچ دایکێك نەیناڵاندبێت.

_ ١٢ _

ئـــاتیین ڕۆشـــت بۆســـەردانی لوســـیان ی هـــاوڕێی بینـــــی لاوازە و خەمبـــــارە وتـــــی: بـــــۆچی

ئاوا،خەمبـــاری هـــاوڕێکەم لایخـــۆی دڵخۆشـــبیت؟ مـــاری هرمـــان ســـەردانی کـــردم وتـــی بـــاوکم وەك هاوبەشی خۆی ڕاتدەگەینێت.

_ هـــاوڕێکەم نـــازانی کەوا چـــیم لێقەومـــاوە ئەگەر بزانی واناڵێیت.

_ چ لێقەومانێك؟

_ ئەوەی لەنێوان من و لوسی بوو نەما.

_ چۆن؟ بۆ؟

لوسیان بۆیگێڕایەوە...

_ کێ تۆمارەکانی پێدای؟

_ بەڕێز پۆڵ هرمان.

ســـەری ســـوڕما، وتـــی: چـــۆن دەســـتی کەوتـــووە؟ چـــۆن گریمـــانی ئەوەی کـــرد کەوا لوســـی کچـــی جـــان بێـــــت و گەڕاوە بەدوای تۆمارەکـــــان و بـــــۆتی هێنـــاوە؟ تـــۆبڵێی لوســـی بینیبێـــت و بڵێـــت کەوا لەجان ئەچێت؟

_ نازانم ئەوەیان پەیوەندی بەمنەوە نییە.

_ بەڵام پەیوەنـــدی بەمـــنەوە هەیە؟ پـــێم بڵـــێ، ئەو ئـــامێرەی کەباوکـــت دەیویســـت دروســـتیبکات پـــێش کوژرانی چیبوو؟

_ ئامێری سافکردن بوو.

_ لەهەمـــان ئەوئـــامێرە دەچێـــت کە پـــۆڵ هرمـــان دایهێناوە وپێی دەوڵەمەندبووە.

_ پێم وابێت.

ئـــــاتیین هەرکە گەڕایەوە مـــــاڵەوە دەســـــتەیەکی گەورەبیـــــرەوەری دەرهێنـــــا و دەســـــتی کـــــرد بەخوێندنەوەی.

هەمووی لەسەر سووتانی کارگەکە بوو.

لێبـــویەوە لەخوێنـــدنەوەی و ســـەری لەقانـــد و وتـــی: پـــێ ئەچـــێ زانیبێـــتم جـــاك جـــارۆد کێـــیە، بەڵام ســـەرەتا ئەبێـــت بەڵگەیەکـــم بەدەســـتەوە بێـــت، بەڵـــێ بەڵگە.

ئێستا هەنگاوێك بۆ دواوە...

کاتێـــك ئامانـــدا بەئاگـــا هـــاتەوە چـــاوی گێـــڕا بەدەوری خۆیـــدا و لەبـــارۆن ئارنۆڵـــد دی ڕیـــس واتە ( ئۆڤیـــد) ی پرسی کەوا چیبووە.

_ بەهـۆی خـواردنی ئێـوارەوە تێکچوویـت، ئەگەر بانگی دکتۆرم نەکردبایە دەمردیت.

_ سـەیرە، هـیچم بیـرنییە، بەڵام چـۆن بـۆ پێشـەکی وام لێهات.

پـێش ئەوەی وەڵامـی پرسـیارەکەی بـداتەوە لەدەرگـا دراو دکتـۆر وەژوورکەوت. ئامانـدای پشـکنی و وتـی: خـانمەکەم، ئێسـتا باشـتری مەترسیت لەسەرنەماوە.

_ بەڵام گەورەم چۆن وام لێهات؟

دکتـۆرەکە کەمێـك بێـدەنگ بـوو، دواتـر وتـی: لەبـارۆن بپرسـە ئەو ئەتـوانێ وەڵامـی پرسیارەکەت بداتەوە.

ئامانـدا بیـری لەقسـەکانی دکتـۆر دەکـردەوە و وتـی: ئەڵێـی شـتێکی شـارەوە لەقسـەکانیدایە، بێگومـان ژەهرخورادی کردووم.

هەڵـپەی دا بەرەو بـوتڵی شـەرابەکە بەڵام بەتـاڵبوو هیچـی تیـانەبوو، بەخـۆی وت: ئێسـتا تێگەشـتم، تەنیـا دووپـێکم لەمە خـواردەوە بەڵام بەتـاڵی کـردووە تـا ئاشـکرانەبێت هەردیـارە ژەهری تێکردووە تابمکوژێت.

ئەو ئێـوارەیە ئۆڤێـد لەکەنـار دەریـا پیاسـەی دەکـرد و ئامانــداش لەهــۆتێلەکە مــابوویەوە، کەشــەکەی تونــدبوو کـــڵاوی پیرەپیاوێـــك لەبەردەم قـــاچی ئۆڤێـدکەوت ئۆڤێـد خێـرا کـڵاوەکەی هەڵگـرت ودای بەپیرەپیـــاوەکە. پیـــاوە پیـــرەکە سوپاســـی کـــرد و وتی: زۆر سوپاس گەورەم....... من..........

قسـەی بـڕی و لە ئۆڤێـدی دەڕوانـی، هـاواری لـێ بەرزبوویەوە و وتی: لێرەی! ئەتناسمەوە...

ئۆڤێـد شـڵەژاو وتـی: بەداخەوەم گەورەم بیـرم نیـیە بەخزمەت یەك گەشتبین.

_ چـــۆن؟ ڕینـــیە بۆســـکت لەبیرچـــوو ئەوەی پارەکانت لێ دزیبوو لەسەر باخیرەی لۆردمیر؟

ئۆڤێـــد هەرکە ئەم قســـانەی بیســـت ســـاتێکیش نەوەســـتا یەکســـەر گەڕایەوە بـــۆژوورەکەی و ترس شپرزەی کردبوو.

ئۆڤێـــد ئەو ئێـــوارە لەژوورەکەی مـــایەوە و ڕۆژنــامەی دەخوێنــدەوە، ئامانــداش لەبــاخچەکە پیاســـەی دەکـــرد. دانیشـــتوو دەنگـــی نـــامۆی دەبیســت، گـوێی لەپیاوێـك بـوو دەیـوت: پیـاوەکە کـڵاوەکەی هەڵگـرت و بۆیگەڕانـدمەوە، کـاتێ لـێم ڕوانی زانیم یەکێکە لەگەورە تاوانبارەکان.

دەنگێکی دیکە کەئاماندا ناسییەوە دکتۆرەکە بوو، وتی: ئەو لەهوتێلی (( ڕاوچییەکان))، ناوی بارۆن ئاڕنۆڵد دی ڕیسە.

_ بارۆن ئارنۆڵد دی ڕیس، ناوێکی ساختەیە، تاوانبارە ناوی ئۆڤید سۆلیفەرە هەرئەوەی وادوێنێ بۆتانم باسکرد ئەوەی کەپارەکەی دزی بووم ئەگەر پۆڵ هرمان نەبوایە ئێستا میوانی گرتووخانەبوو.

دکتۆرەکە: دوێنێ ئەوەندەی نەمابوو ببێت بەبکوژ، بڕێك ئەو ڕەچەتە هندییە سەیرەی تێکەڵ بەخواردنەوەی هاوڕێکەی کردبوو تانهێنی لێ دەربکات بەڵام زیادەڕۆی کردبوو لەتێکەڵکردنی و خەریکبوو بیکوژێت.

کاتێ ئەم قسانەیان دەکرد ئاماندا لەپشت دارەکان خۆی حەشاردابوو گوێی بۆهەڵخستبوون بەوردی.

بەخۆی وت: ئێستا نهێنیەکەیم زانی، ناوی ئۆڤید سۆلیفەرە و بەڕێز پۆڵ هرمان چاوی لێیەتی. هەوڵی دا لوسی بکوژێت بەرگدووری کچەکەی پۆڵ هرمان، بێگومان نهێنیەکی شاراوە لەپشت

ئەم بکـــوژە و پـــۆڵ هرمـــانە. ئەبـــێ چیبێـــت ئەم پەیوەندییە؟ ئەوەیە ئەبێت بیزانم.

کـــاتێ ئامانـــدا گەڕایەوە بـــۆژوورەکەی بینـــی ســـۆلیفەر چـــاوەڕوانیەتی، وتـــی: بۆبـــابەتێکی مەترسیدار بۆماوەی دوو ڕۆژ دەڕۆم بۆپاریس.

_ کەی دەڕۆیت؟

_ هەر ئێستا.

مـــاچی کـــرد و دوای ئەوەی جانتـــاکەی هەڵگـــرت لەژوورەکەی وەدەرکەوت.

ئامانـــدا لەزەنگـــۆڵەکەی داو بەخزمەتکـــارەکەی وت: ئەمەوێ ئەو برینـــــــدارەی ســـــــەیارەکە پیاياکێشابوو ببینم بەڵام بەنهێنی.

شـــتێك پـــارەی پێـــداو خزمەتکـــارەکە وتـــی: ڕێکیدەخەم دڵنیابە.

ئەو برینـــــدارەش ڕاووڵ دشـــــمانی کارمەنـــــدی خـــانەی پارێزگـــابوو لەجـــوانی. کەتۆمـــاری لوســـی دەرهێنابوو و دای بەئۆڤید.

خزمەتکـــارەکە قســـەی خـــۆی بردەســـەر و بەنهێنـــی بۆی ڕێکخست.

کاتێ ئاماندا وەڕوورکەوت سەری سوڕمابوو وتی: ئاماندا!؟ تولێرەی!؟

دشمان ڕاکشابوو نەیدەتوانی بجوڵێت ئاماندا لەسەرخۆ دەستەکانی گرت و وتی: هاتووم لەشتێکی مەترسیدار ئاگادارت بکەمەوە ڕاووڵ.

_ چی؟

_ بارۆن ئاڕنۆڵد دی ڕیس دەناسی؟ مەبەستم ئەوپیاوەی کەپێش چەند مانگێك لەجوانی دانیپێدانانەکەی منی کڕی؟

_ نەفرەتی لێبێت، ئەو سەنەدانەشی لەبازرگانی شەڕابەکە بردووە کەساختەم کردبوو.

_ دووژمن مانە ڕاووڵ ئەیەوێت تێوەمان بگلێنێت.

هەرچی زانیبوو لەسەر ئۆڤید و تاوانەکانی بۆیگێڕایەوە.

ئاماندا: ئێستا ئەبێت تۆڵەی لێبکەینەوە. بەشدارئەبی لەگەڵم؟

_ لەناخی دڵمەوە.

_ ئەبێ سەربکەوین، هەرکات چاکبویتەوە دەست پێدەکەین، دووژمنێکی مەترسیدارە بەڵام هەرئەبێ سەربکەوین.

_ ١٣ _

لەلایەن ئاتیینەوە نامەی بانگهێشتی چاخواردنەوە نێردرا بۆ لوسیان، کاتێ ڕۆشت دانیشت و وتی: جارێك وتت کەوا پۆڵ هرمان تۆمارەکەی لوسی پێداوی.

_ بەڵێ.

_ هێشتا پێتە؟

_ بەڵێ.

_ تکایە سبەینێ بۆم بێنە بۆ کارێك پێویستمە.

_ ئەبینم زۆر گرنگە بەلاتەوە ئەم بابەتە.

_ لەبەرئەوەی خەریکە بکوژەکەی باوکت ئاشکرادەکەم.

لوسـيان بەسەرسـامييەوە هـاواری کـرد، وتـی: بەڕاسـتيتە، ئەگەر وابـکەی هەتامـاوم قەرزارت ئەبم.

_ ئـارامبگرە تـا لێکـۆڵينەوەکە تەواوئەبێـت، بەوبـۆنەوەيە پـۆڵ هرمـان و کچەکەيـم بـۆ چاخواردنەوە بانگهێشت کردووە.

_ بـۆچی کۆمـان دەکەيـتەوە لەکاتێکـدا نامەوێـت بيان بينم؟

_ کارم هەيە.

لەدەرگـا دراو پـۆڵ هرمـان و کـچەکەی وەژوورکەوتـن، سـەرەڕای ئەو ئـازارەی لەسـنگيدا بـوو هەرکە مـاری لوسـيانی بينـی گۆناکـانی سـوورهەڵگەڕان و لەبەختەوەرتـين ئافرەتەکانی دوونيا دەچوو.

کاتێـك لەچـا خـواردنەوە لێبـونەوە ئـاتيين وتـی: وەرن بائێسـتا کۆتـا تابلۆکـانی خۆمتـان پـێ پيشـان بدەم.

لەکۆتايـدا لەبەردەم تـابلۆيەکی گەورە کەبەتەواوی ديـواری ژوورەکەی داگيرکردبـوو وەسـتان و ئـاتيين پەردەی لەسـەر لابـرد و وتـی: ئەم تـابلۆيە وێنـای کارەسـاتێکی دڵـتەزێن ئەکـات

ئەوکاتەی کەکارگەکەی باوکت لەناوچوو لوسیان، لەوکەسانەش کەتێیدایە ئەو ژنەیە کەتۆمەتبارکرابوو بەکوشتنی باوکت.

ئاتیین بەدەم ئەم قسانەوە بە وردی لەپۆڵ هرمانی دەڕوانی. جاك بەخراپی پەشۆکا و شڵەژاوبوو، بەڵام کۆنتڕۆڵی خۆی کردبوو.

_ ئەم منداڵە بچوکەش کوڕی خاتوو دارییە یە خوشکی قەشەی ناوچەکە، و ئێستاش یەکێکە لەبەناوبانگترین پارێزەرەکان مەبەستم جۆرج دارییە یە.

لوسیان: سەیرە، ئەو تۆمەتبارە بەتەواوی لەژنێك دەچێت کەئاشناییم.

ئاتیین: مەبەستت لوسی بەرگدوورە؟

_ نا، بەڵکو ژنێکی پەنچا ساڵە بەناوی لیزا بیرین نان فرۆشە، ئەهلی ئاڵفۆرتفێڵە و وتی لەئاشنایانی باوکمە.

ئاتیین بەخۆی وت: ئەم پیاوە کاتێك تابلۆکەی بینی بەخراپی شڵەژا، ڕوانینەکانی ترس بوو، ئەکرێ جاك جارۆد بێت؟ هەر لەوکاتەوەی زانیم داهێنەری ئامێری سافکردنە گومانم بۆدروست بوو، کەواتە ئەمە کاغەزەکانی لابرۆی دزیووە،

ئەم ئـــــامێرە لەئەمریکــــا دەرکەوت و دەیزانــــی لوســی کچــی جــانە، ئەبــێ چــۆن زانیبێتــی ئیتــر؟ بەڵــێ، ئەبــێ جــاك بێــت. بەڵام کــوا بەڵــگە ئەمەم کەمە.

لەو دەمەدا بەهــــۆی تـــــایەکی زۆرەوە لوســــــی لەسەر جێگا کەوتبوو.

جــان ڕۆژی لاکردبــۆوە هەتــا ئەوکــاتەی زانــی کەوا مەترسـی لەسـەر نەمـاوە بەخـۆی وت: ئێسـتا ئەبـێ ئەم کاغەزانە بگەڕێنمەوە بۆخاوەنەکەی.

ئەو کـــاغەزانەش جـــان چەنـــد ڕۆژێـــك پێشـــتر دۆزیبــویەوە تـــایبەت بەدۆســـیەیەك هــی جــۆرج داریـــیە بـــوو، بەڵام بەهـــۆی پەیوەســـت بـــوونی بەکچەکەیەوە نەیەتوانی بڕوات.

جـان فایلەکـانی هەڵگـرت و بۆمـاڵی پـارێزەر داریـیە بەڕێـــــکەوت. داوای لێکــــرد و وتــــی: گەورەم ئەتوانم داوایەکت لێبکەم.

_ چاوەڕێتم خانمەکەم.

_ هـــــاوڕێیەکی دەربەدەرم هەیە، دەرکـــــــراوە لەئیشــەکەی بەبــێ ئەوەی تــاوانێکی هەبێــت تەنهــا تــاوانی ئەوە بــووە، کە کچــی ژنێــك بــووە کەوا حوکمی زیندانی بۆدەرچووە.

_ چۆن ستەمی لێکراوە؟

_ نەیارەکانی شکاتیان لێکردووە لەلای خاوەن کارگەی بەرگدورییەکە کەوا کاری لێکات و وتویانە کەوا دایکی تاوانبارە، ئیتر ئەویش دەری کردووە. هیچ یاسایەك هەیە سزای هەبێت بۆئەم کارە؟

_ نکۆڵی ناکەم خانمەکەم کەوا کارێکی ناشرینە و تاوانە، بەڵام بەداخەوە یاسا بەتاوانی هەژمارناکات.

_ یاسایەکی گەندەڵە.

_ وایە خانمەکەم.

جۆرج هەستی بەسۆز دەکرد بەرامبەری و جانیش بەهەمان شێوە بەبێ ئەوەی بزانێت کەوا کوڕیەتی.

لەم قسانەدابوون خزمەتکارەکە وەژوورکەوت و وتی: گەورەم بەڕێز پۆڵ هرمان.

جان هەرکە گوێی لەم ناوە بوو گوێ قوڵاخ بوو وتی: پۆڵ هرمان، گەورەم ئەم کەسە هۆکاری ئەم دەردەسەریەیە.

_ لەوەدەچێت باسی لوسی دەزگیرانی لوسیان بکەی؟

_ بەڵێ، بەڵێ، گەورەم.

_ دەوەرە باداوا لەبەڕێز پۆڵ هرمان بکەین باتکا لەخاوەن کارەکەی لوسی بکات تابیگەڕێنێیەوە.

دەستی گرت و بەپۆڵ هرمانی وت: ئەم خاتوونە بەڕێزە هاتووە تالەبارەی لوسی فۆرتییە قسەت لەگەڵا بکات ناوی لیزا بیرینە، نان فرۆشە لوسی دەناسێت.

جاك لەلای ئاتیین ناوی ئەم ژنەی بیستبوو بیستبووشی کەوا زۆر لەجان فۆرتییە دەچێت.

لێی ڕوانی و یەکسەر ناسیەوە، تەنها دەنگی بەسبوو تابزانێت جانە، خۆی گرت و وتی: چیت لەمن دەوێت خانمەکەم؟

_ لێتەپاڕێمەوە لوسی ڕزگاربکە، لەبرسا دەمرێت، دەس بۆهەر ئیشێك ئەبات ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەخاتوو ئۆگستین ەوە دەکەن و ئەویش دەڵێت کەوا دایکی تاوانبارە بۆ هیچ بەزەییەك دەرگای لەسەر دادەخەن.

_ بەمن چی ئەگەر دایکی خوێن مژە؟

_ بێجگە لەوە هیچی ترت نییە بیڵێیت گەورەم؟ داوای هاوکاریت لێکەم بێجگە لەتۆ کەسی تر ناتوانێ یارمەتی بدات.

جاك بەخۆی وت: منی نەناسیەوە، بەڵام خۆ من ئەوم ناسیەوە، بۆچی ئەم هەلە نەقۆزمەوە و بۆهەمیشە لەکۆڵی خۆمی بکەمەوە.

_ خانمەکەم، تۆبەشێوەیەکی پڕ کاردانەوەوە قسەدەکەی واگومانەکەم هاوڕێی بیت، دوێنێ لای هاوڕێیەکی وێنەگرم وێنەی جان فۆرتییەی تاوانبارم بینی ئەتوانم بڵێم لێکچونێك لەنێوانتاندا هەیە.

جان شڵەژا، جاك هاواری کرد: کەواتە تۆ لیزا بیرینی، تۆ جانی هەڵهاتووی، ئەبێ قۆڵبەست بکرێیت خانمەکەم، خۆم بانگی پیاوانی پۆلیس دەکەم.

بەڵام جۆرج ڕەتی کردەوە و وتی: ناتوانم ڕێگەی ئەوەت پێبدەم گەورەم.

دواتر ڕووی لە جان کرد و وتی: خانمەکەم، هەتا لەژێر سەقفی منابیت ئەتوانی بەسەلامەتی بڕۆیت بێ ئەوەی ئازارت پێ بگات.

جـــان ڕۆشـــت؛ خەریکبـــوو ئەبـــورایەوە. پـــۆڵ هرمـــان ویســـتی وەدوی بکەوێـــت بەڵام جـــۆرج داریـــیە پێشـــی لێگـــرت و وتـــی: گەورەم ئـــارەزوی قۆڵبەســـت کردنـــی ئەو ژنە لەلایەن تـــۆوە ئەمخـــاتە گومانەوە لەسەرت وەك چۆن تۆ گومانت لێکرد.

لەبەردەم ئەم وشـــانە پـــۆڵ هرمـــان پێـــی باشـــتربوو بکشێتەوە.

کـــاتێ پـــۆڵ هرمـــان گەڕایەوە بۆمـــاڵەکەی خـــۆی بـــــانگی ئۆڤیـــــد کـــــردوو هەمـــــوو ڕووداو و پێشـــهاتەکانی بـــۆگێڕایەوە و نەیـــدەزانی کەوا کۆتـــا شـــت کەدەیکـــات بینینـــی جـــانە، و چـــۆن هەوڵیـــداوە قۆڵبەســـتی بکـــات ئەگەر جـــۆرج داریـــیە ڕێگـــری لێنەکردایە.

پـــۆڵ: ویســـتم پـــۆلیس ئاگـــاداربکەمەوە بەڵام ترســـام خـــۆم ئاشـــکرابکەم و جـــۆرج داریـــیە زیـــاتر گومـــان بکات.

_ فەرمان بەچییەکەی؟

_ کوشتن باشترین چارەسەرە.

_ کوشـــتن زیـــاتر گومانـــاوی دەبێـــت، پـــۆلیس پەیوەنـــدییەك لەنێـــوان هێرشـــەکەی لوســـی و

کوشتنی جان دەدۆزێتەوە ئەگەر ئەوکات ڕوویدا ئێمە لەناودەچین.

_ کەواتە چی؟

_ بەڕێگایەکی دیکە لەناوی دەبەم، بەجۆرێك ڕێکی خەم وەکو ئەوەی ڕووداوبێت.

_ پێکات، ئەوەکارە ڕاستەکەیە.

ناونیشانەکەی پێدا و وەسفیشی کرد بۆی.

دوای نیو کاتژمێر ئۆڤید چۆڵی کرد و بیری سەرقاڵ بوو بەوەی چۆن جان لەناوببات.

هەمان شەو؛ کاتژمێرێك پێش خۆرهەڵاتن ئۆڤید خانەکەی بەجێهێشت و لەکوچێکی نزیك شەقامی بۆربۆرن نزیك خانەکەی جان وەستا.

نزیکی کاتژمێر پێنجی بەیانی ژنێکی بەهەمان ئەو وەسفە بینی کەوا جاك بۆیکردبوو، وەدووی کەوت، هەتا گەشتە نانەواخانەکە و هاوڕێکانی بەلیزا ناویان برد زانی جانە.

بەدرێژایی ڕۆژ شەقام بەشەقام ماڵ بەماڵ وەدووی بوو، هەتا تەواو ئاشنابوو بۆکوێ دەڕوات و بۆکوێ ناڕوات.

ئێــوارەکەی گەڕایەوە خــانەکەی بەخــۆی وت: بــێ ئەمــــلاو لا ئەجەلـــــی هـــاتووە، بیکــــوژم هـــیچ مەترسییەك نامێنێتەوە.

_ ١٤ _

ئـــــاتیین دووبــــارە لەبکـــوژی جـــۆڵ لابــــرۆی دەکـــــۆڵیەوە، تۆمــــــارە دڕاوەکەی لە لوســــــیان وەرگرتبـــوو و ڕۆشــــت بـــۆ جـــوانی تاپیشــــانی پارێزگـارەکەی بـدات، وتـی: ئەمە دزییـیە، ئـاخۆ کـێ کردبێتـــی؟ بێگومــــان ڕاووڵ دشـــمانە دوای ئەوەی چـــاوی بەپیـــاوێکی پاریســــی دەوڵەمەنــــد کەلە ناوچەکەدا دەرکەوتووە کەوتووە.

_ لەکوێیە ئەم دشمان ناوە؟

_ دەرکـــراوە لەکـــارەکەی ڕۆشـــتووە بۆپـــاریس، ئاگـــــادارکراینەوە کەوا توشــــــی ڕووداو بــــوو و گـــوازراوەتەوە بـــۆ هـــوتێلی (( ڕاوچییەکـــان)) لە فونتنبلو.

ئاتیین بێ دوو دڵی بەڕێکەوت.

خاوەن هۆتێلەکە: ڕاستە گەورەم، گوازراوەتەوە بۆئێرە، بەڵام ئەوڕۆ گەشتی کرد بۆپاریس وتی ڕۆژی یەکشەم لەگەڵ خاتوو ئاماندا دەگەڕێتەوە.

_ ئەوخاتوون کێیە؟

_ هاوڕێی بارۆن ئارنۆڵد دی ڕیسە.

ئاتیین لەجوانی زانیبووی ئەم بارۆنە دشمانی تێوەگلاندووە، وتی: کەواتە بارۆن هاوڕێی دشمانە.

_ نا، تابارۆن نەڕۆشت ئاماندا چاوی بەدشمان نەکەوت.

_ ناونیشانی ئەم بارۆنە دەزانی؟

_ بەڵێ لەتۆمارەکەدا نوسراوە.

بەڵام لەپاریس ئەو ناونیشانەی پێیان دابوو بارۆنی لێنەدۆزییەوە، زانی ناونیشانی ساختەی پێداون.

بەخۆی وت: ئەگەر هەر سێکەیان کۆبکەمەوە نهێنییەکە ئاشکرادەبێت بەڵام بەچییەچێت ناونیشانی هیچیان نازانم.

بە ناوئومێدییەوە گەڕایەوەماڵەوە.

ڕۆژی دواتــر ئــاتیین ڕۆشــت بۆســەردانی جــۆرج، ئەوەی لەنێـــوان جـــان و پـــۆڵ ڕوویـــدابوو بـۆیگێڕایەوە و چـۆن ویسـتویەتی قۆڵبەسـتی کـات ئەگەر جۆرج نەبوایە.

_ سـەیرە، هەر مەسـەلەیەك پەیوەنـدی بەجـانەوە هەبێـت پەنچەیەکـی ئەم پـۆڵ هرمـانەی تیـایە، بەوچی؟ بۆ ئەبێ ئەوەندە گرنگ بێت بەلایەوە؟

_ گومانت هەیە؟

_ بەڵـێ، وەکـو پـێم وتـی پـێم وابێـت جـاك جـارۆدە، تەنهـا بەڵگەیەکـم کەمە، بەڵام دڵنیـام چـاوەڕوانیم درێژە ناکێشێ.

ئۆڤیـدیش لەلایەکـی دیـکەوە بیـری لەلەنـاوبردنی جان دەکردەوە.

وەك پێشـــتر وتمـــان وەدووی کەوتبـــوو هەمـــوو ڕێگا و کونجێکی دەزانی کەوا دەیگرتەبەر.

ڕۆژێـــك گـــونێیەکی پـــڕ لەبەرد کردبـــوو لەســـەر دیـــواری یەکێـــك لەمـــاڵە چۆڵەکـــان لەچـــاوەڕوانی جانـــدا وەســـتابوو بینـــی لەدوورەوە بەمانـــدوێتی دێت.

کاتێك ووردە ووردە گەشتە بەردەم ماڵەکە کیسە بەردەکەی هاویشتە سەر سەری جان و خۆشی کەوت.

جان وئەو غولامەی کەلەپێشی دەڕۆشت لەسەر زەوی کەوتن، خوێن لەبرینەکانیان دەچۆڕی. غولامەکە دەسبەجێ مرد، جانیش تەنها ڕووشان و برینی سوکی هەبوو.

بەڵام کاتێك ئۆڤید بینی لەسەر زەوی کەوتووە وایزانی مردووە خێرا ڕۆشت بۆلای جاك تاوەکو پێی بڵێت.

سەحەری یەکشەمە ئاتیین بەمەبەستی بینینی ئاماندا و دشمان بەرەو هۆتێلەکە بەڕێکەوت.

زۆر چاوەڕوانی نەکێشا و خزمەتکارەکە هەواڵی هاتنی پێدان ئاتیین خۆی پێناساند و وتی: هاتووم لەسەر پۆڵ هرمان قسەتان لەگەڵا بکەم، بەڕێز دشمان تۆ بویت تۆمارەکەت لێکردۆتەوە و داوتە بەبارۆن ئاڕنۆڵد؟

سەرتا دشمان ویستی نکۆڵی لێبکات بەلام ئاماندا وتی: بۆچی نکۆڵی لێکەیت؟ بەڵێ، ئەو کردی، ئەو پیاوە پارەی پێدابوو، بەلام تۆڵەکەینەوە.

ئاماندا باسی کاغەزە ساختەکانی بۆکرد و چۆن بارۆن پاراستویەتی تا وەکو چەکێك بەکاری بهێنێت، و ئێستا لەدوویەوەن تابیگەڕێننیەوە. نازناوی بارۆنیشی ساختەیە.

هەرچی دەربارەی تاوانەکانی زانیبوی بۆیگێڕایەوە و ناوی ئۆڤید سۆلیفەرە، و بۆ پۆڵ هرمان کاردەکات.

_ ئەمە هەمووگومانەکانم ڕاستەکاتەوە، پێم وابێت پۆڵ هرمانیش ناوەکەی ساختەکەیە و ناو جاك جارۆدە، ئەگەر بەدوای تۆڵەوەن بۆچی لەگەڵم نابن تا ناوی ئەو جانە داماوەش پاکبکەینەوە؟

هەرسێکەیان ڕێککەوتن، پیلانێکی تۆکمەیان دانا تاوەکو سەربکەوێت.

ئاتیین: بەڕای من نامەیەك بنێرین بۆ پۆڵ هرمان بەنای ئۆڤیدەوە و داوای لێبکەین (( ئەم ئێوارەیە لەماڵەکەم بم بینە)).

لەوکاتەدا دشمان لەنزیك ماڵی جاك دەبێت، هەرکە بینی وەدەرکەوێت وەدووی بکەوێت، بەم شێوەیە بەئاسانی شوێنی ئۆڤید ئاشکراکەین.

## _ ١٦ _

کاتێــــك ئۆڤیــــد زانــــی جــــان نەمــــردووە، ئەو بەردانەش کە کەوتبــوونە ســەری تەنهــا تووشــی برینــی ســوکی کردبــوو و چەنــد ڕۆژێکــی کەم و چــاکببوەوە، نــامەیەکی نــارد بــۆ بــنکەی پــۆلیس و ئاگــاداری کــــردنەوە کەوا لیـــزا بیـــرین جـــان فۆرتییەیە.

لەو شــوێنەی کە نــامەکەی دەنووســی ئەو بــاڕە بــوو کەوا نانەواخانەکــان تیایــدا کۆدەبــونەوە جانیــان دەناســی، هەموویــان جانیــان خۆشدەویســت و ڕێزیــــان دەگــــرت، بەهــــۆی چــــاکبونەوەی دەیانویست ئاهەنگ بگێڕن.

کاتێــك ئۆڤیــد بەمەی زانــی دانیشــت هاوبەشــی کــردن تەنــانەت لەئامــادەکردنی پێــنج فرەنکــی دا کەبڕێکی زۆره تاکارەکەی پێ ئاسان بکات.

بەبیــری هــات ڕەچەتەی ڕاســتیەکەی دەرخــوارد بــدات، تــاوەکو تــاپۆلیس دەگەن وابــزانن ســەر خۆشــبووە و نــاوی ڕاســتی خــۆی وتــووە و خــۆی ئاشکراکردووە.

واڕێــــکەوت لەوکــــاتەدا خــــاتوو ئۆگســــتین کــــارێکی بەئامانــــدا ڕاســــپاردبوو، بەو شــــەقامە تێــــپەڕی و لەشوشــــەکەوە ڕووی ئۆڤیــــدی بینــــی، لەدەرگــــایەکی دیــــکە بــــێجگە لەدەرگــــای ســــەرەکی وەژوورکەوت و لەکونجێــــك بــــۆ ئەوەی ئەو ببینێــــت دانیشــــت، بەهیوای چوونەدەرەوەی و شوێن کەوتنی.

کــــاتێ دانیشــــتبوو گارســــۆنەکە هــــات بــــۆلای ولێــــی پرســــی کە چییەخــــوات، پێــــی وت کەواتە بەخۆشــــی لیزابیرینەوە ئاهەنگ ئەگێڕن.

گارســــۆنەکە وایزانــــی وەکــــو نانەواکــــانی دیــــکە ڕێزی جان دەگرێت.

ئۆڤیــــد جوتێــــك گــــوارەی فەیــــرۆزی دەرهێنــــا و بەگارۆســــــۆنەکەی وت: ئەم جــــــووتە گــــــوارەیە پێشکەشی لیزادەکەم، لەکاتی ئاهەنگ گێڕانەکە.

ئەم جــووتەش بۆتــۆ ئەگەر یــارمەتیم بــدەی لەوەی ئەمەوێ.

گارسۆنەکە سەرسامبوو وتی: چیتەوێت؟

_ مــن شــتێك لەســەر لیــزا دەزانــم ئێــوە نــایزانن، دەنگێکــــــــی خۆشــــــــی هەیە، بەڵام دوای ئەوەی بەســــەر ئەوکەســــەی خۆشــیەوێت هــاتووە گــۆڕانی

ناڵێـت، ئەمەوێـت جـارێکی دیـکە گـوێم لەدەنگـی بێت.

_ کەواتە چی؟

_ خـواردنەوەیەکی هنـدی سەرسـوڕهێنەرم لایە هەرکەس بیخـواتەوە خەمـی لەبیـردەچێتەوە و گـۆرانی دەڵێـت، ئەگەر دوو دڵـۆپ بخەیـتە نـاو شەرابەکەی ئەم جووتە گوارەت پێدەدەم.

_ زۆر ئاسانە، بەڵام ئەترسم ئازاری بدات.

_ چـۆن ئـازاری بـدات؟ بـۆچی بمەوێـت ئـازاری بـدەم؟ ئەوەی ئەمەوێـت تەنهـا چێـژ بینیـنە لەدەنگی.

_ بەڵام چۆن لەبەردەم ئەم هەمووە پێی دەدەی؟

_ شوشـەیەکی بچوکـت پێـدەدەم سـێ دڵـۆپ لەو شوشـە لەشـەرابەکە بـکە و جـووتە گـوارەکەت پێدەدەم.

خزمەتکـارەکە قایـل بـوو و جـووتە گـوارەکە و شوشـەکەی لێسـەند، ڕوشـتە ئەو ژوورەی ئاماندای لێبـوو، ئامانـدا دەسـتی گـرت و لەچـاوی ئۆڤیـد دووری خسـتەوە، وتـی: بیسـتم لەگەڵ ئەو پیـاوە باسـی چیتـان دەکـرد، ئەیەوێـت بەو شـەرابە

ئەو ئــافرەتە لەناوببــات، ئــازاری بــدات، وەك چــۆن نیەتــی ئەو پیــاوە ئەزانــم ئــاواش دەزانــم شــەرابەکە بۆچییە.

گومــانم نیــیە واتزانیــوە ئــازاری نــادات بــۆیە قایــل بویت، بەڵام پێچەوانەیە.

لەبەرئەوەی خزمەتکـــــارەکە وەك نانەواکـــــانی دیـــکە جـــانی خۆشەویســـت تـــووڕە بـــوو، وتـــی: بۆیـــدەگەڕێنمەوە و جـــووتە گـــوارەکەش فـــڕەدەدەمە سەروچاویا.

_ نا، بەڵکو هەڵی بگرە، باوابزانێ ڕازی بویت.

_ چۆن؟

_ لەبـــری خـــواردنەوەکەی جـــان لەخـــواردنەوەکەی ئەوی بکە.

_ شەرابەکە چی لێدەکات؟

_ هەرکەس بیخـــواتەوە نهێنـــی خـــۆی ئەدرکێنـــێ، ئەگەر بیخـــــواتەوە دان بەتاوەنەکەیـــــدا دەنێـــــت لەبەردەم ئامادەبووانـــــــدا، تاوانەکـــــــانی بە لەســـێدارەدان کۆتـــایی پێـــدێت، ئەگەر بیخـــواتەوە خەڵکـــی نـــیەتە پیســـەکەی ئەزانـــن و ئەزانـــن کەوا دوژمنی جانە.

_ کەواتە دڵنیابە لیزا نایخواتەوە، بەڵام کێیە ئەم پیاوە؟ ئەمەوێ بە خاوەن بارەکە بڵێم.

_ وانەکەیت، دەری بکات ڕیسەکەمان ئەبێتە خوری.

_ کەواتە لەناوی دەکەم و بێدەنگ دەبم.

ئاماندا دووسەد فرەنکی درەهێنا وپێیدا دواتر گەڕایەوە بۆکارگە.

هەموان دانیشتبوون و جانیان لەناوەڕاستی خۆیاندا دانابوو، لەبەردەمیشیدا چەپکێك گوڵ.

لەم کاتەدا دوو پۆلیس وەژوورکەوتن، ئۆڤیدیش لەنزیکی جان، دڵنیابوو لەوەی ئەم دوو پۆلیسە بۆجان هاتوون، بەڵام هەتا دانی پێدانەنێت واناکەن.

هەموان دڵخۆش بوون بێجگە لەئاماندا کە لەکارگەکە گەڕایەوە و لەدوورەوە چاودێری دەکردن، ئارامی لێ بڕابوو هەرچاوەڕوانبوو شەرابەکە کاری خۆی لەسەر ئۆڤید بکات.

کاتژمێر سێ لەخواردنەوە لێبونەوە، خزمەتکارەکە قاوەی دا بەهەمووان، دڵۆپێکی

لەوەی ئۆڤید کردبــوو، ئەویــش وایزانــی لەوەی جانی کردووە.

کــاتێ تەواوبــوون ئۆڤیــد کەوتە وەســفکردنی جــان و جــووتە گــوارەکەی بەهەدیــیە پێــدا هەمــووان چەپڵەیان لێدا لەپای ئەو کارە.

ئۆڤیــد دەســتی خســتە ســەرتوێڵی، خــواردنەوەکە خەریکبـــــــوو کـــــــاریگەری دەردەکەوت، ئامــادەبوانیش سەرســامبوون لەوەی کە دەیــانبینی چاوەکــانی ســوور ببــونەوە، خــاوەن هــۆتێلەکە پێــی وت: بەڕێز لوبرین چیتە؟

ئۆڤیــد بەدەنگــی بەرز پێکەنــی و وتــی: گەمــژە نــاوم لــوبرین نیــیە، نــاوم ئۆڤیــد ســۆلیفەرە، لەشــوێنێك دەژیــم پــۆڵ هرمــان ی کــوڕە خــاڵم ئەو پیــاوە دەوڵەمەندە بۆی دابین کردووم.

جــان تەزیــیەك بەلەشــیداهات کاتێــك گــوێی لەو نــاوەبوو، هەمــوان بەوەی ئۆڤیــد سەرســامبوون، بەردەوام بــوو لەقســەکردن: ئێــوە پــۆڵ هرمــان دەناســن، خــاوەنی کــارگەی کورینــوای بەناوبــانگە پــێم وتــن خــۆ کــوڕە خــاڵمە. بەڵام درۆم کــرد، تەنــانەت کــوڕە خاڵیشــم نیــیە لەپیــاوانی خــانەدانیش نییە، بەڵکو دز و بکوژە.

بەڵێ بیست و دووساڵ پێش ئێستا ناسیم، لەسەر باخیرەیەك بۆ نیویۆرك دەڕۆشتین، لەپای ئەو سێ تاوانەی کردبووی ڕایکردبوو، خۆی بەناوی پۆڵ هرمان ناساندبوو و کوڕی خاڵم بوو مردبوو، نهێنیەکەیم ئاشکرا کردوو لەوکاتەوە بەگوێم دەکات، ناوی ڕاستەقینەی جاك جارۆدە.

جان ئەبڵەق بوو هەستا و دەستی ئۆڤیدی توندگرت وتی: جاك جارۆد؟ ئەو جاك جارۆدەی بەپۆڵ هرمان خۆی ناساندووە؟

_ بەڵێ، ئەوە دووبارەش پێتەڵێمەوە، پۆڵ هرمانی ڕاستەقینە لەمێژە مردووە، ئەم پیاوە جاك جارۆد ناوی ئەوی بردووە، هەرئەوە بیست و یەك ساڵ پێش ئێستا بەڕێز جۆڵ لابرۆی کوشتووە و لەکارگەکەی ئاڵفۆرتفێڵ، شەرابە هندییەکەم پێدا وهەموو نهێنیەکانی خۆی پێی وتم، هەروەك چۆن بۆتۆشم تێکرد لیزا بیرین.

جان سەرسامبوو وتی: مەبەستت چییە؟

خزمەتکارەکە: ئەوەی بۆت داینابوو بێ ئەوەی بزانێ خۆی خواردییەوە.

ئۆڤید ئاگای لەقسەی خزمەتکارەکە نەبوو بەردەوام بوو وتی: ئەو شەرابەی کە

دەیخـــۆیتەوە واتلێکـــات هەرچـــی نهێنیـــت هەیە ئاشـکرای بـکەی تـۆ نـاوت لیـزا نیـیە نـاوت جـان فۆرتییە یە.

جان ترسا و وتی: دەمت داخە.

_ بەڵـێ، تـۆ جـانی، هەوڵـم دا بەبەرد بتکـوژم وەك چۆن هەوڵـم دا کچەکەشـت بکـوژم. بەڵـێ تـۆ جـانی هەڵهاتووی لەگرتووخانەی کارسۆن.

هەموان زانیان...

سـەیری ئۆڤیـد وجانیـان دەکـرد، جـان هەسـتا هـاوار بۆتـــۆ چەپەڵـــی نەفرەتـــی، ڕزگـــارت کـــردم و وئێستاش ئەتەوێ لەناوم بەیت.

بەڵـــێ هاوڕێیـــان مـــن نـــاوم جـــان فـــۆرتییەیە، مـــن نـــاوم جـــان فـــۆرتییەی حـــوکم دراوە و هەڵهـــاتووم لەگرتووخـــــانە، بەڵام ئەو تاوانـــــانەی کە جـــــاك کردبـــووی بەســـــەر منـــــدا درا، ڕاســـــتیەکەتان لەم ســـاختەچییە بیســـت، تەنهـــا لەپێنـــاو کـــچەکەم و کـــوڕەکەم هەڵهـــاتم کـــچەکەم کەئەم ســـاختە چیـــیە ویستی بیکوژێت.

هـــاوار لەدەس تـــۆ هەی نـــاکەس بەجـــێ، لەبەردەم هەمـــووان گەواهیـــدرا، پـــاکەبمەوە و منـــداڵەکانم چیتر شەرمەزارنابن.

ئێـوەش هاوڕێیـان ئێسـتا زانیتـان مـن کـێم، زانیتـان چی بووە خۆتان حوکم بدەن.

هەمـــوان هەســـتان و چەپڵەیـــان بۆجـــان لێـــدا، ئۆڤیـــدیش تووشـــی دەمـــارگیری بـــوو لەســـەر کورسییەکە کەوت.

پۆلیســـەکان خەلکەکەیـــان جیـــاکردەوە و بەجانیـــان وت: جـــان فـــۆرتییەی هەڵهـــاتوو بەنـــاوی یاســـا قوڵبەستت دەکەین.

خـــاوەن بـــاڕەکە: بەڵکـــو ئەبـــێ ئەم دزە بگـــرن نەك ئەم ژنـە.

_ خەڵکـــی کەوتـــنە جموجـــوڵ، و کەوتـــنە نێـــوان پـــۆلیس و جـــان، یەکێـــك چپانـــدی و وتـــی: خێـــراکە ڕاکە.

جـــان دووبـــارە هەڵهـــات، خەڵـــکەکە ڕێگەیـــان بەپۆلیس نەدا، ئۆڤید هەروەك خۆی بوو.

یەکێـــك لەپۆلیســـەکان بـــۆ خـــاوەن بـــاڕەکە: بـــڕوام کـــرد، ئەبـــێ ئەم پیـــاوە لەبەردەم دادوەر قســـەکانی دووبـــــارە بکـــــاتەوە. ئۆڤیـــــدیان بەگالیســـــەکە گواستەوە بۆبنکە.

خزمەتکـــارەکە ڕۆشـــتە ژوورەکەی ئامانـــدا بەڵام ئەوی لێنەبــوو بەخێرایــی ڕۆشــتبوو بــۆلای ئــاتیین تاوەکو پێی بڵێت.

بەڵام لەمـــاڵەکەی نەبـــوو، گەڕایەوە مـــاڵەوە و چـــاوەڕێی ڕاووڵـــی دەکـــرد، هەتـــا کـــاتژمێر دوو نـــامەیەکی لەڕاووڵ پێگەشـــت وتبـــووی چـــاوەڕێی ئۆڤیـــدە لەوەیە ئەو شـــەو نەگەڕێـــتەوە. دڵینـــابووە و ڕۆشـــت بەئـــارامی لەســـەر جـــێگە بـــخەوێ بەڵام دڵی ئۆقرەی نەگرت.

ئۆڤیـد برابـوو بـۆبنکە و لەژوورێکـی تـاکە کەسـی نـــرا، تاکـــاتێ کـــاریگەری خـــواردنەوەکە نەمـــا خەوت.

کـاتێ بەیـانیەکەی هەسـتا خـۆی لەسـەر جێگەیەکـی تەخـــتە و پۆلیســـێك لەپەنـــای دیتەوەوســـەری سوڕما و وتی: لەکوێم؟

_ گرتووخانە.

تۆقاو لەجێگەکەی پەڕی وتی: کەی گیرام؟

_ کـــاتژمێر پێنجـــی دوێنـــێ ئێـــوارە، لەوپەڕی بـــێ ئاگایدابویت.

ئۆڤید هیچی بیرنەبوو، جەستەی شەکەت بوو پاڵی دایەوە و دەستی لەسەر توێڵی نا، هەمووی بیرکەوتەوە و بەخۆی وت: دیارە خزمەتکارەکە دەرخواردی منی داوە.

_ ئەی هاوار خۆمم لەناوبرد.

پاش کەمێك سێ پۆلیس هاتن و بردیان بۆلای دادوەر. دادوەر دەستی کرد بەپرسیارکردن وتی: ناوت چییە؟

_ بیار لوبرین.

لێی ڕوانی و وتی: بەڵکو درۆزنی.

بەپێداگرییەوە وەڵامی دایەوە و وتی: ئەگەر ناوم ئەزانی بۆلێم ئەپرسی؟

_ بەڵێ، ئەزانم ناوت ئۆڤید سۆلیفەرە.

_ ئەگەر تۆ پێی ڕازیت منیش لەسەری ڕازیم.

_ بەم قسانە سەرقاڵمان مەکە، ئەگەر تۆ وەڵامم نەدەیتەوە پۆڵ هرمان وەڵاممان دەداتەوە.

ئۆڤید موچوڕکەیەك بەلەشیداهات و لەدڵی خۆیدا وتی: دیارە زۆر قسەم کردووە لەبارەکە.

_ گەورەم، دیــــارە هەڵەتێگەشـــتنێك بـــووە، وەك ئەوەی تۆمەتباربم پرسیارم لێدەکەی؟

_ بەمـزووانە دەیزانـی، ئێسـتا وەڵامـم بەرەوە پـۆڵ هرمان کوڕی خاڵتە؟

_ بەڵێ.

_ دیســـــان درۆکەی، لەبــــاڕی نانەواخانەکـــــان وتبـووت کەوا پـۆڵ هرمــان مـردووە، ئەم پیـاوەی ئێستا ناوی ئەوی بردووە.

ئۆڤیــد دڵینــا بــوو لەوەی هەمووشــتێکی وتــووە: سەرخۆشــبووم کــاتێ ئەو قســـەم کــردووە نــازانم چیم وتووە.

_ کەواتە کاتێــك بەلیــزا بیرینــت وتبــوو تـۆ جـانی هەڵهاتوویت ئەوکاتەش هەر سەرخۆشبوویت؟

_ جان کێیە؟ نایناسم؟

_ ئەو ژنەیە کەویســـــتت بەبەرد بیکوژیــــــت وەك چۆن هەوڵتداوە کچەکەشی بکوژیت.

_ کێ بوێری کردووە تۆمەتی وای خستۆتە پاڵم؟

_ ئەوانەی لەبەردەمیــان دانــت بە هەمــوو شــتێك نــاوە، زمانــت بەو خــواردنەوەیە هــاتۆتە گـۆ کەبە

خزمەتكـــارەكەت وتبـــوو بيـــدا بەليـــزا بيـــرين، داويەتـــــى بەتـــۆ و هەمـــــوو شـــــتێكت ئاشـــــكرا كـــردووە، ئێســـتا كـــوڕی بـــاش بەو بڵـــێ لەكـــوێ نيشتەجێيت؟

ئۆڤيـــد توڕەبـــوو مەچەكەكـــانی لەيەك نـــاو گوشـــی، وتـــی: لەڕێـــگەی خزمتكردنـــدا خـــراپەيەكم لەگەڵ خۆمـدا كـردووە و هەرگيـز لەخـۆم خۆشـنابم. ئێسـتا بـزانە مـن لەشـەقامی كليشـی ١٧ دەژيـم، بـێجگە لەوە پرســــياری هيچـــــی تــــرم لــــێمەكە و وەڵام نادەمەوە.

_ پـۆڵ هرمـانی ڕاسـتی مـردووە ئەوەشـی ئێسـتا نـــاوی هەڵگرتـــووە درۆدەكـــات نـــاوی جـــاك جـــارۆدە وايە؟

ئۆڤيـــد شـــانەكانی هەڵتەكانـــد و وەڵامـــی نەدايەوە، دادوەر فەرمـــــانی كــــرد لە گرتووخــــانەی بنــــێن، ئێـــوارە ســـەرۆكی پـــۆليس هـــات بـــۆلای دادوەر و وتــــــی: ئەتەوێ بــــــڕۆين بۆمــــــاڵەكەی ئۆڤيـــــد سۆليفەر؟

_ ئەبـێ وابكەيـن، نيـوە شـەو دەڕۆيـن بـۆئەوەی چاو نەيتەسەرمان. ئامادەبە.

* * *

پۆڵ هرمان ئەوشەو لەسەر ئەوبروسکەی کە ئۆڤێد بۆیناردبوو ڕۆشتبوو بۆماڵەکەی و ڕاووڵیش بەدویدا، سەرسامبوو نەیدۆزییەوە لەماڵەکەی، کاتژمێرێك وەستا و گەڕایەوە.

ماڵەکە لایەکی چۆڵبوو، ڕاووڵ هەلەکەی قۆستەوە ودەرگای ماڵەکەی شکاند و وەژوورکەوت چەند سندوقێکی بینی لەسەر زەوییەکە هەڵی گرتبوو بۆ بۆینس ئایرس، چەند کاغەزێك پارەشی بینی دانرابوو گەڕاو لەجزدانەکەیدا دانپێدانەکانی ئاماندا و سەنەدە ساختەکانی دۆزییەوە بەجۆرێك دڵخۆشبوو وەسف نەدەکرا بردی و وەدەرکەوت، کاتێ پۆلیس گەشتە ماڵەکەی ئۆڤێد بینیان دەرگای ماڵەکەی شکاوە و کاغەزە پارەکانیش لەجێی خۆین وتیان دزی نەبووە بەڵکو بۆشتی تر هاتووە لەوەیە هاوبەشی تاوانەکانی بێت و ویستبێتی هەرچی پەیوەندی بەوەوە هەیە لەناوببات یەکسەر گومانیان لەپۆڵ هرمان کرد هەرچی لەوێ بوو هەڵیان گرت وبردیان.

ئاماندا لەوپەڕی شڵەژان بوو کاتێ ڕاووڵ وەژوورکەوت، وتی: خێراکە باپڕۆین بۆلای ئاتیین کاغەزەکانم دۆزییەوە.

_ ئەوانەی خۆمان؟

_ بەڵێ، لەگەڵ وەفاتنامەی پۆڵ هرمان لەماڵەکەی دزیم لەوێ نەبوو.

_ لەبەرئەوەی دەستگیرکراوە.

بەدەم جل لەبەرکردنەوە هەمووی بۆگێڕایەوە و پێکەوە ڕۆشتن بۆلای ئاتیین.

ئاتیین ئۆقرەی لێبڕابوو لەتاو چاوەڕوانی ڕاووڵ، لەسەر مێزەکە دانیشتبوو نامەی بۆجۆرج دارییە دەنووسی.

کرێکارێکی بانگکرد تا تابلۆ گەورەکە کەپێچابویەوە بیبات، کرێکارەکە ویستی لەسەر کەرەستەکانەوە ئەسپەدارینەکە هەڵگرێت پێی وت: وازی لێبێنە، خۆم ئەوەیان هەڵدەگرم.

کرێکارەکە سندوقەکەی هەڵگرت و لەدەسی خزا و کەوتە سەر ئەسپەدارینەکە وشکا هەرجی لەناوی سکیدابوو دەرچوو.

زۆر داوای لێبـــووردنی لەئـــاتیین کـــرد، جـــۆرج وەکو یادگاری دایکی هەڵی گرتبوو.

گرنگـــی بەکاغەزەکـــان نەدا، ســـندوقەکەی لەگەڵ کرێکـــارەکە نـــارد، گەڕایەوە بۆنوســـینی نامـــاکەی بۆجـــۆرج، پیرۆزبـــایی بیســـت وپێـــنج ســـاڵەی لێـــدەکرد، کـــاتژمێر نـــۆ ســـەردانی دەکـــات تـــاوەکو بـــابەتێکی گرنگـــی پـــێ بڵێـــت بەبـــۆنەی لەدایکبوونیەوە.

دوای ئەوەی نـــامەکەی نوســـی ونـــاردی، ســـەیری ئەو کـــاغەزانەی کـــرد کەلە ســـکی ئەســـپەکە دەرچوبوو.

وتی: تۆ بڵێی چیبێت؟

لێـی دەڕوانـــی پـــارچەیەکی جیـاوازی لەوانـــی دیـکە بینـــی، بـــوو بە چەنـــد پـــارچەیەکەوە، کـــاتێ کـۆیکردەوە ئەبـڵەق بووکـاتێ ئیمـزای جـاکی بینـی، وتـی: خـوایە ئەکرێـت ئەمەهەمـان ئەو نـامە بێـت کەجـان وایزانـــی ئـــاگرەکە ســـووتاندویەتی؟ دواتـــر کاغەزەکەی هەڵگرت وخوێندییەوە:

(( ئازیزەکەم جان.....

دوێنـێ پـێم وتـی داهـاتوویەك بۆخـۆت ومنـداڵەکانت دروســـــت دەکەم، ئێســـــتا بەشـــێوەیەکی خێـــرا

دروســــتمكرد، ســــبەینێ ئەبــــم بە یەكێـــك لەهەرە پیاوەدەوڵەمەنــــدەكان بە دووســــەت هەزارفرەنــــك و ئەو كــاغەزە داهێنــانەی بەدەســتی دێــنم دەوڵەمەنــد ئەبم.

(( بەداخ نەبـــــی بـــــۆئەو كــــارەی كەدەركـــــرای ئامـــــاددەبە و وەرە لەگەڵ ئەوكەســــــــە بـــــژی كەخۆشـــــی دەوێیـــت و باشـــترین ژیانـــت بـــۆدابین دەكات، ئەگەر نەیەیت خەمبارئەبم، بەڵام دێیت.

ئەیلولی ساڵی ١٨٦١

(( جاك جارۆد)).

ئـــاتیین هـــاواری كـــرد و وتـــی: ئەمە ئەو بەڵــگەیە كەبەدوایدا دەگەڕام، و بێتاوانی جان ئەسەلمێنێ.

ڕاووڵ لەدەرگـــای داو وتـــی كەوا كاغەزەكـــانی لە ئۆڤێـــد بـــردوەوە ، وەفاتنامـــای پـــۆڵ هرمانیشـــی هێناوە و باوكی ماری ناوی جاك جارۆدە.

كەواتە هـــــــیچ گومانێـــــــك نەمـــــــاوەتەوە، خزمەتكـــارەكەی بـــانگكرد و وتـــی: گالیســـكەیەك

بەکـــرێ بگـــرە و بـــڕۆ بـــۆلای لوســـیان لە کـــارگەی کۆرینوا پێی بڵێ هەر ئێستا بێت بۆلام.

کاتژمێرێــک دواتــر لوســیان هـــات و وتـــی: چـــی ڕوویداوە؟

_ لەســـایەی ئەم گەنـــجەوە بکـــوژەکەی بـــاوکتم دۆزییەوە.

ئاماژەی بۆ ڕاووڵ کرد.

_ کێیە؟

_ بەمـــزووانە پێتەڵـــێم، ئێســـتا باهەموومـــان بـــڕۆین بۆلای جۆرجی پارێزەر.

لوســـی چـــاکببوەوە، ئەو شـــەوەی کەجـــان ئاشـــکرا بـــوو چـــاوەڕێی جـــانی دەکـــرد بەڵام بێســـوود بـــوو جان نەهات.

بەیـــانیەکەی کەســـێکی ڕاســـپارد تـــا لەنانەواخـــانەکە پرســـیاری جـــانی بۆبکـــات، لەولاوە بەهەواڵـــی گـــرنگەوە هـــاتەوە بـــۆلای لوســـی. هەر ئەوەنەی دەســـتکەوتبوو پێیـــان وتبـــوو کەوا نـــاوێکی دیـــکەی بەکارهێنـــاوە چـــونکە لەگرتووخـــانە هەڵهـــاتووە ئێســـتاش دیســـان ڕایکـــردووە، بەبـــێ ئەوەی جـــۆری تاوانەکە بڵێ.

خەریکبوو شێت ببێ، وتی: خوایە، چۆن یارمەتی بدەم، ئەبێ بچم بۆلای جۆرجی پارێزەر، پێشتر پێی وتبووم کەوا چەند کەسێکی بەبەزەییە.

خێرا ڕۆشت بۆلای جۆرجی پارێزەر و باسەکەی بۆگێڕایەوە، جۆرج پێی تێك چوو، وتی: ئەو ژنە نییە فایلە ونبووەکانی بۆ گەڕاندمەوە؟

_ بەڵێ.

_ تۆ خاتوو لوسیت وایە؟

_ بەڵێ، گەورەم.

دڵینابوو کەوا پۆڵ هرمان هەواڵی لەسەر داوە، بەسۆزەوە لە لوسی ڕوانی و وتی: ئەو ژنە ناوی ڕاستی خۆی پێی وتویت؟

_ وتی ناوی لیزا بیرینە.

_ ئەو ناوەی بەکارهێناوە وە ئێستا ناتوانین بیدزۆینەوە جگە لەگرتووخانە نەبێ.

_ ترسام گەورەم، بەڕاستی تاوانبارە؟

_ نازانم، بەڵام بیست ویەك ساڵ پێش ئێستا بەزینـدانی هەتـا هەتایی تۆمەتبـارکراوە وهەڵهاتووە، ناوی ڕاستەقینەی جان فۆرتییە یە.

_ خوایە، دایکمە......دایکم....

بەڵام ستەمی لێکراوە، وانییە، لوسیان خۆی وتی تاوانی کەسێکی دیکەیان خستۆتە ئەستۆ.

خوایە ئێستا ئەزانم بۆچی ئەوەندە بەسۆزبووە بۆم، دایکمە!........ دایکم........ چۆن بێتاوانی بسەلمێنم؟ بەزەیـت هەبێت گەورەم، تـۆ لەبەناوبانگترین پارێزەکانی بەزەییت بەدایکمدا بێتەوە.

لەپڕ دەرگا کرایەوە و لوسیان و دشمان و ئاتیین وەژوورکەوتـن، جۆرج سەرسامبوو بەهاتنیـان، لوسیان لوسی لەئامێزگرت و وتی: ئازیزەکەم، باهیوامان هەبێ.

جۆرج: هاتووی بڵێی لیزا بیرین ونبووە.

ئاتیین: کێشە نییە دەیدۆزینەوە.

لوسی هەوڵیدا بەجێیان بهێڵێت بەڵام ئاتیین نەیهێشت، وتی: خانمەکەم بمێنەوە.

دواتـــر ئـــاوڕی دایەوە بەرەو جـــۆرج و وتـــی: کـــوڕەکەم ئەمـــڕۆ بویـــت بە بیســـت وپێـــنج ســـاڵ، ئەمـــڕۆش بەجێهێنـــانی ئەو وەســـیەتەیە کە قەشـــە لـــوژێ جێـــی هێشـــتووە لەدوای خـــۆی، نـــامەکەی دەرکـــردوو بەدەنگـــی بەرز خوێنـــدییەوە، ئێـــوەش لوسی و لوسیان گوێ ڕابگرن.

جۆرج خوێندییەوە: کوڕە خۆشەویستەکەم:

(( لەئەیلـولی سـاڵی ١٨٦١ ئافرەتێـك ومنـداڵێکی نزیـــك بە ســـێ ســـاڵان هـــاتن بـــۆلام، ســـەرباز بەشـــوێنیەوە بـــوو، تۆمەتبـــاربوو بەســـێ تـــاوان، ناوی جان فۆرتییە بوو))

(( ئەم ئـــافرەتە ســـوێندی بەخـــودا و کـــوڕەکەی خـــــوارد کەوا بێتـــــاوانە، ڕاســـــتی لەچـــــاو و دەنگیدابوو، متمانەم پێکرد))

(( بەڵام تـاوانی مــن چیـیە، هەمووبەڵگەکـان دژی بوون و بە زیندانی هەتا هەتایی حوکم درا))

(( بەڵام هەتـــا ئێســـتاش دڵنیـــام لەبێتـــاوانی، ئەو تاوانبـــارنەبوو بەڵکـــو گەواهیـــدەرە، هـــیچم پێنەکـــرا بـــۆی جـــگە لەوەی کـــوڕەکەی بەخێـــوبکەم و نـــاوی بنێم جۆرج دارییە)).

**هەمـــوان لەسەرســـامیدا چاویـــان گەورەببـــوو، جۆرج وتی: کوڕی جانم و لوسی خوشکمە؟**

**لوســی خــۆی هەڵــدایە باوەشــی بــرا تاقــانەکەی و وتی: براکەم!**

**هەمـــووان لەبەردەم دیمەنێکـــی وەهـــا خۆیـــان پێنەگیــرا و دەســتیان کــرد بەگریــان، جــۆرج لوســی لەئــامێز گــرت و وتــی: بەڵــێ، ئــێمە منــداڵی ئەویــن، لە چــاوی ئــێمەدا بێتــاوانە بەڵام تاوانبــارە لەچــاوی خەڵك و هیچ ڕێگەیەك بۆ بێتاوانی نییە.**

**ئاتیین: نا، بەڵگەم هەیە.**

**خوێندییەوە.**

**نــامەکەی جــاکی پێــدا، جــۆرج کــاتێ خوێنــدییەوە خەریکبـــــوو لەخۆشـــــیدا دەفـــــڕی: بێتـــــاوانی ئەسەلمێنم، لەکوێت بوو؟**

**_ لەسکی ئەسپە دارینەکەدا دۆزیمەوە.**

**_بەڵــێ، ئێســتا هــاتەوە یــادم یــاریم پێــدەکرد، بەڵام چیمان لەدەست دێت جاك مردووە؟**

**_ بەڵكـــو زینـــدووە نـــاوی پـــۆڵ هرمـــانی هەڵگرتووە.**

_ چی دەیسەلمێنیٚ؟

_ بێگومـــان دەســـت و خەتـــی پـــۆڵ هرمانـــت لایە لەگەڵ ئەوە بەراوردی بـــــــــکە و ڕاســـــــــتیت بۆدەردەکەویٚ.

جۆرج وایکرد، بینی هاوتان.

لوسـیان: لەنــاو بچـیٚ هـیچ و پـووچە، دەیزانـی مـن منـداڵی کـێم و هەوڵیـدا کـچەکەی خـۆی بـدا بەمـن، بەڵام ماوەی یاسایی تاوانەکەی تیٚ پەڕیووە.

ئـــاتیین: ئەگەر لەوانە بۆیـــدەرچیٚ لە هەوڵـــی کوشتنی لوسی و جان بۆیدەرناچێت.

جـۆرج: بـا بەدوای دایکمـدا بگەڕێـن، چـی بەسـەر هاتووە؟

لوسیان: دەیدۆزینەوە.

_ چی ئەڵێی بۆ پۆڵ هرمان؟

ئاتیین: بەگوێی مندەکەیت؟

_ بەڵیٚ.

_ کەواتە لەگەڵم وەرن.

هەر پێنجیـــان وەدەرکەوتـــن لەمـــاڵەکەی جـــۆرج، ســـواری دوو گالیســـکەبوون، لەڕێگـــادا ئـــاتیین

لەلای تــوتن فرۆشـێك وەســتا و دووكــاغەزی كـڕی كە مۆری حكومەتی پێوەبوو.

## _ ١٧ _

جــان دوای ئەوەی لەبــاڕەكە هەڵهــاتبوو نیشــانەی شــەكەتی بەڕووخســارییەوە بــوو، تــرس ڕەنگــی بردبــوو، نەوەســتا هەتــا گەشــتە شــوێنێكی چــۆڵ، لەســــەر بەردێــــك دانیشــــت و ســــەری لەنێــــو دەستەكانی نـاو، و دەیـوت: خـوایە بـۆ هەتـا هەتـایە كچەكەم لێ كرا.

بەڵام جـــاك جـــارۆد هیشــــتا زینــــدووە بە وتەی ئۆڤیـد، نــاوی پــۆڵ هرمانیشــی هەڵگرتــووە، دوای خــــواردنەوەی ئەو خــــواردنەوەیە مەحــــاڵە درۆبكــات، دەســتگیركراوە، بێگومــان ئەزانــن مــن بە هەڵە تۆمەتبــاركراوم و بێتــاوانیم دەردەچــێ و بەكـــچەكەم شـــاددەبمەوە و بەدوای كوڕەكەشـــم دەگەڕێم.

بەڵـــێ، لەوانەیە ئێســـتا جـــاك زانیبێتـــی و هەڵهاتبێــت، دەســتی كــرد بەگریــان گریــانێكی قووڵ.

دواتــــر خەوی لــــێکەوت و تــــا ســــبەی خەبەری نەبــــوویەوە، وەکــــو کۆترێــــك هەڵهــــاتبێ لەتیــــری ڕاوچــی وابــوو نەیــدەزانی بــۆ کــوێ بــڕوات، هەتــا گەشــــتە ڕووبــــاری ســــین، لەوێــــدا بیرێکــــی مەترســــــیدار بە زەهنیـــــدا هــــات، لەنێــــوان خۆشەویســــتی بــــۆ مــــردن و مــــانەوەی لەژیــــان، خۆشەویســــتی کــــچەکەی ڕێگــــری لێکــــرد لە خوکوشـتن و ئـارەزووی بـۆ ژیـان لەوپەڕیـدا بـوو، ویستی بڕوات بۆلای جاك.

ڕێگاکــانی پاریســی گــرتەبەر، و پرســیاری مــاڵی پــۆڵ هرمــانی کــرد پێشــوازی لێکــرا و بەنــاوی ئۆڤیـدەوە داوای بینینـی خـاوەن مـاڵی کـرد، گومـانی لەوە هەبــوو جــاك بیەوێــت بیبینێــت بــۆیە خــۆی وەکــــو هاوبەشــــی پیشــــان دا، ڕووخســــەتی وەژوورکەوتنــی پێــدا، تەنــانەت کەجــاکی بینــی تۆقاو گەڕایە دواوە، وتی: کەواتە ڕۆژەکە هات.

_ بــۆیە واتێــك چوویــت دیــارە پیلانــی کوشــتنمت دانابوو.

جــاك وایبینــی خــۆی بگرێــت لەم هەل و مەرجەدا، وتــــی: تــــۆ لێــــرەی دوو ڕوو، چــــی تــــۆی هێناوە،،چیتەوێت؟

_ نەفرەتـــت لێبێـــت هـــیچ و پـــووچ، دوای ئەوەی زانیـــت مـــن کـــێم بـــوێری ئەوەت هەیە بڵێـــی چیمەوێت و بۆچی لێرەم؟

جـاك شـانەکانی هەڵتەکانـد و وتـی: بێگومـان تـۆ شێتی.

_ چەنـدین سـاڵە بەهـۆی تـۆوە شـێت بـووم، چـاکبوومەتەوە و هـاتووم حسـابت لەگەڵا یەکـلای بکەمەوە، جاك جارۆدی نەفرەتی.

_ ئەم ناو چیە؟

_ ناوی تۆیە.

_ بەڵکـو نـاوم پـۆڵ هرمـانە دیـارە شـێتی لیـزا بیرین.

_ دڵنیـای لەوەی ئەوە نـاوی مـنە نـاوم جـان فـۆرتییە، بەسـە درۆکـردن لەلای جـۆرجی پـارێزەر زانیت من کێم.

_ بێدەنگ بە.

_ نـا بێـدەنگ نـابم، بەدوامەوەن تـا بمـبەن بـۆ گرتووخـانە، بەڵام هـاتووم تـا تـۆ نەبەم لیـرە نـاڕۆم، ئەبـێ دانـی پێـدا بنێـی تـۆ بکوژیـت و مـن بێتاوانم.

**جــاك هەوڵــی دا وەڵامــی نــاداتەوە، بەڵام مــاری لەوساتەدا وەژووکەوت، وتی: چی ڕوویداوە؟**

**جــاك: بگەڕێــرەوە بــۆژوورەکەت کــچەکەم، ئەم ژنە شێتە هات وهاواری دروستکردووە.**

**_ کەوایە بـــانگی خزمەتکـــارەکە دەکەم وەدەری نێت، ڕووی لەجان کردو وتی: تۆ کێی؟**

**_ لە باوکت بپرسە؟**

**_ چیتەوێت؟**

**_ دادپەروەریــم دەوێــت و ئەمەوێــت ئەم پیــاوە ڕاپێچی گرتووخانە بکرێت.**

**جاك: بینیت کچەکەم نەموت شێتە؟**

**جــان: خــانمەکەم بینیــت بــوێری ئەوەی نــیە قسەبکات.**

**ماری: بۆ، لەزەنگۆڵەکە نادەی باوکە؟**

**جان: لەبەرئەوەی دەترسێت.**

**مــاری هەوڵیــدا لەزەنگــۆڵەکە بــدات بەڵام جــاك ڕێگری لێکردوو وتی: وامەکە.**

**_بۆچی.**

جـــان: لەبەرئەوەی نایەوێـــت کەس بزانێـــت کەوا پۆڵ هرمان جاك جارۆدی بکوژە.

جـاك واهەسـتیدەکرد خـوێنی لە لاشـیەدا بەسـتی، وتـی: وسـبە دوو ڕوو، بەلایەنـی کەمەوە بەزەیـت بەکچەکەمدا بێتەوە.

_ نەفرەتـی! بەزەیـت بەمـن و کچەکەمـدا هـاتەوە؟ کـاتێ لابـرۆت کوشـت و کارگەکەیـت سـووتاند و پـارە و داهێنانەکەیشـت دزی، هەموویـت خسـتە ئەسـتۆی مـن، بیسـت و یەك سـاڵ لە گرتووخـانە بووم دوور لەکچەکەم و کوڕەکەم؟

دوو منـدالەکەم جێهێشـت و بەنـاوی پـۆڵ هرمـان ئارادبوویـت، دواتـر بەپارەکانـت گەڕایـتەوە ئێـرە و ویستت کچەکەم بکوژیت و دڵی دەربێنی .

مـاری بەدەم گـوێگرتنەوە لە بـاوکی دەڕوانـی لەوەدەچـوو بـاوەڕی پێکردبێـت، هەتـا جـان تەواوبوو لەقسەکردن.

مـاری ڕووخسـاری دا پۆشـی، وتـی: خـوایە، چ کارەساتێکە.

جـاك وەك شـێت هـاواری دەکـرد، وتـی: هەی مـار، هاتوویـت لە مـاڵەکەم هەڕەشـم لێـدەکەی. هەوڵێـدا بیخنکێنێت.

لەدەرگـــا دراو بەترســـەوە هەنگاوێــك ڕۆشـــتە دواوە، خزمەتكـــارەكە وەژووركەوت و هەواڵـــی هـــاتنی دوو میـــوانی پێبـــوو، پـــاڵی بەجـــان نـــا بـــۆژوورەكەی و دەرگـــاكەی داخســـت، لەوكـــاتەدا ڕاووڵ و ئـــــاتیین وە ژووركەوتــــــن، ئـــــاتیین چەمـــیەوە لەبەردەمیـــدا و وتـــی: ئەترســـم بێزارمـــان كردبێتـــــــی گەورەم بەبـــــــێ هەواڵ هـــــــاتین، ڕووخســــارت زەد هەڵــــگەڕاوە و دەستەكانیشـــت دەلەرزن، نەخۆشیت؟

_ بەڵـــێ، ســـەر ئێشـــەیەكی تونـــدم گرتـــووە، بەخێربێیت لەگەڵ ئەم میوانە تازەیەدا.

ئـــاتیین: بەڕێـــز ڕاووڵ دشـــمانە، هۆكـــاری ســـەردانیەكەت پـــێ ئەڵـــێم تكـــایە دانیشـــە گەورەم. باقسەبكەین.

جـــاك دانیشـــت و ئـــاتیین دەســـتی پێكـــرد، وتـــی: گەورەم لە قوتابخـــانەی پیشەســـازی و هـــونەر لە ستالۆن دەرچوویت وایە؟

_ بەڵێ.

_ دواتر ڕۆشتویت بۆ سویسرا؟

_ بەڵێ.

_ دووساڵ لەوێ بویت؟

_ بەڵێ.

_ ئەمەوێت پرسیاری پیاوێکت لێبکەم لەسەرە مەرگدایە، لەکارگەکەی ئێوە کاری دەکرد ناوی جاك جارۆدە دەیناسی؟

_ جاك جارۆد؟ نا، بیرم نییە پیاوێکی وام ناسیبێت، بەڵام وابزانم ماوەیەك پێش ئێستا ناویم بیست، وەکو ئەوەی خوێندبێتمەوە لەکارگەکەی جۆڵ لابرۆ کاری دەکرد، بە گیانفیدای ناوبانگی دەرکرد.

_ خۆیەتی گەورەم، ئەم پیاوە دەناسی؟

_ نا.

_ دڵنیایی؟

_ کاتێ ڕۆشتویت بۆ ئەمریکا هیچت لەسەری نەبیست؟

جاك گومان لەدڵیدا دروست بوو، وتی: چۆن بیبیستم لەکاتێدا مردووە؟

_ لەبەرئەوەی زۆرێـك پێیـان وایە هەتـا ئەمـڕۆ زینـدووە، دوای کوشـتنی خـاوەن کـارگە و دزیـن و سووتاندنی لەکارگەکە هەڵهاتووە.

جـاك پێکەنـی، وتـی: خـورافەیەکی کـۆنە، ئەوەی وایکرد ژن بوو.

_ بەڵام ئەم ژنە دەڵێـت بێتـاوانم و نـامەیەکم پێـیە تاوانباری جاك دەسەلمێنێت.

جـاك هیچـی لەدەسـت نەدەهـات جـگە لەوەی خـۆی بگرێـت، وتـی: ئەم نـامە چـۆن دۆزرایەوە، لەکوێ؟

_ لەسکی ئەسپێکی دارین.

_ ئەوەی دەیڵێیـت لەڕۆمـان دەچێـت، ڕێـگەم بـدە بڕوات پێبکەم.

_ کەواتە سـەیری ئەم نـامەیە بـکە، ڕێـگەم پێـدەی لەبەردەمت بخوێنمەوە.

_ چ گرنگییەکی هەیە بۆمن؟

دەیزانی

دواتــر دوو كــاغەزی دەرهێنــا، كاغەزەكــان هەمــان ئەو كــاغەزانە بــوو كەكڕیبــوی و مــۆری حــوكمەتی پێبوو، كاغەزی فەرمی بوو.

_ ئەمە چییە؟

_ وەكو ئەوەی دەیبینی .

_ بەڵێ، تێناگەم؟

_ تێــــــدەگەی لەبەرئەوەی بەدوای كاروبــــــاری دارایــــیەوەین، تــــۆش زۆر باشــــی لە ژمێریاریــــدا گەورەم، ســــــوودی دوو ســــــەد هەزار فرەنكــــــی لەبیست و یەك ساڵدا چەندە؟

_ سێ ئەوەنەی نرخی خۆی.

_ كەواتە شــەش ســەت هەزار فرەنكــی لوســیان لابــــرۆ قەرزاری كەواســــاڵی ١٨٦١ لەباوكیــــت دزی.

_ ناوم پۆڵ هرمانە، ئیهانم دەكەی؟

_ بەڵكــو نــاوت جــاك جارۆدە، تــۆ دزیــت ئەمەش وەفاتنــامەكەی پــۆڵ هرمــان، دەچیــتە بەردەم دادگــا بۆ ئەم كارەت.

ئێستا سەرەتا دەبێ شەش سەد هەزار فرەنك بدەی.

_ هیچ بوارێك نەماوە بەرگری لەخۆم بکەم، خوایە خۆم و کچە بێتاوانەکەشم لەناوچووین.

_ هەڵەی خۆتە، پارەکە بدە و ئەبینی.

_ پارەم لێرە نییە.

_ بەڵکو ئەمڕۆ زۆر لەوەزیاترت داناوە بۆ ئوڤید سۆلیفەر.

جاك هیچ ڕێگەیەکی بۆبەرگری نەمابوو، لە ڕەفەی کتێبخانەکە کاغەزێکی دارایی بەو نرخە دەرهێنا و دای بە ئاتیین.

_ ئێستا ئەوە ماوە ئەوەی دەیڵێم لەسەر کاغەزە جێبەجێی بکە.

ئەوەی کرد کە ئەو وتی:

لێرە ئیمزای دەکەم، جاك جارۆد، دان بە ئامادەبوونی ئاتیین کاستڵ، و ڕاووڵ دشمان دەکەم.

دواتــــر وەســــتا لەنوســــین، وتــــی: ئەتەوێــــت دان بەتاوەنەکەمــدا بنــێم، بەڵام ئەوە شــەرەفی کــچەکەم لەکەداردەکات واناکەم.

مــــاری لەســــەرخۆ بەرەو ڕووی هــــات، ڕووداوەکە بەجۆرێـــــك کــــاریگەری لەســــەرهەبوو ئەتــــوت بەخەوی موگناتیســــی کــــۆنترۆڵ کــــراوە، وتــــی: بەڵکو بنوسە باوکە.

بــــاوکی بەدەم هەڵڕشــــتنی فرمێســــکەوە چــۆکی دادا و وتــــی: دەیانەوێــــت شــــەڕەفت پــــیس بــــکەن کچەکەم.

جــــاك نوســــی: دانیپێــــدادەنێم لە ئەیلــــوولی ســــاڵی ١٨٦١ ئەم نامەی لێرەیە بۆ جانم نووسی.

دانیپێــدادەنێم لەو شــەوەدا دووســەد هەزار فــرەنکم دزی لە خەزێــــنەکەی جــۆڵ لابــرۆ و داهێنــــانەکەیم دزی و کوشــــتم وکــــارگەکەیم ســــوتاند. دانیشــــی پێــدادەنێم ئۆڤێــد سۆلیفەرم ڕاسپاردبوو بۆکوشــتنی لوســــی فــۆرتییە و دایکــــی جــــان فــۆرتییە ( لیــزا بیرین) ی نان فرۆش.

خامەکە لەدەستە لەرزۆکەکانی کەوت.

لەپــڕ جــان لەو دەرگــای کە بەســەریدا دایخســتبوو وەدەرکەوت و دەســــی لەملــــی جــــاك نــــاو وتــــی:

دانــیش بەوەدابنــێ کەمێــك پــیش ئێســتا ویســتت لەبەردەم کچەکەتدا بمکوژی.

جــاك ئەبــڵەق بــوو ئــاتیین ســەری ســوڕمابوو، مــاری وتــی: بنوســە بــاوکە، ئەوە بنووســە کە جــان ئەیەوێت.

ئاتیین فەرمانی پێکرد دانپێدانانەکە ئیمزابکات.

مـــاری کـــاغەزەکەی بـــردوو دای بەجـــان، وتـــی: ئەوە بەڵگەی بێتاوانیت خانمەکەم.

ئـــــاوڕی دایەوە بەرەو لای بـــــاوکی و وتـــــی: خودالێــت خۆشــبێت بــاوکە، بــۆ بەخــت باشــیم مــن ئەمرم.

دواتـــــر بە بێـــــدەنگی لە ژوورەکە وەدەرکەوت، بــێجگە لە هەناســەی بــاوکی نەبێــت هیجــی تــری نەدەبیست.

* * *

لەوســاتەدا لوســیان و لوســی و جــۆرج و ئۆڤیــد و دادوەری لێکــــۆڵینەوە وەژوورکەوتـــــن، لوســـــی

هەڵـــپەی دا بەرەو لای دایکـــی و لەئـــامێزی گـــرت بڕوای نەدەکرد کەوا دایکی بینیەوە.

ســـەرۆکی پـــۆلیس دەســـتی لەسەرشـــانی جـــاك نـــاو وتی: بەناوی یاسا قۆڵبەستت دەکەم.

دواتـــر ئـــاوڕی دایەوە بەرەو لای جـــان و وتـــی: تـــۆش خـــانمەکەم ئـــازادی، بەو بەڵگانەشـــی کە بۆمـــان دەخـــاتەڕوو بەمـــزووانە بێتـــاوانی تەواوەتیت ڕادەگەیەنرێت.

دواتـــر ئـــاتیین ئەو نـــامەی کە جـــاك بـــۆ جـــانی نوســـیوو بـــردی، لێـــرە جـــان زانـــی کەوا جـــۆرج کـــوڕەکەیەتی دیمەنێکـــی کـــاریگەربوو، فرمێســـك وەکو تاڤگە بوو.

دوای کەمێـــك ئۆڤیـــد و جاکیـــان ڕاگواســـتەوە بـــۆ گرتووخـــانە، بە هـــۆڵە ســـەرەکییەکەدا دەڕۆشـــتن مارییـــان بە مردوویـــی لەســـەر کورســـییەك بینـــی، نامەیەکی لەدەست بوو:

(( بۆ لوسی فۆرتییە....

خـــــــراپەم زۆر لەگەڵ کـــــــــردی، بەڵام زۆرم خۆشویســـت خـــودا تـــۆڵەی کـــردیتەوە و نـــزام بـــۆ بکە و لێم خۆشبە . ماری))

دوای سێ مانگ حوکمی لەسێدارەدان تا مردنیان بەسەر ئۆڤید و جاك دا.

بەڵام جاك بەرگەی نەگرت و خۆی کوشت.

کاتێ بێتاوانی جان سەلمێنرا لوسی و لوسیان هاوسەرگیریان کرد و بەخۆشی ژیان لەگەڵ جۆرج و جان، دوای چەندین ساڵ نەهامەتی و زیندانی لەکۆتایدا بە خۆشی ژیا.

کۆتایی.